# جیۆپۆلیتیك

پرۆفیسۆر:
د. كلاوس دۆدز

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:
د. ئیبراهیم عەلی موراد



هەولێر - ٢٠١٣




**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **جیۆپۆلیتیك**
- نووسینی پرۆفیسۆر: د. کلاوس دۆدز
- وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: د. ئیبراهیم عەلی موراد
- نەخشەسازی ناوەوە: ڕێمان عەبدولجەبار
- تایپ و هەڵەچن: د. ئیبراهیم عەلی موراد
- بەرگ: ڕێمان عەبدولجەبار
- ژمارەی سپاردن: (٩٧٧) لەساڵی ٢٠١٣
- نرخ: (٢٥٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٣
- تیراژ: ٧٥٠
- چاپخانە: موکریانی(هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٧٥٩)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

بە ناوی خوا لە کاتژمێر ٩:٢٠ ی بەیانی رۆژی هەینی ٢٠١٢/٨/٣ دەستم کرد بە وەرگێڕانی کتێبەکە:

پێشەکی زۆر کورت، کە ئەم کتێبەی بەردەستت بەشێکی پێك دێنێت، تایبەتە بەو خوێنەرانەی کە ئارەزوو دەکەن دەستیان بە بابەتی نوێ و سەردەمییانەدا بگات و بریتییە لە زنجیرەیەك بابەت کە لە لایەن پسپۆڕانەوە نوسراون و بە زیاتر لە (٢٥ ) زمان لە سەرانسەری جیهاندا بلاّو کراونەتەوە.

زنجیرەکە لە ساڵی ( ١٩٩٥ ) دەستی پێکردووە و ئێستا رێژەیەکی بەربلاّو لە بابەتی هەمەجۆر بەخۆوە دەگرێت لە بوارەکانی : مێژوو، فەلسەفە، ئاین، زانست، و زانستە مرۆڤایەتییەکان. واش چاوەڕوان دەکرێت کە لە چەند ساڵی ئایندەدا ببێتە کتێبخانەیەك کە (٢٠٠ ) بەرگ بەخۆوە بگرێت. تێیدا پێشەکی زۆر کورت دەربارەی هەموو بابەتێك بەرچاو دەکەوێت هەر لە میسری کۆن و فەلسەفەی هندییەوە بگرە تا دەگاتە چەمکی هونەر و کۆسمۆلۆجی ( زانستی بوونەوەر).

ئەمەی خوارەوە دەقی ئەو پەیوەندییانەیە کە لە گەڵ پرۆفیسۆر د. کلاوس دۆدز ئاڵوگۆڕمان کرد و لە ئەنجامدا رەزامەندی ناوبراومان وەرگرت بۆ وەرگێڕانی کتێبەکەی بۆ سەر زمانی کوردی:-

Hi doctor. I am doctor Ibrahim Ali Murad from Iraqi Kurdistan. I came across your excellent book (Geopolitics) and liked it very much. I want to translate it into Kurdish because our university needs such topics; therefore I need your written permission for that. I also hope that we could go on in our contact and that you help me with any new book of yours to be translated into Kurdish in the future. It will be my pleasure if you do.

Yours

Dr. Ibrahim A. Murad
Iraqi Kurdistan
University of Garmian

Dear Dr Murad

Thank you for writing. Delighted it is of interest. Would you send me a copy of the final version? The second edition will appear in 2014/5.

Best wishes Klaus

Thanks dear doctor. I want two more favours:

1. A written consent for the translation.
2. A new picture of you.

Because I want to put them in the beginning of the translated text.

Yours

Dear Dr Murad

You can assume you have my consent. I am not sure Oxford University Press would formally consent as my publisher however. But I do believe in the circulation of knowledge.

I enclose a photo.

best wishes, Klaus

## پێڕست

# پێشەکی

ساڵانێکی زۆرە خەم و پەژارەی هەژاریی کتێبخانەی کوردی لە رووی سەرچاوەی زانستی نویێ بەرۆکی پێ گرتووم، بە تایبەتییش لە رووی ئەو سەرچاوانەی کە وەکو تێکست لە زانکۆ و پەیمانگاکاندا پشتیان پێ دەبەسترێت. ئەم کەم کەم دەستییەش بە چەندین شێوە دەردەکەوێت وەکو:

١. نەبوون یان کەمیی ئەو سەرچاوانەی کە لایەنە ئەکادیمیەکان پڕ دەکەنەوە لە بوارە جیاجیاکاندا، لە ئەنجامیشدا قوتابیان سەرچاوەی پێویستیان لەبەر دەست نابێت بۆ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە زانستییەکان. ئەمەش گرفتی بەردەوامی ئەو قوتابیانەیە کە خەریکی نوسینی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی دەبن.

٢. ئەو سەرچاوانەی کە دەستیش دەکەون، رێژەیەکی باشیان راستەوخۆ لە زمانی ئینگلیزییەوە وەر نەگێڕدراون بۆ سەر زمانی کوردی، بەڵکو لە ئینگلیزییەوە کراون بە عەرەبی، ئینجا لە عەرەبییەوە بۆ کوردی. بەمەش بەشی هەرە زۆری ماناو پەیامەکەیان لەدەست داوە.

٣. لاوازی و ناڕێك و پێکی زمانی بەشێکی زۆر لە کتێبە وەرگێڕدراوەکان بە شێوەیەکە کە زۆر جار تێگەیشتن لەو کتێبانە ئاسان نابێت. ئەمەش نەك تەنها بۆ کتێب و سەرچاوەکان لە سەر ئاستی زانکۆ و پەیمانگاکان، بەڵکو تەنانەت کتێبی قۆناغە جیا جیاکانی پێش ئەویش بە دەست هەمان گرفتەوە دەناڵێنن.

لەسەر ئەو بنامایانە و بە پشت بەستن بە ئەزموونی زیاتر لە بیستساڵ لە کاری وەرگێڕان بە نوسین و زارەکییەوە بێجگە لە پسپۆرایەتی لە بواری زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیزیدا، بیرم لە پرۆژەیەك کردەوە بۆ وەرگێڕانی چەند کتێبێکی گرنگ و سوودبەخش لە بواری ئەکادیمیدا، بۆ ئەوەی نەوەی ئێستا و نەوەکانی تریش سوودیان لێ ببینن. بۆ ئەم مەبەستە هەوڵم دا کە دەزگایەکی وەرگێڕان لەسەر ئاستی زانکۆی گەرمیان بکەینەوەو لەو رێگایەوە چەند بەرهەمێکی بەسوود بخەینە بەردەستی خوێنەران و قوتابیان. بۆ ئەم مەبەستەش پرۆژەیەکم پێشکەش بە سەرۆکایەتی زانکۆ کرد، بەڵام بەداخەوە بەدەنگەوە هاتنی پێویستم بۆ پرۆژەکە بەدی نەکرد. بۆیە بڕیارم دا، کە لەلای خۆمەوە بە هەوڵی تاکەکەسی دەست پێ بکەم. هیوادارم نۆبەرەی هەوڵەکانم مشتێك بخاتە سەر خەرمانی کتێبخانەی کوردی و هاوکات دەرفەتێکیش بێت بۆ قوتابیان و مامۆستایانی زانکۆ تا سوودی لێ ببینن.

دیارە دەستنیشانکردنی بابەتی "جیۆپۆلیتیك" وەکو یەکەم بوار کە وەرگێڕانەکەی تێدا دەست پێ بکەم، لەبەر ئەوە بوو کە ئەم پرسە بەشێکی دانەبراوەیە لە پرس و کێشەی میللەتی کورد، لەگەڵ ئەوانەی تا ئێستاش ئامادە نین دان بە مافی زەوتکراوماندا بنێن، و بە شێوازی جیاجیاش هەوڵ بۆ شێواندنی جیۆپۆلیتیکی کوردستانی گەورە دەدەن. لە لایەکی ترەوە بابەتی جیۆپۆلیتیك تا ئێستاش لای خەڵکێك هەر بە مانای جوگرافیای سیاسی دێت لە کاتێکدا ئەو دوو بابەتە جیاوازن، و هەر یەکەو بۆ خۆی زانستێکی سەربەخۆیە، و بە شێوەی جیاواز کار دەکات.

خاڵێکی تری گرنگ لەم بوارەدا بریتییە لەوەی بابەتەکە زۆر تازەو مۆدێرنە، و نوسەرەکەی هەوڵی داوە تێگەیشتن و پرنسیپی کۆن و تازەی جیۆپۆلیتیك تێکەڵ بکات بۆ ئەوەی جیاوازی نێوانیان لە دوو سەردەمی جیاوازدا دەر بخات بە تایبەتییش کە پرۆفیسۆر "دۆدز" خۆی ئێستا ئەندامی دەستەی جیۆپۆلیتیکی جیهانییە.

# بەشی یەکەم

## گرنگیی بوونی شارەزایی دەربارەی جیۆپۆلیتیك

لە کاتێکدا کە ناونیشانی ئەم بەشەی کتێبەکە جۆرێکە لە داهێنانی خودیی و ڕەگ و ریشەکەی بۆ (ڕۆبەرت شتراوس-هیوپ) ی دامەزرێنەری پەیمانگای راستڕەوی لێکۆڵینەوەی سیاسەتی دەرەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەگەڕێتەوە، ئامانجی من بریتیە لە روونکردنەوەی ئەو راستییە کە شارەزایی دەربارەی جیۆپۆلیتیك تەنها گرنگ نییە و بەس بەڵکو لە گەرمەی ئەو خوێنڕێژییەی کە لە ئەفغانستان و عێراق و سودان و بە رادەیەکی کەمتریش لە کۆنگۆ بەڕێوە دەچێت،گرنگی بایەخدان بەم زانستە و پابەند بوون پێوە ئەرکێکی ژیاریی و مرۆییانەیە. سەرەڕای ئەو بیرو بۆچوونانەی کە سەبارەت بە شێوازی تۆکمەتر بۆ جیهانگەرایی دەردەبڕدرێن، بەلاّم هێشتا پرسەکانی وەکو هەرێم و سنوری نێودەوڵەتی و سەروەریی لە سیاسەتی جیهانیدا جێگای بایەخ و مشت و مڕن و گرنگیی خۆیان لەدەست نەداوە. ئەوەتا دەبینین هەندێ جار ناکۆکی لەسەر چەند مەترێك زەوی لێرەو لەوێ دەبێتە بابەتی ژیان یان مردن بۆ هەزاران کەس، و کاتێك ناوچەیەك بە "مەترسیدار" یان "ترسێنەر" ناو دەبرێت، ئیتر لەشکرکێشی لە سەر زەوی و لە دەریا و لە ئاسمانەوە بەدوای خۆیدا دێنێت وەکو ئەوەی لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٦دا بەسەر هاوولاّتیانی لوبناندا هات.



١. لە دوای چەند حەفتەیەك لە بۆمباران کردن لە ساڵی٢٠٠٦، بەیروتی پایتەختی لوبنان دەگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی.

تەنانەت هاوپەیمانانی ئەمریکاش لە شەڕی جیهانیی دژ بە تیرۆر وەکو وڵاتی پاکستان (بە پێی قسەی سەرۆك پەرویز موشەڕڕەف- کە ئەو کاتە سەرۆکی پاکستان بوو- وەرگێڕ)، مەترسی ئەوەیان لێ دەکرێت کە بگەڕێنرێنەوە بۆ سەردەمی بەردین ئەگەر بێت و پابەندبوونیان بە ریشەکێش کردنی تیرۆریستان و هاوکاری کردنی ئەمریکا بە جۆرێك لە جۆرەکان لاواز ببێت. سەبارەت بەو کەسانەی کە لە ئەوروپا یان ئەمریکای باکوور دەژین، لە سەرەتاوە بابەتی جیۆپۆلیتیك وەکو بابەتێکی کەم بایەخ دەردەکەوت، چونکە بە رواڵەت وا دیاربوو کە ئەو بابەتە بۆ ناوچە کێشەدارەکانی جیهان گونجاوترە. بەڵام ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە چونکە جیۆپۆلیتیك بووەتە بەشێك لە ژیانی رۆژانەی ئێمەش. مەبەستم لە وشەی "ئێمە" ئەو خوێنەرانەیە کە لەوانەیە بتوانن بە شێوەیەکی باشتر خۆیان تەرخان بکەن بۆ بابەتی وەکو ململانێی رۆژانەی ئەودیو سنوورەکان، و هەروەها ململانێ لەسەر خاوەندارێتی زەوی و رێگا گرتن لە هاتنە ناوەوەی چەکداری یاساغ و یان تیرۆریستە خۆکوژەکان بۆ ناو وڵاتەکان. لە کاتێکدا کە لەوانەیە هەندێك لە هاووڵاتیانی بەریتانیا و ئەمریکای باکوور نیگەران بن لە پشکنینە ئەمنیە تازەکان لە فڕۆکەخانەو بەندەرەکاندا، بەڵام کاریگەریی هێرشە تیرۆریستیەکانی ١١ی سیپتەمبەری ٢٠٠١ هێشتا زۆر بەربڵاو و بەرچاوە. ئینجا هێرشە تیرۆریستیە خۆکوژییەکان لە شارەکانی بالی و دارولبەیزا و ئەستەمبول و قودس و لەندەن و مەدرید کە لەسەرو بەندی داگیرکاریی ئەنگلۆ- ئەمریکی بۆ عێراق بەڕێوەچوون، جارێکی تریش دوپاتیان کردەوە کە چارەنوسی میللەت و خاکەکان بە یەکەوە بەستراون. دیارە شارەکانی ئەو وڵاتەش کەوتنە ژێر باری قورسی هێرشە هەمەلایەنەکانەوە، وەکو شارەکانی بەغدا و فەلوجە و موسڵ کە دانیشتووانەکانیان رۆژانە دەکەونە بەر ئاگری هێرشە خۆکوژییەکان و تیمەکانی مردن. بە پێی چەند ئامارێکی رێکخراوە ناحکومییەکانیش، لە مانگی ئاداری ساڵی ( ٢٠٠٣ ) وە زیاتر لە ٦٥٠ ٠٠٠ عێراقی کوژراون و ٢ ملیۆن ئاوارە بوون و هەروەها ١٠ ملیۆن کەسیش تەنانەت ئاوی خواردنەوەیان دەست ناکەوێت (باسەکەی پرۆفیسۆر دۆدز لێرەدا بۆ ساڵانی پێش ٢٠٠٧ دەگەڕێتەوە- وەرگێڕ).

ئێستاش هەفتانە لە رێگای ئیمەیڵەوە فۆرمم بۆ رەوانە دەکرێت بۆ ئەوەی پشتیوانی لەو دامەزراوە ناحکومییانە بکەم کە لە شوێنەکانی وەکو باشوری لوبنان و عێراق و فەلەستین و ئەفغانستان هەمیشە لە ژێر هەڕەشەو مەترسیدا کار ی مرۆیی دەکەن. لەوانەیە هەندێك لەو شوێنانە سەرنجی ئێمە رابکێشن بۆ ئەوەی بچین و دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەین، بەڵام سەبارەت بە شوێنانی تری زۆر مەترسیدار وەکو مەقادیشۆ (پایتەختی سۆماڵ) دەکرێ لە رێگای ئەلیکترۆنییەوە هاوکارییان بکرێت.

ئەگەر بڕیارە بچینە ناو سەردەمێکی تازەی "خوێن و ئاسن"ەوە، ئەوا دەبێت لەو پەیوەندییە راستەقینە و واقعییانە کە ناوچەکان و کۆمەڵگا مرۆییەکان بەیەکەوە دەبەستنەوە و هەروەها دەرەنجامەکانی ئەو پەیوەندییانە بە شێوەیەکی باشتر تێ بگەین، چونکە جیۆپۆلیتیك بە تایبەتی کار لەسەر سنوور و سەرچاوە و هەرێم و ناسنامەکان دەکات و دەتوانێت رێگایەك بکاتەوە بۆ هەڵسەنگاندنی رەخنەیی و تێگەیشتن لەو بابەتانە، هەرچەندە ئەو هەڵسەنگاندن و تێگەیشتنانە جێگای مشت و مڕو گفتوگۆش بن.

بەڵام با بپرسین کە جیۆپۆلیتیك بە وردی مانای چییە؟ ئەگەر سەردانی سایتی گوگڵ بکەیت بۆ زانینی وەڵامی ئەو پرسیارە، ئەوا لەوانەیە نزیکەی شەش تا حەوت ملیۆن وەڵام ببینیت. هەر کەسێکیش زۆر زیرەك و یان زۆر نەزان بێت و خۆی بخاتە ناو ئەو گێژاوەوە، ئەوا مەرج نییە لە کۆتاییدا بە ئەنجامی روون و بێ سێ و دوو سەبارەت بە پێناسەی ئەم زاراوەیە دەربچێت. بەڵام تیۆرسازی کۆمەڵایەتی "مایکل مان" لە بارەی زاراوەکەوە دەڵێت:

جیۆپۆلیتیك وەکو زۆربەی ئەو زاراوانەی کە سەرنجی پسپۆڕانیان راکێشاوە، زاراوەیەکی تەم و مژاوییە و بە زۆریی لە لایەن رۆژنامەنوسان و رەخنەگرانی وەکو (تۆماس بارنیت) لە گۆڤاری (ئیسکوایەر) و (تۆماس فریدمان) لە رۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) و وەزیری پێشووی دەرەوەی ئەمریکا (هینری کێسنجەر) ەوە وەکو کورتکراوە بەکار دەهێنرێت بە مەبەستی راگەیاندنی بۆچوونێکی تایبەت سەبارەت بەو کردە سیاسییانەی کە چوارچێوەی جوگرافی بەکار دەهێنن وەکو "تەوەری شەڕ" و "پێگەی زۆرداری". لە جیاتی ئەوەی ئەو زاراوانە وەکو راستیی سەلمێنراو وەر بگرین (یان بە سانایی گاڵتەیان پێ بکەین)، باشتر وایە بە دوای ئەو دەرەنجامانەدا بگەڕێین کە لە ئاکامی دابەشکردنی جیهان بەسەر تەوەری جیاجیادا دێنە ئاراوە.

## بەرەو تێگەیشتن لە جیۆپۆلیتیك

زانستی جیۆپۆلیتیك ریگای سەیرکردنی جیهان واڵا دەکات، بۆیە زیاتر زانستێکی بینراوە کە پشت بە نەخشەو خشتە و وێنە دەبەستێت. هەرچەندە لە هەوڵەکانمان بۆ چەسپاندنی پێناسەیەکی وا بۆ زاراوەکە کە کۆدەنگی رەخنەگران وەدەست بێنێت، سوودێکی ئەوتۆ نابینین، بەڵام دوو تێگەیشتنی جیاواز بۆ زانستی جیۆپۆلیتیك بەسە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ئەم پێشەکییە زۆر کورتە:

یەکەم: جیۆپۆلیتیك رێبەرێکی باوەڕپێکراو دەربارەی دیمەنی سروشتیی جیهان بە بەکارهێنانی وەسفی جوگرافی و خوازەو چوارچێوەی وەك "دیواری ئاسنین"، "جیهانی سێیەم" و یان "وڵاتانی شەڕانگێز"

پێشکەش دەکات. هەر یەك لەم زاراوانەش لە بنەڕەتدا جوگرافین، چونکە شوێنەکان بە گشتی لەسەر بنەمای جوگرافی پێناسە دەکرێن. ئەم شێوازەش یارمەتی دروستبوونی مۆدێلێکی سادە بۆ جیهان دەدات کە بەکار بهێنرێت بۆ رێنمایی کردن و ئاگادارکردنەوەی داڕێژەرانی سیاسەتی ئاسایش و دەرەوە. ئەم پێناسە کردنەی (جیۆپۆلیتیك) یش بە گرنگترین پێناسە لە رووی بەکارهێنانی رۆژانە لە هەواڵی رۆژنامە و رادیۆ و گۆڤار و تەلەفزیۆنەکاندا دادەنرێت. هەر ئەو هەواڵانەش حکومەت و وڵاتەکان بچوك دەکەنەوە بۆ وەسفی جوگرافیی وەك "لەندەن"و "واشنتون" و "مۆسکۆ".

دووەم: پێویستە تەرکیزیش لەسەر چۆنێتی بکارهێنانی جیۆپۆلیتیك وەکو کایەیەکی گشتی و ئەکادیمی بکرێت. بۆیە لە جیاتی ئەوەی کە تەنها وای دانێین ناوەکانی وەکو "دیواری ئاسنین" و "بەرەی شەڕ" بەهای ئاراستەکراوی خۆیان هەیە، دەبێت بپرسین کە چۆن تێگەیشتنی تایبەتی بۆ شوێنەکان و کۆمەڵگاکان و ناسنامە هاوشێوەکانیان دروست دەکرێت. بۆ نموونە زاراوەی "جیهانی سێیەم" تەنها وەکو وەسفێکی جوگرافی بۆ زۆرێك لە شوێنەکان لە ئەفریقا و ئاسیا و ئەمریکای لاتین بەکار ناهێنرێت، بەڵکو یارمەتی ئەوەی داوە کە جوگرافیای سیاسی شەڕی سارد لە دوو لایەنەوە بکاتە سێ لایەنە،و تێیدا ئەمریکا و "جیهانی یەکەم"ی وەکو رکابەرێکی جیهانی لە بەرامبەر یەکێتی سۆڤێت و "جیهانی دووەم" داناوە. لە کاتێکدا هەندێك لە شارەزایان رەخنەی ئەوەیان دەگرت کە زاراوەی " جیهانی سێیەم" بە مانای گۆڕەپانێکی کراوە دێت بۆ پیادەکردنی ململانێی زیاتر لە نێوان زلهێزەکاندا، بەشێکی تر لە سەرکردەو رۆشنبیران لە ئەفریقا و ئاسیا و ئەمریکای لاتین، زاراوەکەیان وەکو رێکارێك وەرگرتووە کە ئەوان لە رووی سیاسی و جوگرافییەوە لە جیهانی باکوور جیا دەکاتەوە.

ئەم کتێبە بە تەواوی لایەنگری بۆچوونی دووەمە لەسەر حسابی بۆچوونی یەکەم، و بەمەش هەوڵ نادات بۆ دابینکردنی رێبەرێکی جیۆپۆلیتیکی بۆ داڕێژەرانی سیاسەتی دەرەوە لە رۆژئاوا. هەروەها واش دەرناکەوێت کە وەکو پاڵپشتێك بۆ هەوڵەکانی کۆمەڵەی هینری جاکسۆن دابنرێت کە بارەگاکەی لە (کامبرج)ە، و بەم دواییە شێوازێکی نوێی لە جیۆپۆلیتیکی دیموکراسی بۆ سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیا پێشنیار کردووە. هەرچەندە ئەوان زاراوەی (جیۆپۆلیتیك) یان بەکار هێناوە، بەڵام هەوڵیان نەداوە بۆ روونکردنەوەی سروشتی خودی زاراوەکە، بەڵکو ئامانجەکە تەنها ئەوە بووە بزانرێت چۆن جیۆپۆلیتیك بەکار دەهێنرێت و دەرەنجامەکانی لە ژیانی رۆژانەدا چین؟

بە گشتی نوسەرانی بواری جوگرافیا رووبەری جیهان وەکو خاڵی سەرەتا بۆ نوسینەکانیان بەکار دەهێنن، و سەرکردەو رەخنەگرانی سەرجەم بوارە سیاسییەکان و باکگراوندەکانیش ناتوانن خۆیان لە

سەیرکردنێکی گشتگیرانەی جیهان ببوێرن. لە کاتی تەنگژە جیهانییەکان و شەڕەکانیشدا، زیاتر ئەو راستییە روون دەبێتەوە کە پێویستە ئەو سەیرکردنە گشتگیرانە زاڵ بن بەسەر بۆچوونەکاندا. بۆ نموونە ئەگەر سەیری هەندێك لە وتەکانی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، ونستون چرچڵ و سەرۆکی ئەمریکا، هاری ترومان لە ناوەڕاستی چلەکاندا بکەین، دەبینین چوارچێوەی سیاسی و جوگرافی بە روونی لەو وتانەدا بەدی دەکرێن، چونکە هەردووکیان هەوڵیان دەدا باس لە جیهانێك بکەن کە بە دەست گرفتەوە تووش بووە. ئەوەبوو سەرکەوتنی هێزە هاوپەیمانەکان، بە پێچەوانەی پێشبینییەکان، سەقامگیریی جیهانی بەدوای خۆیدا نەهێنا، و دوای سێ ساڵ لە کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانیی دووەم، هێزە سەرکەوتووەکان لەسەر کۆنترۆڵ کردنی شاری دابەشکراوی بەرلین تووشی گرفت هاتن. دوای تێپەڕ بوونی پێنج ساڵیش بەسەر شەڕەکەدا، هەمان هاوپەیمانەکانی کاتی شەڕ لە گەڵ وڵاتی چیندا کەوتنە ململانێ کردن و دژایەتی کردنی یەکتر لە سەر نیمچە دوورگەی کۆریا. لە ئەنجامی ئەو ململانێیەشدا زیاتر لە دوو ملیۆن کەس کوژران کە زۆربەیان هاووڵاتی سیڤیل بوون. هەتاکو ئێستاش ئەو نیمچە دوورگەیە بە درێژایی هێڵی ٣٨ی ئاسۆیی بە دابەشکراوی ماوەتەوە.

لە ئاداری ١٩٦٤دا، بەر لە تەنگژەکانی بەرلین و کۆریا، ونستون چرچڵ وتارێکی لە شاری (فولتون) لە ویلایەتی مەیسوری پێشکەش کرد و تێیدا ئاماژەی بە یەکێك لە دەربڕینە هەرە لەبیر نەکراوەکانی سەدەی بیستەم کرد:

هێڵێکی ئاسنین لە ستێتین لە ناوچەی (بەڵتیك) ەوە بۆ تریستی لە دەریای ئدریاتیکی بەناو کیشوەری ئەوروپادا کێشراوە. سەرجەم پایتەختەکانی وڵاتە کۆنەکانی ئەورووپای ناوەندی و رۆژهەڵاتییش دەکەونە پشتی ئەو هێڵەوە. شارە بەناوبانگەکانی وارشۆ و بەرلین و پراگ و ڤییەنا و بۆدابست و بەلگراد و بوخارست و سۆفیا و هەروەها دانیشتووانەکانیشیان دەکەونە ئەو ناوچەی کە پێویستە پێی بوترێت ناوچەی ژێر کاریگەری سۆڤییێت، و سەرجەم ئەو شارو دانیشتوانانەش نەك تەنها بە شێوازێك لە شێوازەکان دەکەونە ژێر کاریگەریی سۆڤییێتەوە بەڵکو لە هەندێك حاڵەتدا دەکەونە ژێر کۆنترۆڵی مۆسکۆ.

دوو جار ئەمریکا ناچار بوو کە چەندین ملیۆن لە لاوەکانی خۆی لە زەریای ئەتڵەسی بپەڕێنێتەوە بۆ شەڕکردن، بەڵام ئێستا دەبینیت کە جاری وا هەیە لە یەك رۆژدا نەتەوەیەکی تازە بۆ جیهان زیاد دەبێت. (کورد یەکێکە لەو نەتەوە کەمانەی کە هێشتا چاوەڕێی دەرفەتە بۆ ئەوەی وەکو نەتەوەی خاوەن دەوڵەت لە جیهاندا بناسرێت. هیوادارین بەشێکی کەم لە چاوەڕوانییەکە مابێت- وەرگێڕ).

بێگومان پێویستە بە وریاییەوە لە چوارچێوەی پێکهاتەی نەتەوە یەکگرتووەکان کار بکەین بۆ بەدی هێنانی ئارامی لە ئەوروپا بە شێوەیەك کە بگونجێت لە گەڵ دەستوری وڵاتماندا.

ئەڵبەتە زاراوەی "دیواری ئاسنین" هەر لە دوای دەرکەوتنیەوە سەرنجێکی زۆری رای گشتی بۆ لای خۆی راکێشا و مانایەکی زۆر راستەقینەی سنوری جوگرافی دەردەبڕی، کە ناوچەیەکی بەرفراوانی لە کیشوەری ئەوروپا بەخۆوە دەگرت. لە راستیدا ئەگەر دیوارێك لە ئاسن دروست کرابێت، ئەوا نەك هەر رێگا لە ئاودیو بوونی تیشك دەگرێت، بەڵکو دەبێتە بەربەست بۆ هەر جۆرە ئاودیو بوونێکی تر وەکو ئاودیو بوونی خەڵك و شت و مەکەکان. (ونستون چرچڵ) یش هەمیشە لە دوو توێی وتارەکانیدا لە کاتی شەڕ و هەروەها لە سەردەمی شەڕی ساردیشدا ئاماژەی بە رووناکی و تاریکی دەدا، بە مەبەستی دەربڕینی ئەو بۆچوونەی کە چۆن ئەوروپا دابەش بووە لە نێوان سیستمی دیموکراسی لیبراڵی لە رۆژئاوا لە لایەك، و فاشیزم و دواتریش رژێمە کۆمۆنیستەکان لە رۆژهەڵات لە لایەکی ترەوە. ئەڵبەتە زاراوەی "دیواری ئاسنین" لە ئەندێشەی جوگرافی خەڵکدا لە هەردوو لای زەریای ئەتڵەسی چەسپاوە و دواتریش لە ساڵی ١٩٨٢ زاراوەی "ئیمپراتۆریەتی شەڕ" هاتە پاڵی، کە سەرۆکی ئەمریکا (رۆناڵد ریگان) بەکاری هێنا بۆ وەسف کردنی یەکێتی سۆڤیێت. سەیر لەوەدایە کە میدیای روسی وتەکانی (چرچڵ) ی لە کاتی خۆیدا بلاو نەکردووە، بەڵام دواتر (جۆزیف ستالین) ی سەرکردەی روسیا هەمان ئەو وتانەی بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی هاووڵاتیانی خۆی بگیەنێتە ئەو بڕوایەی کە روسیا لە ژێر هەڕەشەی گروپێك دەسدرێژیکاردایە کە ئەمریکا و هاوپەیمانە رۆژئاواییەکانی بەخۆوە دەگرێت لەسەرووشیانەوە بەریتانیا.

سەرۆك (ترومان) یش کە لە سەردەمی (چرچڵ) و (ستالین) دا لە دەسەڵاتدا بوو، وتەکانی خۆی بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی روونی بکاتەوە کە جیهان لە ساڵانی چلەکاندا لە گۆڕاندایە. بۆ نموونە لە وتارێکدا کە لە ١٢ی مانگی ئاداری ١٩٤٧ ئاراستەی کۆبوونەوەیەکی هاوبەشی کۆنگریسی کرد، وێنایەکی روونی بۆ جیهان دەربڕی کاتێ وتی:

لەم رۆژانەدا لە مێژووی جیهان پێویستە هەموو نەتەوەکان لە نێوان جۆرە جیاجیاکانی ژیاندا جۆرێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن و بە زۆرییش ئەو هەڵبژاردنە رەها و ئازادانە نییە.

یەکێك لە جۆرەکان لەسەر بنەمای ئارەزووی زۆرینە بونیات نراوە، و بە چەند تایبەتمەندییەك جیا دەکرێتەوە وەکو: دامەزراوە ئازادەکان، حکومەتی نوێنەرایەتی، هەڵبژاردنی ئازاد و هەروەها مسۆگەر کردنی ئازادی تاکە کەسی و ئازادی ئایین و رادەربڕین و رزگاربوون لە چەوساندنەوەی سیاسی. بەڵام جۆری دووەم بەندە بە ئارەزووی کەمینەوە کە بە زەبر و زەنگ بەسەر زۆرینەدا

دەسەپێنرێت. ئەم جۆرەش پشت بە چەند رێو شوێنێك دەبەستێت وەکو ترساندن و چەوساندنەوە و کۆنترۆڵکردنی بڵاوکراوەو رادیۆکان و هەڵبژاردنی جێگیر (کە دەرەنجامەکەی پێشوەختە بڕیاری لەسەر دەدرێت)، و هەروەها سەرکوتکردنی ئازادی تاکەکەسیی. بە بۆچوونی من پێویستە سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەر پشتیوانی کردنی ئەو گەلە ئازادانە بونیات بنرێت کە رووبەرووی هەوڵی سەرکوتکردن دەبنەوە لە لایەن کەمینە چەکدارەکان و یان لە رێگای پاڵەپستۆی دەرەکییەوە. بڕوام وایە کە پێویستە پشتیوانی لە گەلانی ئازاد بکەین تا چارەنوسی خۆیان بەو رێگایانە دەستنیشان بکەن کە خۆیان دەیانەوێت. هەروەها پێویستە پشتیوانی کردنەکەمان بە شێوەی سەرەکی لە رێگای یارمەتی ئابووری و داراییەوە بێت، کە زۆر پێویستە بۆ بەدی هێنانی سەقامگیری ئابووری و ئەنجامدانی چاکسازی سیاسی.

دیارە جیهان لە بارێکی چەسپاودا نییە و دۆخی ئێستاش شتێکی پیرۆز نییە کە گۆڕانکاری بەسەردا نەیەت. بەلاَم ناکرێت ئەو گۆڕانکارییانە یاساکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ببەزێنن و لە رێگای نایاسایی وەکو بە زۆر سەپاندن و یان تواندنەوەی سیاسییەوە جێبەجێ بکرێن. کاتێ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی نەتەوە ئازاد و سەربەخۆکان دەکات کە ئازادی خۆیان بپارێزن، ئەوا مانای وایە کە رۆڵی ئیجابی دەگێڕێت لە کاراکردنی پرنسیپەکانی یاسای نەتەوە یەکگرتووەکان. بۆ نموونە زۆر پێویستە سەیرێکی نەخشە بکەین تا بزانین مانەوەو یەکگرتوویی نەتەوەی یونان لە چوارچێوەیەکی گشتیدا چەند گرنگ و بایەخدارە. ئەگەر ئەو وڵاتە بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی کەمینەیەکی چەکدارەوە، کاریگەریی ئەو دۆخە لەسەر تورکیای دراوسێی زۆر گەورەو ترسناك دەبێت، چونکە لەوانەیە لە ئەنجامدا ببێتە مایەی ئاژاوەو بێ سەروبەریی لە سەرانسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

وادیارە لێدوانەکەی (چرچڵ) کاریگەر بوو لە وێنا کردنی خەونە جوگرافییەکانی ئەمریکا و جیهانیش بە گشتی لە دوای ساڵی ١٩٤٥. دوای وردبوونەوە لە بارودۆخی لەرزۆکی نێوان یونان و تورکیا، سەرۆکی ئەمریکا (جۆری حوکم) و یان دابەشکردنێکی کاریگەر و سادەی پێشنیار کرد لە نێوان ئەو وڵاتانەی پشتیوانی ئازادی و سەربەخۆیی و دیموکراسییان دەکرد،و ئەوانەی پێچەوانەی ئەو سیستمە دەجولاَنەوە. ئاشکرایە دابەشکردنەکەی سەرۆك بە ئامانجی ئەوە بوو کە دروستیی سیاسەتی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە سەر حسابی یەکێتی سۆڤییێت دەربخات. هاوکات وڵاتی ئەمریکاشی پابەند کرد بە پشتیوانی کردنی نەخشەی جوگرافی سەردەمی دوای ساڵی ١٩٤٥. دیارە پشتیوانییەکانی ئەمریکا لە چلەکان و پەنجاکاندا زۆر کاریگەر بوون، هەرچەندە لەو سەردەمەدا

ژمارەی دەسەڵاتە هاوچەرخە دوو رووەکان، و یان ئەوانەی کردەوەی دوژمنکارانەی شاراوەشیان بەرامبەر نەتەوە یەکگرتووەکان ئەنجام دەدا، لە زیادبووندا بوو.

زاراوەی وەکو "دیـواری ئاسـنین" و دواتـریش دەرکـەوتنی زاراوەی "ئیمپراتۆرییـەتی شـەڕ" لـە سەردەمی سەرۆك رۆناڵد ریگان لە هەشتاکان و یان "تەوەری شەڕ" لە سەردەمی سەرۆك جۆرج بـۆش لە ساڵی ٢٠٠٢ جێگای بایەخ و گرنگی زۆرن، چونکە بە بەردەوامی پاساویان بۆ جۆرەکـانی هونـەری فەرمانڕەوایی و دروستکردنی بڕیار لە سەر ئاستی سیاسەتی دەرەوە دەهێنایـەوە و یـان بـە یاسـاییان دەکرد.

وەسفی جوگرافی هەمیشە توخمێکی سەرەکی بووە لە جێبەجێ کردنی سیاسـەتەکانی ئاسـایش و دەرەوە، بەڵام لەوانەیە ئەو وەسفانەی کە بۆ شـوێن و ناوچـەکان دەکـرێن، لـە ئـەنجامی رووداوەکانـدا گۆڕانکاری بنەڕەتییان بەسەردا بێت . بۆ نموونە، رووخانی دیواری بەرلین لە مانگی تشـرینی دووەمـی ساڵی ١٩٨٩، بووە هۆی دووبارە هەڵسەنگاندنەوەی ئەوروپای ناوەنـدی و ئـەوروپای رۆژهـەڵاتیش لـە لایەن هەردوو حکومەتی ئەمریکا و روسیاوە. ئیتر مانایـەکی سیاسـی یـان جـوگرافی بـۆ "دیـواری ئاسنین" نەما، چونکە حکومەتە دیموکراسییەکان هاتنە سەر کار و رژێمـە کۆمۆنیسـتەکانیان کـەنار خست. دوای دوو ساڵیش، یەکێتی سۆڤیێت کە پێـی دەگـوترا "ئیمپراتۆرییـەتی شـەڕ" لەبـەر یـەك هەڵوەشایەوە، و لە ئەنجامیشدا رێکخراوی ئاسایشی شەڕی سارد، واتـا رێکخـراوی پـەیمانی بـاکووری ئەتڵەسی (NATO، کـە لـە سـاڵی ١٩٤٩ دامەزرا)،پـەرەی سـەند بـۆ ئـەوەی وڵاتـانی بلـۆکی رۆژهەڵاتی پێشوو وەکو پۆڵەندا و کۆماری چیك و هەنگاریاش بگرێتەوە. حکومەتی روسیاش لەولاوە بە نیگەرانییەوە چاودێری ئەو پێ درێژکردنەی رۆژئاوای دەکرد بە بێ ئـەوەی بتوانێـت کاردانەوەیـەکی جیددی لە بەرامبەریدا نیشان بدات.

وەکو پێشتر ئاماژەم پێ کرد، دەکرێ جیۆپۆلیتیك بایـەخ بـە تێگەیشـتنی جـوگرافی شـاراوە لـە سیاسەتی جیهانیدا بدات کە رۆژانە لە لایەن سیاسـەتمەداران و رۆژنامـەنوسـان و پسـپۆڕانەوە بـەڕێوە دەبرێت. بۆ نموونە زاراوەی وەکو "جیهـانی سـێیەم" نـەك تـەنها یارمـەتیی پێناسـە کردنـی ناوچـە تایبەتەکانی جیهان دەدات، بەڵکو هاندەریشە بۆ دروستبوون و هەڵسوڕانی هۆکارەکانی شەڕی سـارد. بەم دواییەش چەند وڵاتێکی سەربەخۆ لە ئەفریقا و ئاسیا زاراوەی " وڵاتانی بـێ لایـەن " یـان بـەکار دەهێنا بۆ ئەوەی ئارەزووی خۆیان لە دروستکردنی چەند شێوازێکی جیاواز لە پەیوەندییـە جـوگرافی و ئایدۆلۆجییەکان دەربڕن کە پەیوەست نەبێت بە هیچ یەك لە دوو زلهێزەکەی جیهانەوە.

هەرچەندە لۆجیکیە کە تەرکیز لەسەر لێدوان و هەڵس و کەوتی سەرکردە سیاسییە بەهێزەکان بکەین، بەلاّم چالاکییە جیۆپۆلیتیکییەکان تەنها پەیوەست نین بە دەوڵەت و حکومەتەکانەوە، بەڵکو چەندین لایەنی تریش بە (جیۆپۆلیتیك) ەوە سەرقاڵن، بۆ نموونە تاکەکان و رێکخراوە ناحکومییەکان و کۆمپانیا تایبەتییەکان و دامەزراوە هەرێمایەتییەکانی وەك نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەوروپا. تەکنەلۆجیای تازەی بواری میدیاش وەکو ئینتەرنێت لە لای خۆیەوە هاوکارێکی باشە بۆ رێکخراوە ناحکومییەکانی وەکو گروپەکانی دژە جیهانگەرایی و تۆرە تیرۆریستییەکان، کە ئەو تەکنەلۆجیایە بەکار دەهێنن بۆ زامنکردنی پشتیوانی رای گشتی بۆ چەندین کایەی جوگرافی و سیاسی لە جیهاندا.

ئەم چەمکی ئەندێشەی جوگرافییە زۆر گرنگە و بە زۆری بۆ نوسینەکانی زانای کۆچکردووی فەلەستینی- ئەمریکی، ئیدوارد سەعید دەگەڕێتەوە. لە زۆربەی کتێبەکانیدا بە کتێبی (رۆژهەلاّتناسین) یشەوە کە لە ساڵی ١٩٧٨ دانراوە، سەعید گرنگی بەوە داوە کە چۆن شوێنەکان وێنا دەکرێن و لە شێوازەکانی هونەری و ئەدەبی و موسیقی و لە دروستکردنی سیاسەتی دەرەوەی رۆژئاواشدا نیشان دەدرێن. وەکو کەسێکی پابەند بە بیرۆکەی دەوڵەتی فەلەستینەوە، ئیدوارد سەعید هەمیشە هەستیاریی نیشان دەدا سەبارەت بەوەی کە چۆن رای گشتی زاراوەی نەشیاو و نەرێنیی وەکو: ناسەقامگیر و ترسناك و نامۆ بۆ وەسف کردنی فەلەستینییەکان و جیهانی عەرەب بەگشتی بە کار دەهێنێت . بە بۆچوونی ئیدوارد سەعید، ئەو جۆرە وەسفانە مانایان وایە کە لەوانەیە هەر تێگەیشتنێکی کولتووری تایبەتی بۆ شوێن و کۆمەڵگاکان ببێتە هۆی تەییار کردنی رای گشتی و سیاسەتمەداران بە ئاراستەیەك کە لە گەڵ پرۆژەی دروستکردنی کۆمەڵگایەکی فەلەستینیی ئۆتۆنۆمیدا نەگونجێت. سەعید کە بەشی زۆری تەمەنی لە نوسیندا لە ئەمریکا بەسەر برد،لە وە نیگەران بوو کە میدیای باوی ئەو ولاّتە سۆزی بۆ مەرگەساتی فەلەستینییەکان نییە و بە زۆرییش وەکو دالّدەدەری تیرۆریستان دەیانژمێرن لە جیاتی ئەوەی وەکو خەڵکێکی ئاوارەکراو لێیان بڕوانن کە لە کۆمەڵگاکاندا ترێنجاون و یان وەکو خودی سەعید ئاوارەی ولاّتان بوون. دیارە ئەگەر بەم شێوازەش لە فەلەستینییەکان تێ بگەن، ئەوا ئەرکی لایەنگرانی ئیسرائیل ئاسان دەبێت لە پەراوێزخستنی ئەو هەولاّنەی کە دەدرێن بۆ راکێشانی سەرنجی رای گشتی بەلای بابەتی داگیرکردنی کەناری رۆژئاواو دەرەنجامەکانی دروستکردنی دیواری ئەمنی لە لایەن ئیسرائیلەوە. ئیتر کێ حەز دەکات پشتیوانی لە گەلێك بکات کە بە میوانداری تیرۆریستان ناوزەد کرابێت؟

بێگومان وێناکردنی جوگرافی یارمەتی خەڵك دەدات بۆ تێگەیشتن لە جیهان و بەمەش دەکرێ بڵێین کە هەموو ئێمە تیۆرسازی جوگرافیین. بەڵام لەوانەیە تێگەیشتنی جوگرافی هەر یەکێك لە ئێمە بۆ جیهان جیاواز بێت لە تێگەیشتنی خەڵکی تر لەبەر کۆمەڵێك هۆکار وەکو هۆکاری ئاینی و ئەتنی و سیاسی و...هتد. بۆ نموونە، بەلای موسڵمانانەوە چەمکی "ئومە" یەکێکە لە گرنگترین توخمەکانی وێناکردنی جوگرافیی دەستەجەمعی. ئومە بریتیە لە کۆمەڵگایەك لە موسڵمانان کە بە درێژایی باکووری ئەفریقاو ئەوروپا و ئاسیادا شۆڕ دەبنەوە. رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی وەکو رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی کە لە ساڵی ١٩٦٩ دامەزرا (١٣٩٠ بە پێی رۆژژمێری ئیسلامی)، بە تایبەتی بۆ ئەوە دروست بوون کە شێوازێك لە ئەڵتەرناتیڤ بۆ بەشەکانی تری جیهان بدۆزنەوە کە بە وڵاتانی بەهێزی مەسیحی ناوزەدیان دەکەن، و هەروەها بۆ ئەوەی رۆڵ و بۆچوونی خۆیان بۆ سیستمی جیهانی بخەنە روو کە جێگای بۆچوونی ئەو وڵاتە بەهێزە مەسیحییانە بگرێتەوە. ئەگەر لاپەڕەی تایبەتی رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامییش لە سەر تۆڕی ئینتەرنێت بکەیتەوە، دەبینیت ئامانجی ئەو رێکخراوە پێچەوانەی ئەو نموونە جیهانییەیە کە نەتەوە یەکگرتووەکان وێنای کردووە.

## جیۆپۆلیتیك و کلتوری گشتی

جیۆپۆلیتیك شتێك نییە کە بە سانایی لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا روو بدات یان لە رێگای بۆچوونی رۆژنامەکانی وەکو (نیویۆرك تایمز) و (گاردیان) ەوە پەیدا ببێت. بۆ نموونە با وتاری ساڵانەی سەرۆکی ئەمریکا وەربگرین. سەرۆکی ئەمریکا لە مانگی کانوونی دووەمی هەموو ساڵێك ئەم وتارەی ئاراستەی دانیشتنێکی هاوبەشی کۆنگریس دەکات، و دەبێتە دەرفەتێکی گونجاویش بۆ سەرۆك تا تێیدا گۆشەنیگای خۆی سەبارەت بە وڵاتەکەی و جیهان بە گشتی بخاتە روو. وەکو بەشێك لەو پێداچوونەوە گشتگیرە، وتارەکە چەندین کایەی جوگرافی بەکار دێنێت بۆ ئەوەی وڵات و ناوچەکان بە پێی گرنگیی جوگرافییان ریزبەند بکات، هەر لە هاوپەیمانە سەرەکییەکانەوە بگرە هەتاکو دەگاتە دوژمنە ئاشکراکانی ئێستا. ئەڵبەتە وتارەکە راستەوخۆ لە تەلەفزیۆنەوە پەخش دەکرێت و بەمەش دەبێتە بابەتی شیکردنەوەی هەمەلایەنەی گۆڤار و رۆژنامەکان. هەروەها بە حوکمی ئەوەی کە قسەی سەرکردەی بەهێزترین وڵاتی جیهانە، وتارەکە لە لایەن میدیا جیهانییەکانیشەوە لێکدانەوەی گشتگیری بۆ دەکرێت، و لە ئەنجامدا دەبێتە بەشێك لە ژیانی رۆژانە و گفتوگۆکانی ناو ماڵەکان و دەزگا و شوێنە گشتییەکانیش.

وتاری ساڵی ٢٠٠٢ی سەرۆك كە لە كانوونی دووەمدا و تەنها چەند مانگێكی كەم لە دوای هێرشە تیرۆریستییەكانی ١١ی ئەیلوول بۆ سەر ئەمریكا پێشكەش كرا، ڕووداوێكی زۆر گرنگ بوو، چونكە هاووڵاتیانی ئەمریكا چاوەڕێ بوون ببینن كە چۆن فەرماندەی هێزە چەكدارەكانی وڵاتەكەیان مەترسییەكان ڕوون دەكاتەوە. ئەو كاتە هاووڵاتیانی ئەمریكا هێشتا لە حاڵەتی شۆكدا بوون و چاوەڕوان بوون بزانن بە چی جۆرێك سەرۆك گەلەكەی دڵنیا دەكاتەوەو گرنگی وڵاتەكەی لەسەر ئاستی جیهان دووپات دەكاتەوە؟ لە دووتوێی قسەكانیدا، سەرۆك بوش ئەم لێكدانەوە جوگرافیە ئاشكرایەی خستە ڕوو:

ئامانجی دووەممان ئەوەیە ڕێگا لەو ڕژێمانە بگرین كە سەرپەرشتی تیرۆر دەكەن لەوەی بە چەكی كۆكوژ هەڕەشە لە ئەمریكا و دۆست و هاوپەیمانانمان بكەن. هەندێك لەو ڕژێمانە هەتاكو كاتی هێرشەكانی ١١ی ئەیلوول زۆر بێدەنگ بوون، بەڵام ئێمە سروشتیان دەناسین. كۆریای باكوور ڕژێمێكە كە موشەك و چەكی كۆكوژی هەیە لە كاتێكدا هاووڵاتییەكانی بەدەست برسێتییەوە دەناڵێنن. ئێرانیش لە لای خۆیەوە بە ئامانجی دوژمنكارانە بە دوای وەدەستهێنانی ئەو چەكانەدا دەگەڕێت، و تیرۆریش هەناردەی دەرەوەی خۆی دەكات. ئەمەش لە كاتێكدایە كە ژمارەیەكی كەم لە خەڵكی هەڵنەبژێردراو ئاواتەكانی خەڵكی ئێران بۆ ئازادی سەركوت دەكەن. عێراقیش بەردەوامە لە دژایەتی كردنی ئەمریكا و پشتیوانی كردنی تیرۆر. ڕژێمی ئەو وڵاتە زیاد لە دە ساڵە بەرنامەی بۆ پێشخستنی گازی ئەنتراكس و گازی دەمار و چەكی ناووكی داناوە. هەر ئەو ڕژێمەشە كە پێشتر گازی ژاراویی بەكار هێنا بۆ كوشتنی هەزاران كەس لە دانیشتوانەكانی خۆی، و تێیدا لاشەی دایكەكان لە دیمەنگەلێكی تراجیدیدا كەوتبوون بەسەر لاشەی منداڵەكانیاندا. ڕژێمی عێراق ڕەزامەندی نیشاندا كە پسپۆڕانی چەكی قەدەغەكراو پشكنین لەو وڵاتە ئەنجام بدەن، بەڵام دواتر ئەو پشكێنەرانەی لە وڵات وەدەرنا. بۆیە ئەم ڕژێمە شتێكی هەیە كە دەیەوێت لە جیهانی شارستانی بیشارێتەوە.... من هەر وا تەماشاكەر نابم لە كاتێكدا مەترسی خەریكە وردە وردە لێمان نزیكتر دەبێتەوە. ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ڕیگا بە ترسناكترین ڕژێمی جیهان نادات كە بە مەترسیدارترین چەكی وێرانكەر لە دونیادا هەڕەشەمان لێ بكات.

ئەم بەشەی وتارەكە زیاتر بووە جێگای بایەخی میدیاكاران و لێكۆڵەرەوە سیاسییەكان، هیچ نەبێت بە هۆی بەكارهێنانی زاراوەی "تەوەری شەڕ" وەكو ئاماژەیەك بۆ هەر سێ وڵاتی عێراق و ئێران و كۆریای باكوور. كاتێ سەرۆكی ئەمریكا كە هاوكات فەرماندەی گشتی هێزە چەكدارەكانی ئەو وڵاتەشە، ئەو سێ وڵاتە وەكو بەشێك لە تەوەری شەڕ ناوزەد دەكات، ئەوا خەڵك لە سەرانسەری

جیهاندا بابەتەکە بە جیددی وەردەگرن. ئەڵبەتە حکومەتی ئەو سێ وڵاتە بە توندی رەخنەیان لە وتارەکە گرت و بە ئاشکرا سەرکۆنەی ئەمریکایان کرد لە ڕێگای بەیاننامەی فەرمییەوە کە بێ گومان بۆ دڵنیاکردنەوەی جەماوەری ناوخۆی خۆیان بوو، ئەمەش بۆ هەموو لایەك چاوەڕوان کراو بوو. زاراوەی "تەوەری شەڕ" لە روانگەی سەرۆکەوە تەنها بۆ بە ئامانج گرتنی ئەو دەوڵەتانە نەبوو کە ناحەزی ئەمریکان، بەڵکو چوارچێوەیەکی جوگرافی سادەیشی بۆ جیهان دروست کرد. کاتێ لە وتاری سالانەی ساڵی ٢٠٠٣دا سەرۆك گەڕایەوە سەر ئەم بابەتە، سەدام حوسێن بە تایبەتی وەکو دیکتاتۆرێکی دڕندەی خاوەن مێژوویەکی پڕ لە دەستدرێژیی پێناسە کرابوو. دیارە بەم جۆرەو لە گەڵ بوونی پەیوەندی بە تیرۆرەوە، نەدەکرا دەرفەتی پێ بدرێت کە دەسەلاتی خۆی بەسەر ناوچەیەکی هەستیاردا بسەپێنێت و هەڕەشە لە ئەمریکا بکات.

هەرچەندە ژمارەیەکی کەم لە ولاتان بڕوایان وابوو سەدام حوسێن دڕندە نییە، بەلام ئەو وەسفە هاوتا لە گەڵ چەندین وەسفی تردا گرنگ بوون بۆ زەمینە خۆش کردن بۆ داگیر کردنی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا. ئەڵبەتە بابەتەکانی پەیوەندی نێوان رژێمی سەدام و تیرۆر لە لایەك و بوونی چەکی کۆکوژ لە عێراق لە لایەکی ترەوە، پاڵنەری باش بوون بۆ زۆرێك لە ئەمریکییەکان کە لە بنەڕەتدا پشتیوانیی بڕیارەکەی سەرۆك (بوش) یان دەکرد بۆ ئەنجامدانی کردەی سەربازی لە دژی رژێمی عێراق. هەرچەندە زۆرێك لە پسپۆڕانی ئەمریکای باکوور و شوێنانی تریش لە جیهاندا گومانیان لە بوونی ئەو پەیوەندییانە هەبوو، بەلام رای گشتی ئەمریکا گومانی نەدەخستە سەر راگەیاندنەکانی ئیدارەی ئەو ولاتە، بۆ ئەوەی نەبێتە پاڵپشت بۆ ئەو کەسانەی کە لە ناو خودی ئەمریکا گومانیان لە راستی و دروستی راگەیەندنەکان هەبوو. ئامانجی ئەو نەیارانەش بریتی بوو لە پووچەڵکردنەوەی تۆمەتەکانی ئیدارەی بوش کە بوونە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕی جیهانی دژ بە تیرۆر.... بۆچی؟ یەکێك لە هۆکارەکان ئەوەبوو کە ئەمریکییەکان ئارەزوویان نەبوو گومان بخەنە سەر بڕیاری سەرۆك و هاوکارەکانی لە ئیدارەکەیدا وەکو دیك چینی، چونکە کارێکی لەو جۆرە خاوەنەکەی دەخستە خانەی نا نیشتمانپەروەرەوە. ئەمەش رۆژانی شەڕی ساردی وەبیر خەڵك دەهێنایەوە کە تێیدا میوزیکژەن و ئەکتەر و رۆشنبیرانی وەکو دیکسی چیك و مارتن شین و نوام چۆمسکی بە "نا ئەمریکی" لە قەڵەم دران، تەنها لەبەر ئەوەی هاوڕا نەبوون لەگەڵ بۆچوونی سیاسی ئیدارەی ئەمریکادا.

فاکتەرێکی تری پەیوەندیدار بریتی بوو لە بلاوکراوەو تەلەفزیۆنە حکومییەکان کە بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش پاڵپشتییان لە ئیدارەی بوش دەکرد. دیارە رێژەیەکی زۆریش لە ئەمریکییەکان پشت بە تەلەفزیۆن دەبەستن وەکو سەرچاوەی هەواڵ و زۆربەشیان نە گەشتی دەرەکی زۆریان کردووە و نە

دەستیان بە سەرچاوەی ئەڵتەرناتیڤی میدیایی وەکو رۆژنامەی ئەلکترۆنی دەگات، کە لە پارچەکانی تری ئینگلیزی زمانی جیهان دەردەچن. لەوانەیە زۆر کەس باوەڕ نەکەن کە زیاتر لە ٨٠٪ ی ئەمریکییەکان پاسپۆرتیان نییە،لە کاتێکدا کە زۆرێك لە شارە ئەوروپییەکان و شارەکانی تری جیهان پڕن لە هاووڵاتیی ئەمریکی. هەر بۆیە سەرۆکەکانی ئەمریکا هەمیشە وەسف و زاراوەی جوگرافی سادە بەکار دێنن بۆ ئەوەی جیاوازیی جوگرافی لە نێوان وڵاتی خۆیان و وڵاتانی تردا نیشان بدەن وەکو ئێرانی ئێستا و یەکێتی سۆڤییێتی پێشوو.

وتاری ساڵی ٢٠٠٢ بە تایبەتی زۆر گرنگ بوو، چونکە ئەو بیرۆکەیەی لە مێشکی زۆرێك لە خەڵکدا چەسپاند کە رژێمی سەدام حوسێن لە عێراقدا پەیوەندی بە هێرشەکانی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١ ەوە هەبووە. هەرچەندە هیچ بەڵگەیەکی روونیش نەبوو کە پەیوەندی نێوان ئەو رژێمە لە لایەك و چەکدارە ئیسلامییەکان و تۆڕە تیرۆریستییەکان لە لایەکی ترەوە بسەلمێنێت، بەلاّم زۆرێك لە ئەمریکییەکان بڕوایان بە پەیوەندییە جوگرافییەکە هەبوو، و ئەمەش یارمەتی ئیدارەی ئەمریکای دەدا تا هاووڵاتیەکانی بێنێتە سەر ئەو بڕوایەی کە داگیرکردنی عێراق دەبێتە هەنگاوی چارەنوسسازی دووەم لە شەڕی جیهانیی دژ بە تیرۆر، دوای ئەوەی لە هەنگاوی یەکەمدا کردەیەکی سەربازی لە ئەفغانستان ئەنجام درا. هەرچەندە سەرجەم ئەمریکییەکان بڕوایان بەو وێناکردنەی جیهان نەبوو، بەلاّم ژمارەو رێژەیەکی پێویست لە خەڵك ئامادە بوون کە وتار و کردارەکانی سەرۆکەکەیان قبول بکەن، وەکو ئەوەی بەرنامەکانی رادیۆی نیشتمانی و پەخشە حکومییەکان نیشانیان دەدا.




٢. سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بۆش لەسەر پشتی کەشتی USS ئەبراهام لنکۆڵن لە ٢٠٠٣/٥/١.

لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٤دا زۆرێك لە ئەمریكییەكان نائومێد بوون كاتێ كاندیدی سەرۆكایەتی (جۆن كیری) نەیتوانی ڕێگا لە دووبارە هەڵبژاردنەوەی سەرۆك (جۆرج و. بوش) بگرێت، چونكە ژمارەیەكی باش لە دەنگدەران گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی كە پارتی كۆماری باشتر دەتوانێت ئەمریكا لە هەڕەشەی تیرۆریستان بپارێزێت. ڕۆشنبیریی گشتییش لە لای خۆیەوە بە سوودی دیموكراتەكان نەبوو، لە بەر ئەوەی گەورەترین فیلمەكانی هۆلیوود وەكو : "ڕۆژێكی تر بمرە" (٢٠٠٢) و "وێرانكردنی تەواوكەر" (٢٠٠٢) و "هەندێ لە سەرجەم مەترسییەكان" (٢٠٠١) بە شێوەیەك باسیان لە ئەمریكا دەكرد كە بە جیددی لە ژێر هەڕەشەی گروپێك تیرۆریست و حكومەتدایە كە بە جیهاندا پەخش و بلاّو بوونەتەوە، لە نموونەی كۆریای باكوور و چەند ڕژێمێكی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست. تەنانەت لە یەكێك لەو فیلمانەدا، گەورە سیخوڕی بەریتانی (جەیمس بۆند) لە گەڵ هاوكارە ئەمریكییەكانیدا كاری دەكرد بۆ ڕێگا گرتن لە ئەفسەرێكی پلە بەرزی كۆریای باكوور لەوەی هەردوو ولاّتی كۆریای باشوور و ژاپۆن بە بەكار هێنانی چەكی بەهێز و وێران بكات و لەناویان ببات. لە دوای نیشاندانی "ڕۆژێكی تر بمرە" (٢٠٠٢)، نوێنەرانی ڕژێمی كۆریای باكوور ناڕەزایی توندیان بەرامبەر ئەمریكا دەربڕی، چونكە فیلمەكە چەند كەسایەتییەكی كۆریای باكوری وا نیشان دەدا كە هەڕەشەی وێرانكردنی بەشێكی گەورە لە ڕۆژهەلاّتی ئاسیا دەكەن. نیشاندانی فیلمەكەش لە كاتێكدا بوو كە سەرۆكی ئەمریكا ڕژێمی كۆریای باكووری وەكو بەشێك لە "تەوەری شەڕ" ناوزەد كردبوو. لە سایەی هەوڵە بەردەوامەكانی وەزارەتی ئاسایشی نیشتمانی كە لە ڕێگای بەیاننامەو دەستنیشانكردنی ناوچەكانی مەترسیی و هەڕەشەوە ئەنجامی دەدا،زۆربەی ئەمریكییەكان ئامادە نەبوون لە كاتی ئەو نیگەرانییە گەورەیەدا سەرۆكایەتی ولاّتیان بگۆڕن، جا چ نیگەرانییەكە ڕاست بێت و یان دروستكراو.



٣. جەيمس بۆند لە فیلمی "رۆژێکی تر بمرە" (٢٠٠٢).

بێگومان سەرۆکەکانی ئەمریکا لە رووی بەکارهێنانی چوارچێوەی جوگرافی سادەوە تاك و بێ هاوتا نین. بۆ نموونە کاتێ سەرۆکی ئێران "ئەحمەدی نەژاد" لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٥ روو لە ٤٠٠٠ قوتابی ولاتەکەی گوتی "پێویستە ئیسرائیل لە سەر نەخشە بسڕدرێتەوە"، ئەوە تەنها قسەیەك نەبوو دەربارەی ئارەزووی جیۆپۆلیتیکی ئێران، بەڵکو ئەو ئیدانە کردنەی ئێران بۆ ئیسرائیل و خەونە بەردەوامەکانی لە پێناو داڕشتنەوەی نەخشەی سیاسی رۆژهەلاتی ناوەڕاست، بوون بە هۆی دروستبوونی کاردانەوەیەکی توند و توورە بوونێکی زۆر لە لای ئیسرائیل و هاوپەیمانەکانی وەکو ئەمریکا. بە لای چاودێرانی نێودەوڵەتییەوە بە تایبەتییش هاوسۆزانی دەوڵەتی ئیسرائیل، لێدوانەکە ئەو ئەندێشە جوگرافییانەی تازە کردەوە کە ئیسرائیل روو بە رووی مەترسییەکی راستەقینە بووەتەوە و بە چەند دراوسێیەك دەورە دراوە کە سوورن لە سەر کۆتایی هێنان بە بوونی ئەو ولاتە. بەلام بەلای ئەوانەی سۆزی کەمتریان بۆ ئیسرائیل هەیە بە چەند کەسایەتییەکی ئێرانیشەوە،لێدوانەکەی نەژاد وەکو نیشانەیەکی ئازایەتی جیۆپۆلیتیکی هەژمار دەکرا، چونکە سەرکردەیەکی سیاسی سووربوونی خۆی نیشان داوە بۆ پالپشتی کردن لە فەلەستینییەکان و روو بە روو بوونەوەی ئارەزووە جیۆپۆلیتییەکانی ئیسرائیل لە کەناری رۆژئاوا و باشووری لوبنان، و هەروەها بەربەرەکانێ کردنی خەونی کۆنترۆلکاری ئەمریکا لە ناوچەکەدا.

پەیوەندی نێوان لێدوانی سەرکردە سیاسییەکان و گوێگرەکانیان بەشێکی گرنگی لێکۆڵینەوەکەمانە دەربارەی جیۆپۆلیتیك. من زاراوەی "جیۆپۆلیتیکی گشتی" بەکار دێنم بۆ ئەوەی نیشانی بدەم کە چۆن وێنا کردن و دەربڕینی جوگرافیای سیاسیی جیهان لە ناو کلتوری سیاسیی نیشتمانیدا دەسوڕێتەوە. لێرەدا دوو لایەن هەن کە پێویستە رەچاو بکرێن: یەکەم ئەوەیە کە چۆن ژیانی سیاسی لە گەڵ راگەیاندندا تێکەڵ دەکرێت و دووەمیش جۆرە جیاجیاکانی میدیایە کە بەشدار دەبن لە دروست کردن و بڵاو کردنەوەی وێنەی سیاسەتی جیهانی، جا چ تەلەفزیۆن بێت و یان رادیۆ و ئینتەرنێت.

## پێکهاتەی کتێبەکە

بەشی دووەم باس لەو مێژووە فکرییە دەکات کە هاوتەریبی زاراوەی جیۆپۆلیتیکە. هەرچەندە زۆربەی ئەوانەی کە زاراوەکە لە رۆژنامە و تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت بەکار دەهێنن زانیارییەکی ئەوتۆیان لەسەر مێژووەکەی نییە، بەلاَم بیرو بۆچوونەکانی هاوشانی جیۆپۆلیتیك بە تێبەربوونی کات گۆڕانکاری زۆریان بەسەردا هاتووە و باسکردنی ئەم بوارە هزرییە لە ئەمریکا بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش جیاوازە بە بەراورد لەگەڵ ئەمریکای لاتین و ئەڵمانیا و ژاپۆن. ئەو پەیوەندییەی کە گوایا لە نێوان جیۆپۆلیتیکی ئەڵمانیا و نازییەتدا هەیە،کاریگەری زۆری هەبووە لە دروستبوونی لێکۆڵینەوەکانی دواتر. بۆ نموونە، بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ لە دوای شکستی نازییەکان لە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٤٥،رێژەیەکی زۆر کەم لە پسپۆران لە هەر یەك لە ئەمریکا و یەکێتی سۆڤییێت زاراوەی "جیۆپۆلیتیك"یان بەکار دەهێنا، چونکە لەوە دەترسان کە بە سۆزداری بۆ نازییەکان و ئاواتەکانیان تۆمەتبار بکرێن.

بەشی سێیەم باس لە خاڵی بەیەك گەیشتنی نێوان هەرێمەکان و سەرچاوەکان و داهاتەکان دەکات. بونیاتی باوی جیۆپۆلیتیك بریتیە لە سیستمێکی نێودەوڵەتی کە پەیوەستە بە حکومەتە هەرێمایەتییەکان و مافی تایبەتی وڵاتان لە یاسادانان و سنوورە نێودەوڵەتییەکاندا. بەلاَم هاوسەنگیی جوگرافییش لە لای خۆیەوە خاڵێکی تری گرنگە، چونکە میللەتان و وڵاتەکانیان لە سەر سەرجەم ئاستەکانی نێوخۆیی و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی و جیهانییشدا پێکەوە بەستراون. هەرچەندە سەرچاوە هەرێمایەتییەکانی وەکو یەدەکی نەوت و سەرچاوەکانی ئاو جێگای بایەخن، بەلاَم لە هەمان کاتدا چەندین بابەتی گرنگی تر هەن لە چەشنی هاتوچۆ کردنی خەڵك و بیروبۆچوون و دراو و شت و مەکەکان. ئەو هاتوچۆ کردنانەش کاردانەوەی جیاواز دروست دەکەن، هەر لە پێشوازی لێکردنیان

هەتاکو دەگاتە پشتگوێ خستن و جار بەجاریش بوونی ترس لە بەرامبەریان. بۆ نمونە لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٦، دانیشتوانانی وڵاتی ئۆکرانیا بۆیان دەرکەوت کە وەستانی ئەو غازەی بۆ وڵاتەکەیان دەهات چەند ترسناکە، کاتێك ئەو هەنگاوە بووە هۆی ئەوەی چیتر ماڵەکانیان گەرم نەبێتەوە. ئەمەش لە کاتێکدا روویدا کە وڵاتی روسیا وەکو دابینکەری سەرەکی غازی ئەوروپا، ناردنی غازی راگرت بۆ ئەوەی لەو رێگایەوە کاریگەری و تووڕە بوون و خۆ بە زل زانینی خۆی بەسەر ئەوە وڵاتانەدا نیشان بدات.

هەندێ جار حکومەتەکان و گەلەکان وەکو پێویست سەنگ و گرنگی چەند جموجولێکی تایبەت نازانن. بۆ نموونە، لە ساڵی ٢٠٠٦دا حکومەتی بەریتانیا دانی بەو راستییەدا نا کە نازانێت رێژەی هاتنی پەنابەرە نایاساییەکان بۆ ناو وڵاتەکەی چەندە. لە بەرامبەر ئەمەدا، حکومەتەکان کۆشش بۆ ئەوە دەکەن کە کۆنترۆڵی جموجوڵی حکومەتەکانی تر بکەن. ئەوەبوو لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٦دا هێزی سەربازی ئیسرائیل هێرشی کردە سەر باشووری لوبنان بە مەبەستی لەناو بردنی چەکدارەکانی حزبوڵای ئەو وڵاتە، بەڵام سەرنەکەوت لە تێکدان و ریشەکێش کردنی ئەو چەکدارانە لەبەر ئەوەی بە باشی خۆیان دەشاردەوەو جێگاکانی خۆیان دەگۆڕی.

بەشی چوارەم تایبەتە بە پەیوەندی نێوان جیۆپۆلیتیك و ناسنامەوە. دیارە ئەو خاڵە هەمیشەییەی لەو وێنەو دیمەنانەدا بەدی دەکرێت کە پەیوەستن بە جوگرافیای سیاسەتی جیهانییەوە، بریتییە لە ئاماژە کردن بە "خود" و "ئەوانی تر". کاتێك سەرۆك رۆناڵد ریگان یەکێتی سۆڤییێتی بە "ئیمپراتۆریەتی شەڕ" وەسف کرد، ئەوا لە ناخی ئەودا ئەمریکا بە پێچەوانەی سۆڤێت، هێزی خێر بوو. سەرۆك ریگان وەکو ئەکتەرێکی پێشووی هۆلیوود، زاراوەی "ئیمپراتۆرییەتی خێر"ی بەکار نەهێنا، بەڵام ئەو کەسانەی ئاشنای فیلمەکانی "شەڕی ئەستێرەکان" بوون، دەیانزانی کە ئاماژەکە بۆ ئەوەیە یەکێتی سۆڤییێت بەشێکە لە "لایەنە تاریکەکە". ئەم بابەتە نەك تەنها یارمەتیدەر بوو بۆ ناساندنی مەترسییەکی بەرچاو، بەڵکو ناسنامەی ئەمریکای وەکو هێزی خێر زیاتر پتەو دەکرد. هەروەکو "مایکل ساڤیج"ی پێشکەشکاری بەرنامەی "نەتەوەی دڕندە" لە ساڵی ٢٠٠٠دا بە گوێگرەکانی راگەیاند و وتی: ئێمە لایەنی باشین و ئەوان، واتا عەرەب، لایەنی خراپن. ئەڵبەتە نزیکەی( ٨ ) ملیۆن کەس گوێ لە بەرنامەکەی دەگرن و هەمان بەرنامەش بەسەر زیاتر لە ٣٧٠ ئێزگەی رادیۆدا لە ئەمریکا پەخش دەکرێت.

بە گشتی، ئەم بەها جوگرافییانە هەمیشە روون و بێ تەم و مژ نین. بۆ نموونە، بە لای زۆرێك لە خەڵکەوە یەکێتی سۆڤییێت وەکو هێزێکی رزگارکەر و یوتۆپیایەکی کۆمۆنیستی سەیر دەکرا، و

ئەمریکاش بریتی بوو لە "ئیمپراتۆرییەتی شەڕ". پیاوێکی لوبنانی کە لە ناو چایخانەیەك لە ناوەڕاستی بەیرووت دانیشتبوو، بە منی گوت کە هەمیشە ئەمریکا وەکو "شەیتانی گەورە" هەژمار دەکرێت. ئەم قسەیەی لە تەمووزی ٢٠٠٣ لە چوارچێوەی گفتوگۆی نێوانمان هات دەربارەی فیلمەکانی هۆلیوود و مۆسیقای ئەمریکی کە ئەو زۆر حەزی لێ دەکرد. بێگومان بۆچوونی ئەو پیاوە نەبووە مایەی سەرسوڕمان بۆ من بە تایبەتییش دوای ڕووداوەکانی هاوینی ٢٠٠٦ کە تێیدا شارەکە بە بۆمباو مووشەکەکانی ئیسرائیل وێران کرابوو ( ئەو بۆمباو مووشەکانەی کە خەرجییەکانیان لە ڕێگای هاوکاری دەرەوەی ئەمریکاوە دابین کرابوو).

هەردوو بەشی کۆتاییش تەرخان کراون بۆ چەند لایەنێکی جۆراوجۆر لەو بابەتەی کە بە جیۆپۆلیتیکی گشتی ناوزەدم کردووە. بەشی پێنجەم باس لە ڕۆڵی نەخشە و نەخشەکێشان دەکات. لەوەتای زاراوەکە لە (١٨٩٠ ) ەکانەوە بەکارهێنراوە، نوسەرانی بواری جیۆپۆلیتیك نەخشەکانیان کە بۆ جیهان کێشاویانە، وەکو پێناسەکەر و یان ڕوونکەرەوە پێشکەش کردووە و بایەخی سیاسی و کلتوری ئەو نەخشانەیان ڕەچاو نەکردووە. نەخشە دەتوانێ بایەخی زیاتری ناوچەیەك بە بەراورد لە گەڵ ناوچەیەکی تردا دەربخات و هاوکات دەتوانێت لە ڕێگای سڕینەوەی هەندێ ناوچە و یان لە ڕێگای بەکار هێنانی ڕەنگەکانەوە بە ئەنقەست خوێنەر و بینەر بە هەڵەدا ببات. بۆ نموونە نەخشەکانی ئەڵمانیا لە بیستەکان و سییەکاندا بەردەوام "ناوچە یەهودی نشینەکانی جیهان" ی وەکو گیانداری هەشت پێ نیشان دەدا، لە چوارچێوەی هەوڵەکانیاندا بۆ زیاتر ناشیرین کردنی ناوبانگی ئەو کۆمەڵگا تایبەتییە. هەروەها لە ڕێگای زێدەڕەوی کردن (مبالغە) دەربارەی هێزی جیهانیی یەهود، زەمینەی کولتووری و جوگرافییان خۆش کرد بۆ سیاسەتی لە ناوبردنی یەهوود کە بە ئەنجامدانی هۆلۆکۆست گەیشتە لووتکە. ڕاستە نەخشە تەنها یەك فاکتەر بوو، بەلاّم بووە هۆکارێك بۆ دروستبوونی خەیاڵێکی جوگرافی لە لای هاوولاّتیە ئەڵمانییە ئاساییەکان. هەرچەندە زۆرێك لە ئەڵمانییەکانیش توانییان بەرەنگاری ئەو پڕوپاگەندە نەخشەیی و ئایدۆلۆجییە ببنەوە، بەلاّم لە کۆتاییدا ئەو بەرەنگار بوونەوە نەیتوانی ڕێگا لە دروستبوونی جینۆساید کردنی یەهوود بگرێت کە لە سەر دەستی نازییەکان بە ئەنجام گەیشت.

بەشی کۆتایی درێژە پێدەری لێکۆڵینەوەکانمانە دەربارەی نەخشەکان لە ڕێگای وردبوونەوە لە فیلم و گۆڤارو تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت و ڕادیۆکان، و ڕۆڵیان لە پەخش و بلاّو کردنەوەی وێنە جوگرافییەکان و دەستنیشانکردنی ناوچە و سەرچاوەو ناسنامەکان لەسەر ئەو نەخشانە. بۆ نموونە فیلمی ( The Wag Dog) (١٩٩٧) فیلمێکی کۆمیدی هۆلیوودەو باس لە سەرۆکێکی ئەمریکی دەکات کە

لە سەرو بەندی هەڵمەتی هەڵبژاردنەوەیدا تووشی تەنگژەیەکی سێکسی بووەتەوە. ڕاوێژکارەکانی بێ ئومێد بوون لە دۆزینەوەی سیاسەتێکی تازەی دەرەوە کە کێشەکە لە بیر خەڵك بباتەوە، بۆیە ڕایانگەیاند کە ئەو تەنگژەیە هەڕەشە لە ئاسایشی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات و ئەو وڵاتەی بووەتە هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی ئەمریکا وڵاتی ئەلبانیایە! ئینجا ڕاوێژکارەکان دەرهێنەرێکی بەناوبانگی هۆڵیوودیان بەکار هێنا کە فیلمێکی کورتی دروست کرد . تێیدا کچێك لە گوندێك هەڵدێت، بەڵام بێ ئومێدە لەوەی بتوانێ لە دەست هێرشبەرە ئەلبانییەکان دەرباز بێت. لە گەرمەی ئەم تێکەڵ و پێکەڵییەدا، هێزەکانی ئەمریکا ڕەوانە دەکرێن بۆ چارەسەر کردنی ئەو هەڕەشەیەی کە تیرۆریستە ئەلبانییەکان دروستیان کردووە. بە درێژایی ئەو هەڵمەتە کە کۆشکی سپی سەرپەرشتی دەکرد، ڕای گشتی ئەمریکا وا نیشان درا کە ساویلکەن و بە ئاسانی بەو هەڕەشە دروستکراوە هەڵخەڵەتێنراون.

هەرچەندە ڕەخنەگرانی بواری فیلمسازی زۆر بە خێرایی ئاماژەیان بە پەیوەندی نێوان سەرۆك کلینتون و هەڵە سێکسییەکانی لە لایەك و هێرشە ئاسمانییەکانی ساڵی ١٩٩٩ بۆ سەر وڵاتی سربیا لە لایەکی ترەوە کرد کە هێزەکانی ئەمریکا و ناتۆ بە هاوبەشی ئەنجامیاندا، بەڵام کاریگەریی فیلمەکە زیاتر پەیوەست بوو بە کاردانەوەو ساویلکەیی جەماوەرەوە سەبارەت بەوەی کە وڵاتی ئەلبانیا بووەتە پێگەی ئەو تیرۆریستانەی کە چەکی ئەتۆمییان هەیە!

وەکو وڵاتێکی موسڵمان کە دەکەوێتە گۆشەیەکی ئەوروپاوە، وڵاتانی تری کیشوەرەکە ئەلبانیا وەکو وڵاتێك وەسف دەکەن کە شپرزەو بە تاوان داپۆشراو و ترسێنەرە. ئەوەی جێگای بایەخە ئەوەیە کە دەسەڵاتدارانی سربیا لە هەوڵێکیاندا بۆ شەرمەزار کردنی بڕیارەکەی کلینتون سەبارەت بە هێرش کردنە سەر هێزەکانی سربیا و ژێرخانی ئەو وڵاتە لە کۆسۆفۆ و خودی سربیاش، فیلمەکەیان بۆ جەماوەری وڵاتەکیا پەخش کرد. بەڵام هێزە هاوبەشەکانی ئەمریکا و ناتۆ بۆ ئەوە ڕەوانە کرابوون کە ڕێگا لە هێرشی زیاتری هێزەکانی سربیا بۆ سەر دانیشتووانانی کۆسۆفۆ بگرن کە زۆرینەیان موسڵمانن. لە مانگی ئاداری ١٩٩٩ سەرۆك کلینتون بەم شێوەیە لە ڕێگای تەلەفزیۆنەوە دۆخەکەی بۆ ئەمریکییەکان شی کردەوە:

سەیرێکی نەخشە بکەن.کۆسۆفۆ شوێنێکی بچووکە بەڵام دەکەوێتە سەر هێڵێکی سەرەکی نێوان ئەورروپا و ئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەو شوێنەی ئیسلام و ڕۆژئاواو لقی ئەرسۆدۆکسیی مەسیحییەت بە یەك دەگەن. لە باشوور، هەردوو هاوپەیمانمان، واتا یونان و تورکیا بەدی دەکرێن و هاوپەیمانە تازە دیموکرتیزە بووەکانمان لە ئەوروپای ناوەڕاست دەکەونە باکوورەوە،و لە چواردەوری

کۆسۆفۆ چەند ولاتێکی بچووك هەن کە بەدەست کێشەی ئابووری و سیاسییەوە دەنالێنن،و لەوانەیە لێشاوێکی تازەی پەنابەری کۆسۆفۆ روویان تێ بکات. دیارە هەموو هۆکارەکانی شەڕێکی سەرەکی لەوێدا دەبینرێن: جەورو ستەمی کۆن و خەباتکردن لە پێناو دیموکرسی و لە سەرووشیانەوە بوونی دیکتاتۆرێك لە سربیا کە لەوەتای شەڕی سارد بە کۆتا هاتووە، هیچ شتێکی نەکردووە بێجگە لە دەستپێکردنی شەڕی نوێ و رشتنی نەوت بەسەر ئاگری شەڕی ئەتنی و ئاینی لەو ولاتەدا.

بە هەمان شێوەی سەرۆك روزفلت لە سالی ١٩٤٢ دا، سەرۆك کلینتون داوای لە بینەران دەکرد کە سەیری نەخشە بکەن تا لە جیۆپۆلیتیکی ئالۆزی باشوری رۆژهەلاتی ئەوروپا تێ بگەن. بەلام لە بێ بەختی کلینتون، لەو کاتەدا زۆرێك لە ئەمریکییەکان سەرقالی ئابڕوو چوونەکەی مۆنیکا بوون.

وەکو ئەم پێشەکییە زۆر کورتە نیشانی دەدات، جیۆپۆلیتیك تەنها بابەتێکی ئەکادیمی نییە، بەلکو چالاکییەکە کە شایستەی لێکۆلینەوەی زیاترە، چونکە بەشێکی سەرەکییە لە ژیانی رۆژانە لە ئەمریکا و شوێنانی تری جیهانیش، بۆیە زۆر گرنگە کە لەسەر بنەمای جیۆپۆلیتیك بیر بکەینەوە و هەنگاو هەلبنێین.

# بەشی دووەم

# ژاریکی ئەندێشەیی

## پێشەکی

هەموو وشەکان مێژوو و جوگرافیای خۆیان هەیە و زاراوەی (جیۆپۆلیتیك) یش لەوانە بەدەر نییە. زاراوەکە کە لە ساڵی ١٨٩٩ لە لایەن زانایەکی سیاسی سویدییەوە بە ناوی (رودۆلف کجیلین) داهێنراوە، مێژووەکەی بۆ سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، کە بە تەواوی بە رووداوەکانی شەڕی ئەو سەردەمەوە بەسترابووەوە. (جیرۆید ئۆ تۆسەیل- ٢٠٠٦)

لە ساڵی ١٩٥٤،ریچارد هارتشۆرن زاراوەی (جیۆپۆلیتیك) ی بە ژاری ئەندێشەیی ناوزەد کرد. و بە درێژایی شەڕی جیهانیی دووەمیش لە ئۆفیسی خزمەتگوزاری ستراتیجی کاری دەکرد (کە لە جێگای ئاژانسی هەواڵگری ناوەندیی ئێستادا بوو)، و هاریکار بوو لە دەستەبەرکردنی هەواڵگریی جوگرافی بۆ سوپای ئەمریکا. ئەویش بە هەمان شێوەی شارەزایانی بواری جوگرافی پێش خۆی لە نموونەی ئیسیا باومان، زاراوەی (جیۆپۆلیتیك) ی بەشێوەیەك وەسف کردووە کە لە رووی ئەندێشەییەوە هەڵخەڵەتێنەرو لە رووی ئایدۆلۆجییەوە جێگای گومانە. هەروەها بە بۆچوونی هارتشۆرن، زاراوەکە بەوە لەکەدار بووە کە بە نازییەت و جۆرەکانی تری فاشیزمەوە بەستراوەتەوە وەکو فاشیزمی ئیتاڵی و ژاپۆنی و سیاسەتەکانیان کە بریتی بوون لە جینۆساید و رەگەز پەرستی و فراوان بوون لەسەر حسابی وڵاتان و کۆنترۆڵکردنی شوێن و ناوچەکانی تر. بە رەچاو کردنی ئەم وەسفە نەرێنییە، هیچ جێگای سەرسوڕمان نییە کە بزانین زۆرێك لە شارەزایانی بواری جوگرافی لە ئەمریکا و شوێنانی تر بە یەکێتی سۆڤییێتیشەوە، ئارەزوویان نەبووە خۆیان لە قەرەی ئەم بوارە فیکرییە بدەن. هەر بۆیە لە ماوەی پەنجا ساڵ لە دەستپێکردنیەوە، ئەم زاراوەیە بوەتە جێگای سەرکۆنە کردن لە لایەن گروپێك لە شارەزایانی بواری جوگرافیا و ئەو نوسەرانەی کە بەشدارن لە بڵاوکراوە وەرزییەکانی وەکو "ریدەرز دایجیست" و "لایف" و نیوزویك". لەبەر ئەو هۆکارانەش، ناکرێت بڵێین زاراوەی جیۆپۆلیتیك خاوەن مێژوویەکی رۆشنفکریی پرشنگدارە.

بەڵام با بپرسین کە چۆن زاراوەکە بۆ یەکەم جار رووبەرووی ئەم رەخنە و سەرنجانە بووەوە؟ لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩٣٩دا، گۆڤاری "لایف" بابەتێکی لەسەر زانای جوگرافی ئەڵمانی کارل هوشۆفەر بڵاو کردەوە و تێیدا ئەو زانایەی بە "گۆرۆی جیۆپۆلیتیك" وەسف کرد. (گۆرۆ لە ئاینی هندۆسی بە مانای مامۆستای رۆحی دێت- وەرگێڕ). بابەتەکە دووپاتی کردەوە کە جیۆپۆلیتیك وەکو

جێبەجێ کردنێکی زانستی، نەك تەنها مانایەکی لۆجیکی ستراتیجی بە نازییەت بەخشیوە، بەڵکو بووەتە پەردەیەکی رۆحی درۆینە بۆ سۆشیالیزمی ناسیۆنالی. هەردوو لایەنەکەش گرنگ بوون بۆ دروستبوونی بۆچوونێکی تایبەتی و گشتی دەربارەی ئەم بابەتە. ئیتر لە لایەکەوە جیۆپۆلیتیك وەکو چالاکییەکی هەڵخەڵەتێنەر لە قەڵەم درا کە شایانی سەرنجی جیددیانەی شارەزایان نییە، بەلاّم لە لایەکی ترەوە چاودێرانی سیاسی هێزێکی نائاساییان پێ بەخشی بەمەبەستی بە ستراتیجی کردن و روونکردنەوەی ناوچە و سەرچاوە جیهانییەکان. هەر بۆیە بەکارهێنانی زاراوەی "گۆرۆ" کارێکی سادە نییە، چونکە نازییەت تێکەڵ بە رۆحێکی نائاسایی و مانایەکی شەڕانگێزانەی ئامانجەکان دەکات.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٤١دا، گۆڤاری " ریدەرز دایجیست" خوێنەرانی خۆی لەو راستییە هوشیار کردەوە کە بە لای کەمەوە (١٠٠٠) زانای تر ساز و ئامادەن بۆ ئەوەی پاڵپشتی لە خەونە جوگرافییەکانی هتلەر و گەلی ئەڵمانیا بکەن. فریدریك سۆندێرن لە نوسینەکانیدا لە هەردوو گۆڤاری "ریدەرز دایجیست" و "کەرنت هستۆری" باسی لە رێکخراوێکی نیمچە نهێنی کردووە لە شاری میونخ بە ناوی "پەیمانگای جیۆپۆلیتیك" کە سوور بووە لەسەر پاڵپشتی کردنی پلانەکانی هتلەر بۆ کۆنترۆڵکردنی جیهان. بە پێی ئەم نووسەرە، دۆخەکە زۆر گەرم و ترسناك بووە:

کارەکانی سوپاسالاری پرۆفیسۆر دکتۆر کارل هوشۆفەر و پەیمانگای جیۆپۆلیتیکەکەی لە میونخ و هەروەها (١٠٠٠) زاناو تەکنیککار و سیخوڕ، بوونەتە مایەی نیگەرانییەکی زۆر..... ئەم کەسانە لە لایەن رای گشتیی و تەنانەت رایخی ئەڵمانیاوە ناسراو نین. بەلاّم بۆچوونەکانیان و هێڵکاری و نەخشەو زانیاری و پلانەکانیان هەر لە سەرەتاوە بوونەتە هۆکار و پاڵنەر بۆ جموجوڵەکانی هتلەر.

ئەمە شێوازی ترس و نیگەرانییەکان بوو دەربارەی رێکخراوە نیمچە نهێنییەکە و ئەو هێزە نائاساییەی دەدرایە پاڵ جیۆپۆلیتیکی ئەڵمانی، تا کار گەیشتە ئەوەی سەرۆکی ئەمریکا "رۆزفڵت" داوای زنجیرەیەك لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی بکات لەسەر بابەتەکە. هەرچەندە پسپۆڕەکان کەمتر بڕوایان بە بوونی (١٠٠٠) زانای تەکنیککار لە خزمەتی هتلەردا هەبوو، بەلاّم لەسەر ئەوە کۆك بوون کە جیۆپۆلیتیك هێزێکی زانستیانە دابین دەکات بۆ ئەو کردەوە دوژمنکارییانەی کە پەیوەستن بە ئیدارەی ئەڵمانیاوە، وەکو هەڵمەتەکانی داگیرکاری و کۆکوژیی. هۆکاری زیاتریش بۆ سەرکۆنە کردنی ئەو بەشداریکردنانە ئەوەبوو کە ژمارەیەك لە نووسەرە بەرچاوەکانی وەکو هوشۆفەر پەیوەندی پتەویان لە گەڵ رژێمە نازییەکەدا هەبوو. ئەم پێکدادانەی نێوان ئەکادیمیکاران و حکومەت زۆر گرنگ بوو بۆ بەهێز کردنی ئەو تۆمەتانەی کە ئاراستەی جیۆپۆلیتیك دەکرێن بەوەی کە لە رووی ئایدۆلۆجییەوە مایە پووچە و لە رووی ئەخلاقییشەوە جێگای گومانە.

بە کۆتایی هاتنی شەڕی جیهانیی دووەم، جیۆپۆلیتیك بە شێوەی بەرفراوان کەوتە بەر هێرشی سەرکۆنە کردن و وەکو خزمەتکاری نازییەت هاتە هەژمار کردن. هەروەها نەوەی دوای شەڕ لە زانیان لە دووتوێی بەرهەمەکانیان لە سەر جوگرافیای سیاسی، بڕیاریاندا زاراوەی جیۆپۆلیتیك بە تەواوی لە گفتوگۆکانی خۆیان بسڕنەوە. کاتێکیش زانای جوگرافی "لادیس کریستۆف" ی نیشتەجێی ئەمریکا (باوکی ستوون نوسی رۆژنامەی نیویۆرك تایمز، نیکۆلاس کریستۆف)، هەوڵی دا لە سەرەتای سالآنی شەستەکان زاراوەکە لە ئەمریکا زیندوو بکاتەوە، لە لایەن هاوکارەکانیەوە رەخنەی لیٚ دەگیرا و تەنانەت سەرکۆنەش دەکرا، تەنها لەبەر ئەوەی لە نوسینەکانیدا ئاماژەی بە جیۆپۆلیتیك دەدا.

## رەگ و ریشەی "زانستی" جیۆپۆلیتیك

بۆ ئەوەی لەو مەترسی و هەڵچوونانە تیٚ بگەین کە نوسەرە ئەمریکییەکان لە سالآنی چلەکان و دواتر هەستیان پیٚ دەکرد، پێویستە بە تەواوی رەگ و ریشەی زاراوەی جیۆپۆلیتیك وەکو زاراوەیەکی زانستی هەڵسەنگێنین. ئەم زاراوەیە بە مانای رێگایەکی واقعییانەتر بۆ سیاسەتی نێودەوڵەتی بەکار هاتووە کە بایەحێکی تایبەتی بە رۆڵی ناوچە و سەرچاوەکان دەدات لە دروستبوونی شێوەی ولآتەکان. ئەم "زانستی" جیۆپۆلیتیکەش یاسای بۆ سیاسەتی نێودەوڵەتی داناوە کە لەسەر "راستییەکان"ی جوگرافیای فیزیکیی جیهانی بونیات نراوە ( واتا دەرخستنی کیشوەر و زەریاکان و دابەشکردنی دەوڵەت و ئیمپراتۆرییەتەکان بۆ هێزی دەریایی یان وشکانی). لە سەرەتادا جیۆپۆلیتیکی زانستی لە نێوەندە ئەکادیمی و حکومییەکاندا لە سالآنی (١٨٩٠) ەکان و (١٩٠٠) ەکان زۆر گونجاو بووە، چونکە بریتی بووە لە کاردانەوە بەرامبەر بۆچوونەکانی خودی (رۆدۆلف کجیلین) دەربارەی شێوازو پێکهاتەی یاسایی حکومەتەکان و ململانێکانیان لە گەڵ یەکتردا.

جیۆپۆلیتیك وەکو سیفەتێکی لێکدراو سەرنجی بیرمەندانی راکێشاوە، چونکە ئاماژەیە بە دیاردەیەکی نویٚ و ئامانجەکەشی بریتیە لە لێکۆڵینەوە لەو لایەنانەی کە پێشتر جێگای بایەخی جوگرافیناسانی ولآتان و پێگەیان لە چوارچێوەی سیاسەتی جیهانیدا نەبوون. دواتر کیجیلین بوو بە ئەندامێکی محافەزەکار لە پەرلەمانی سوید و بە بیرو بۆچوونە روونەکانی سەبارەت بە ناسیۆنالیزمی سویدی و پلانەکانی تایبەت بە سیاسەتی دەرەوە ناوبانگی دەرکرد.

لە راستیدا بابەتی نوێیەتی زاراوەکە تا رادەیەك هەڵخەڵەتێنەرە و تەنها بە رادەیەکی کەم ئەوە روون دەکاتەوە کە بۆچی جیۆپۆلیتیك بووەتە زاراوەیەکی سەرنجڕاکێش و بابەتێکی زانستیی چالاك لە سەرانسەری ئەوروپادا. ئایا جیۆپۆلیتیك ریفۆرمێکی ئەکادیمی سەدەی بیستەمە بۆ جۆرە کۆنەکانی

حکومەتداری و گۆشەنیگای حکومیی کە پێشتر لە ڕێگای وەزارەتی دەرەوەو وەزارەتی جەنگەوە نەك لە ڕێگای هۆڵەکانی خوێندنی زانکۆکانەوە لە سەدەکانی ١٨ و١٩جێبەجێ کراون؟

سارا ئۆهارا و مایك هیفەرنان لە لای خۆیانەوە ڕاددەی ئەو بیرۆکانەیان دەرخستووە کە هاوشانی ئەم زاراوە تازەی (جیۆپۆلیتیك) ە پێشبینی کراون، چ لە ڕێگای دۆکیومێنتە حکومییەکان و یان لە ڕێگای بۆچوونە میدیاییەکانەوە بێت. هەرچەندە جیۆپۆلیتیك وەکو وەلامدانەوەیەك بۆ ئەو پرسانە هاتە ئاراوە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٩ دروست بوون، بەلاّم زیاتر ڕەنگدانەوەی کارێکی کۆنترۆڵکراوی ئەکادیمی بوو (لە سەردەمی پێشکەوتنی زانکۆکان لە بەریتانیا و ئەوروپا) کە پێشتر لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەکادیمی بە ئەنجام دەگەیشت.

بەگشتی، سێ فاکتەر ڕۆڵی گەورەیان گێڕا لە چەسپانی جیۆپۆلیتیك وەکو بابەتێکی جیاواز و سەربەخۆ:

یەکەم: هەڵکشانی پرنسیپەکانی ناسیۆنالیزمی ئابووری و پاراستنی بازرگانی،لە کاتێکدا کە حکومەتە ئیمپریالییە ئەوروپییەکانی وەکو بەریتانیا و فەرەنسا بەدەست گۆڕانکاری لە ئابووری جیهان و سروشتی پەیوەندیی هەمەلایەنەی ئەو ئابوورییەوە دەیانناڵاند.لەولاشەوە سەرهەڵدانی ئەمریکا وەکو هێزێکی بازرگانی زیاتر هێزە ئابوورییە ئەوروپییەکانی نیگەران دەکرد.

دووەم: لە ناوەڕاست و کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا هێزە ئیمپریالییەکان بە دوای ناوچەی تازەدا دەگەڕان لە ئەفریقا و شوێنانی تریش. لە کاتێکیشدا کە هەژمونی ئیمپریالی لە زیادبووندا بوو،هێزە سەرەکییە ئەوروپییەکان بە مەبەستنی دەست گەیشتن بە ناوچە تازەکان و کۆنترۆڵکردنیان، دەکەوتنە ململانێ لە گەڵ یەکتردا. ئەوەبوو بەریتانیا و فەرەنسا تووشی ململانێی توند بوون لە باکوری ئەفریقا. لەولاشەوە بەریتانیا و روسیا هەردەم سەرقاڵی پێکدادان لە لایەك و خۆپاراستن لە یەکتر بوون لە لایەکی ترەوە لە سەر ناوچەکانی ناوەڕاستی کیشوەری ئاسیا لە سایەی ناوی خوازراوی "یاری گەورە" کە ململانێی نێوانیانی پەردەپۆش دەکرد. ئیتر گەورە نوسەری بەریتانیایی بواری جیۆپۆلیتیك، (هالفۆرد ماکندەر) سەردەمی تازەی بە "پۆست- کۆلۆمبی" وەسف کرد، بە مانای سەردەمی دۆزینەوەو داگیرکارییەکانی ئەوروپا لە دوای دابەزینی کریستۆفەر کۆلۆمبەس لە کەنارەکانی ئەمریکا لە (١٤٩٠) ەکاندا. لە ئەنجامیشدا ولاّتانی وەکو بەریتانیا و ئەڵمانیا دەستیان دایە خۆ پڕچەك کردن، ئەمەش مەترسی ئەوەی دروست کرد کە ململانێ سەربازییەکان خودی ئەوروپا بگرنەوە لە جێگای ئەوەی تەنها لە سەر ئەو خاکانە بن کە دوور لە ئەوروپا داگیریان کردووە.

سێیەم: گەشەسەندنی زانکۆکان و پەیدابوونی جوگرافیا وەکو کایەیەکی ئەکادیمی، دەرفەتی زیاتری بۆ پسپۆران خولقاند تا بابەتەکە بلێنەوەو لێکۆلێنەوەی لەسەر ئەنجام بدەن.

رۆڵی ئەمریکاش لە رووی کاریگەریی ئابووری و جیۆپۆلیتیکیەوە، ئەم جۆرە شیکردنەوە سەرەتایە جیۆپۆلیتیکییانەی بۆ ئەوروپا و پێگە دەرەکییەکانی ئالۆزتر کرد. چاودێرانی هاوچەرخی وەکو "فریدریك جاکسۆن تێرنەر" بڕوایان وابوو لەو کاتەی کە پەل هاویشتن و فراوانبوونەکانی ئەوروپا گەیشتبووە لووتکە، سنوورەکانی ئەمریکا لە پرۆسەی داخراندا بوون. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٨٩٠ و لە دوای کڕینی ئەلئەسکا لە روسیا لە (١٨٦٠) ەکاندا،ئیمپراتۆرییەتی ئەمریکا باڵی کێشا بەسەر کوبا و فیلیپین و پۆرتۆریکۆدا. هەر بۆیە لە دووتوێی کتێبێکیدا بە ناوی "کاریگەریی هێزی دەریایی لە مێژوودا ١٦٦٠- ١٧٨٣ " (١٨٩٨)، ئەدمیراڵ تۆماس ماهان هەندێك ئامۆژگاریی پێشکەش بە ئیدارەی ئەو کاتەی تیۆدۆر رۆزفلت کرد. بە حوکمی پۆستەکەشی وەکو سەرۆکی کۆلیجی شەڕی دەریایی، ماهان لە دۆخێکی گونجاودا بوو بۆ بەشداری کردن لە پلان و ستراتیجییەتی ئەمریکا لەو سەردەمەدا. بە رەچاو کردنی ململانێی دەریایی نێوان فەرەنسا و بەریتانیاش لە سەدەکانی (١٧ و ١٨) دا، ماهان گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دروستکردنی هێزی دەریایی تاکە رێگای زۆر گرنگە بۆ دەستنیشانکردنی هێزی جیۆپۆلیتیکی هەر نەتەوەو وڵاتێك. بە بۆچوونی ماهان، هێزی دەریایی "دەستە خوشکی فراوان بوون"ە و وڵاتێکی وەکو ئەمریکا کە پلانی پەلهاویشتن و فراوانبوونی لە جیهاندا هەیە، پێویستی بەو هێزە دەبێت، نەك تەنها بۆ نیشاندانی هێزی خۆی لە زەریای ئەتڵەسی و ئۆقیانووسی ئارام، بەڵکو بۆ رێگا گرتن لە رکابەرەکانی و شکست پێ هێنانیان. ماهان بڕوای وابوو هەڕەشەی سەرەکیی بریتیە لە هەردوو ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانیا و روسیا و خواستە دەریاییەکانیان. دواتر نوسینەکانی وەرگێڕدران و بە دڵ گەرمییەوە لە ئەڵمانیا دەخوێنرانەوە و رۆڵێشیان هەبوو لە دروستبوونی هزری جیۆپۆلیتیکی لە ئەڵمانیا لە ساڵانی بیستەکان و سییەکاندا.

بە هەر حاڵ، لە سەرەتادا نوسینەکانی کجیلین سەرنجی پسپۆرە ئەڵمانییەکانی راکێشا تا پەیوەندیی نێوان سیاسەت و جوگرافیا لە سەر چەندین ئاستی جۆراوجۆری جوگرافی بە وردی دەربخەن. بەشێك لەم بەرەوپێش چوونەی بیرۆکەکانیش بۆ نزیکی جوگرافی و ئاڵوگۆڕ کردنی بۆچوونەکان لە نێوان شارەزا ئەڵمانی و ئیسکەندنافییەکان دەگەڕێتەوە. پسۆرە ئەڵمانییەکانیش، وەکو کیجیلین، بایەخیان بە پێناسە کردنی چەمکی دەوڵەت دەدا، بە پێی پێداویستیی هەرێمایەتی و سەرچاوەییەکان. ململانێی وڵاتان و دانیشتووانیش لە سەر بنەمای جۆرە جیاجیاکانی داریۆنیزمی کۆمەڵایەتی دووپات دەکرانەوە، چونکە دۆخەکە پێویستی بە زامنکردنی بوونی "گونجاوترین"

میللەت و وڵات دەکرد. بە بۆچوونی (فریدریك راتزیڵ) ی پرۆفیسۆری جوگرافیا لە زانکۆی لیپزیك، پێویستە چەمکی وڵات وەکو رێکخراوێکی باڵا دابڕێژرێت کە لە جیهانێکی پڕ لە ململانێ و ناجێگیریدا بوونی هەیە. راتزیڵ کە مەشقکاری زانستە سروشتییەکانە و شارەزایە لە کلتوری پسپۆڕیی وابەستە بە چارلس داروین و جان بابتیست دو لامارك، بڕوای وابوو کە وڵات بریتیە لە هێزێکی جوگرافی کە بە چواردەوری سروشتیدا رۆ چووەو رەگی کوتاوە. بۆ ئەوەی وڵاتانیش بمێننەوەو گەشە بکەن لەو جۆرە کەش و هەوایەدا، پێویستییان بە ناوچە و سەرچاوە سروشتییەکان دەبێت.

لە کتێبێکیدا بە ناوی "دەریا وەکو سەرچاوەی گرنگیی میللەتێك" (١٩٠١)، راتزیڵ هەردوو چەمکی زەوی و دەریای بەوە پێناسە کردووە کە دەرفەت و رێڕەوی فیزیکی دەخوڵقێنن بۆ بەربڵاوبوونی ناوچەیی کە لە ئەنجامدا بەهێزبوونی دەوڵەتی لێ دەکەوێتەوە. دەوڵەتی بەهێز و سەرکەوتوویش بە دەسەڵات و سنوورەکانی خۆی رازی نابێت، بەڵکو هەوڵ دەدات بۆ فراوانکردنی سنوورەکانی و زامنکردنی رووبەرێکی زیندوو و چالاك. لە هەمان کاتدا وڵاتە رکابەرەکانیشی هەمان هەوڵ دەدەن، بۆیە بە بۆچوونی راتزیڵ، هەر وڵاتێك کە هەوڵ بۆ بەرفراوان بوون بدات، ئەوا بەردەوام دەکەوێتە ناو بازنەیەکی هەمیشەیی لە گەشەکردن یان پووکانەوە. دیارە گەڕان بە دوای ناوچەی چالاکدا هەردەم یاسایەکی بنچینەیی و نەگۆڕی جیۆپۆلیتیکی بووە. راتزیڵ لە لای خۆیەوە پشتیوانێکی سەرسەختی دروستبوونی ئیمپراتۆرییەتێك و هێزێکی دەریایی بەهێز بوو بۆ ئەڵمانیا کە بتوانێ بەرژەوەندییە دەرەکییەکانی ئەو وڵاتە بپارێزێت.

هەروەها بە لای زۆرێك لە نوسەرانی تریشەوە هەڵکەوتەی جوگرافی ئەڵمانیا و ئەزموونە مێژووییەکەی لە ناوەڕاستی ئەوروپادا هەم خێرو بەرەکەت و هەم لەعنەت و بێ بەختیی بوو، چونکە توانای ئەوەی هەبوو باڵا دەستی خۆی بەسەر کیشوەری ئەوروپادا نیشان بدات، بەڵام لە هەمان کاتدا بوو بە قوربانی نەهامەتی و لەدەستدانی هەندێك لە ناوچەکان کە پێشتر لە ژێر کۆنترۆڵیدا بوون.

وەکو ئەوەی مارتن کۆرینمان لە ساڵی ١٩٩٠ تێبینی کرد، ئەڵمانیا زەوی جوگرافیناسانە بێجگە لە بوونی ژمارەیەك لە سەرەتایترین فاکەڵتییەکانی زانکۆ کە تایبەتمەندن بە فێرکردنی بابەتی جوگرافیا. لە سەروبەندی شەڕی یەکەمی گێتیشدا،جوگرافیناسانی ئەڵمانی وەکو نۆمان و پارتچ بیرۆکەی هاوپەیمانی ئەڵمانیایان لە گەڵ ئیمپراتۆرییەتی نەمسا- هەنگاریا پێشنیار کرد، و هەروەها داوای دروستبوونی هێزێکی دەریایی بەهێزیان دەکرد بەمەبەستی فراوانکردنی ئامانجە بازرگانیەکان و ناوچەکانی ژێر سەرپەرشتی ئەڵمانیا. بەڵام شکستەکەی ساڵی ١٩١٨ نیشانیدا کە بەدی هاتنی ئەو خەونانە لە ئایندەیەکی نزیکدا کارێکی مەحاڵە. کۆنفرانسی ئاشتی ساڵی ١٩١٩ و یەکلا کردنەوەی

بالاْدەستیی دارایی و ناوچەیی کە لە چوارچێوەی پەیماننامەی ڤێرسای دەرکەوتن، تۆوی رق و کینەی زیاتریان لە دڵی ئەڵمانییەکاندا چاند. کاتێك لە گەرمەی شەڕەکەشدا بۆچوونەکانی راتزیلْ زیندوو کرانەوە، جوگرافیناسانی فەرەنسا لە وێنەی "پۆلْ ڤیدالْ دو لا بلاچ" لەوە نیگەران بوون کە لەوانەیە ئەو بۆچوونانە دەربارەی بوونی ولاْت وەکو رێکخراوێکی بالاْ، ببنە پاساو بۆ زیندوو کردنەوەی ئەڵمانیا کە لە دواییدا هەولْ بدات تۆڵەی لەدەست دانی ناوچەکانی بالاْدەستی و پەرتەوازەکردنی لە رووی ئەتنییەوە بکاتەوە.

لە شوێنەکانی تری ئەوروپاشدا، جوگرافیناسان و کاربەدەستانی سەربازی سەرقالْی بیرۆکەی جیۆپۆلیتیك بوون و ئەو بیرۆکەیەیان دەبەستەوە بە گفتوگۆی فراوانتر دەربارەی بابەتی گەورەی وەکو داگیرکاری (استعمار) و زیندوو بوونەوەی هەستی نەتەوایەتی و پەیامی ئیمپریالی. بۆ نموونە لە ولاْتی پورتوگال، دەرکەوتنی رژێمی( سالازار) لە سەرەتای سالاْنی سییەکاندا، بووە هۆی دروستبوونی رایەکی جەماوەری و گفتوگۆیەکی زۆر دەربارەی ئەرکی پورتوگال لە بەرامبەر ئەولاْتانەی تر کە دانیشتووانەکانیان بە زمانی پورتوگالی قسە دەکەن.

لە ولاْتی ئیتالْیاش، گۆڤاری (جیۆپۆلیتیکا) بۆ ئەوە دامەزرا تا ئاسانکاری بۆ گفتوگۆ کردنی زیاتر دەربارەی ئامانجە جیۆپۆلیتیکییەکانی ئیتالْیا لە ئەفریقا و ناوچەی دەریای سپی ناوەڕاست بکات. لە هەردوو ولاْتیشدا نەخشەی نوێ خرایە نێو پرۆگرامەکانی خوێندن و دیواربەندە گشتییەکانیش بە مەبەستی ئاشنا کردنی هاوولاْتیان بە خەونە جوگرافییەکانی ئەو دوو ولاْتە.

لە ولاْتی ئیسپانیاش،مشت و مڕی جیۆپۆلیتیکی زیاتر لەسەر ئامانجە کۆلۆنیالییەکانی ئیسپانیا لە باکوری ئەفریقا چڕ ببوەوە، و حکومەتیش لە ئەگەری بەکار هێنانی هێزی سەربازی بۆ بەدی هێنانی ئەو خەونانە نیگەران بوو.

بەلاْم بە پێچەوانەی ئەڵمانیا، بایەخە جیۆپۆلیتیکییەکانی "ئیبیریا" بە پلەی یەکەم لەسەر ناوچەکانی ژێر بالاْدەستی خۆیان بوو تا ئەوەی هەولْ بدەن بۆ دووبارە نەخشە کێشانەوەی سیاسیی ئەوروپا. (ئیبیریا بەو نیمچە دوورگەیە دەوترێت کە هەردوو ولاْتی ئیسپانیا و پورتوگال بەخۆوە دەگرێت- وەرگێڕ) لە ئەنجامی مەترسییەکانیش لە زیندوو بوونەوەی ئەڵمانیا وەکو هێزێکی سەربازی، نوسەری جیۆپۆلیتیکی بەریتانی "ماکندەر" بیرۆکەی هاوپەیمانی ناوچەی زەریای لەگەلْ ئەمریکا خستە روو، بەمەبەستی رووبەڕوو بوونەوەی ئەگەری هەر هاوپەیمانێتییەك لە نێوان ئەڵمانیا و یەکێتی سۆڤییێتی تازەدا. هەرچەندە ئەم بیرۆکەیە لە سالْی ١٩٢٤ هاتە ئاراوە، بەلاْم وەکو یەکێك لە کۆنترین پێشنیارەکانی تایبەت بە هاوپەیمانی ستراتیجی دادەنرێت کە دواتر لە شێوەی رێکخراوی پەیمانی

باكوری ئەتلەسی لە نیسانی ساڵی ١٩٤٩ چووە بواری جێبەجێ کردنەوە. لەگەڵ ئەوەی لـە سـەردەمی جەنگی سارد لە کۆتاییەکانی چلەکاندا ئەڵمانیای رۆژئاوا هاوپەیمانێکی گرنگـی ئـەمریکا و بـەریتانیا بوو، بەلاّم لێکدانەوە جیۆپۆلیتیکییەکانی ئەڵمانیا لەو سەردەمەدا زیاتر لە بواری هەژموونی کلتـوری ئەڵمانیا و گەشەکردنی ناوچەیی ئەو وڵاتەدا چڕ ببونەوە.

## جیۆپۆلیتیك و نازییەت

دیارە ئەو لایەنەی مێژووی جیۆپۆلیتیك کە زۆرترین مشت و مڕی لە سەدەی بیسـتەمدا نایـەوە، بریتی بوو لە گومانی ئەوەی کە ئـەم زاراوەیـە بەسـترابێتەوە بـە نازییـەت و پلانـەکانی هیتلـەر بـۆ کۆنترۆڵکردنی جیهان. بیرۆکەی وڵاتێك لە شێوەی "سیستمێکی باڵا" و گەڕان بـە "شـوێنی ژیـان"دا کە ئەڵمانیا وروژاندی، رێگرییەکی ترسناکی بۆ بیرۆکەکانی تایبـەت بـە جیۆپۆلیتیـك لـە سـەردەمی نێوان هەردوو جەنگدا دروست کرد. ئەڵبەتـە چـەمکی وڵات وەکـو سیسـتمی سیاسـی بـە ئامـانجی بایەخدانی زیاتر بوو بە بەرژەوەندیی نیشتمانیی لـە سـایەی کـەش و هەوایـەکی فـرە ململانێـدا کـە چـەندین وڵاتـی چاوچـنۆك بـەخۆوە دەگرێـت. لـە دۆخێکـی لـەم جۆرەشـدا، پارێزگـاری کـردن لـە سیستماتیکی بوونی دەوڵەت دەبێتە کارێکی جیـددی و هـەر کەسـێك یـان هـەر شـتێك کـە ببێتـە هەڕەشە بۆ سەر یەکگرتوویی وڵات،پێویستە بە توندی وەلاّم بدرێتـەوە. لەبـەر ئـەوە، لەسـەر ئاسـتی ناوخۆییش پێویستە ئەوانەی کۆنترۆڵی دەوڵەت دەکەن زۆر وریا و ئاگـادار بـن. بـەلاّم لەسـەر ئاسـتی دەرەکی، دەوترێت کە تەندروستیی وڵات پەیوەستە بە وەدەستهێنانی ناوچە و سەرچاوەی دەوڵەمەنـدی زیاترەوە. دیارە ئەم جۆرە بیرکردنەوەش پێویستی بە هێزێکی سەربازی تۆکمە و ئامادە دەبێت کە لـە کاتی پێویستدا کردەی سەربازی بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە دەرەکییەکان ئەنجام بدات.( ئـەم بیرۆکەیـە بە تایبەتی لە شوێنەکانی تری جیهان برەوی پەیدا کرد وەکو رژێمە سەربازییەکانی ئەمریکای لاتینـی لە دوای ساڵی ١٩٤٥ ) . هاوکات بیرۆکەکە جۆرە نامۆییـەکی بەرهـەم هێنا،چـونکە تۆمـەتی ئـەوە دەرایە پاڵ خاوەنی ئەو بیرۆکانە گوایا باسی چەند راستییەکی جوگرافی دەکـەن کـە لەسـەر گۆڕەپـانی سیاسی و کۆمەلاّیەتی چیتر بوونیان نەماوە.

چاودێران لەو بڕوایەدا بوون کە نازییەکانی وەکو ئەدۆڵف هـێس و بگـرە "ئـەدۆڵف هتلـەر" یـش بۆچوون و گۆشەنیگا جیۆپۆلیتیکییەکانیان بەکار هێناوە بۆ ناسـاندن و شـەرعییەتدان بـە هەڵوێسـتە فراوانخوازییەکانی ئەڵمانیا لە سییەکان و چلەکاندا لەسەر حسابی خوێنی کەمینە ئەتنییەکانی ناو ئـەو وڵاتە (دیارترینیان یەهودییەکان بوون)، و هەروەها لەسەر حسابی دراوسێ نزیکەکانی وەکو پۆڵەنـدا و

چیکۆسلۆڤاکیا. ئەم هاوتابوونەی نێوان جیۆپۆلیتك و نازییەت هەمیشە جێگای گفتوگۆیە و تا رادەیەکیش بووەتە هۆی تاوانبارکردنی خودی زاراوەکە بە هۆی ئەو هاوتابوونە گومان لێکراوەوە. ئەڵبەتە چەمکی "هاوتابوون" لێرەدا گرنگە چونکە ئاماژە بە دوو جۆر لە پەیوەندی دەکات، یەکەمیان پەیوەندیی هزرییە و ئەوی تریان کە لە یەکەم گرنگترە، بریتییە لە پەیوەندیی تاکە کەسی لە نێوان چەند جوگرافیناسێکی بەرچاو و ژمارەیەك لە نازییە باڵادەستەکان.

نوسینەکان و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی تایبەت بە پرۆفیسۆر کارل هوشۆفەر، لە سەرووی لیستی ئەو لایەنانە دێن کە ئاماژە بەو تۆمەتبارکردنە دەکەن سەبارەت بە پەیوەندیی هزری و سیاسی نێوان جیۆپۆلیتیك و نازییەت، هوشۆفەر کە لە ساڵی ١٨٦٩ لە دایك بووە، چووەتە ریزی سوپا و لە ساڵی ١٩١٩ بە پلەی سوپاسالار خانەنشین کراوە. لە کاتی خزمەتی سەربازییدا رەوانەی ژاپۆن کراوە تا لێکۆڵینەوە لەسەر هێزی سەربازی ئەو وڵاتە بکات و لە کاتی ئەرکەکەیدا لە ژاپۆن (١٩٠٨-١٩١٠) فێری زمانی ئەو وڵاتە بووەو ئارەزووی زۆریشی چووەتە سەر کلتورەکەی. ئەم کارلێکە هاوبەشەی لە گەڵ جوگرافیناسان و ئەفسەرە ژاپۆنییەکاندا زۆر گرنگ بووە لە ئاسانکاری کردن بۆ دەرکەوتنی چەند پەیمانگایەکی جیۆپۆلیتیکی ژاپۆنی وەکو کۆمەڵەی جیۆپۆلیتیکی ژاپۆن و سکوڵی جیۆپۆلیتیك لە زانکۆی تۆکیۆ. هەروەها لە ئەمریکای باشوریش، کە تێیدا نوسینەکانی وەرگێڕدراون بۆ سەر زمانەکانی ئیسپانی و پورتوگالی و بە شێوەی بەربلاو لە لایەن هێزە سەربازییەکانی وڵاتانی وەکو ئەرژەنتین و بەرازیل و چیلی بەکار هێنراون.

لە دوای خانەنشین بوونیشی لە سوپا، هوشۆفەر بووە پرۆفیسۆری جوگرافیا لە زانکۆی میونخ و دەستی کرد بە پەخش و بلاۆ کردنەوەی گۆڤاری جیۆپۆلیتیك لە ناوەڕاستی ساڵانی بیستەکاندا. هوشۆفەریش وەکو "راتزیل" بڕوای وابووە کە مانەوەی ئەڵمانیا وابەستەیە بە هەڵسەنگاندنێکی ژیرانە بۆ راستییە جوگرافییەکان لە سیاسەتی جیهانیدا. بە بۆچوونی هوشۆفەر،بۆ ئەوەی وڵاتێك بمێنێتەوە پێشیش بکەوێت، مسۆگەر کردنی "شوێنێکی ژیان" بەتایبەتی لە رۆژهەڵات زۆر پێویستە و دەکرێت ئەو شوێن پێیە بە هاوکاری هاوپەیمانە گرنگەکانی وەکو ئیتاڵیا و ژاپۆن وەدەست بێت. لەم چوار١یۆەیەشدا هەماهەنگی کردن لە گەڵ یەکێتی سۆڤییێت، ئەگەر کورت مەودا یان نیمچە مەوداش بوویێت، کارێکی ژیرانە بوو، چونکە یارمەتی هەردوو وڵاتی دەدا بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆیان لە گۆڕەپانی بەرفراوانی ئۆراسیادا. بە بڕوای هوشۆفەر، بۆ ئەوەی ئەڵمانیاش گەشە بکات، پێویست بوو سەرکردەکانی بە وردی رەچاوی پێنج بنەمای سەرەکی بکەن کە سەنگی مەحەکن لە پلانی هەر وڵاتێك بۆ ئەوەی ببێتە هێزێکی جیهانی. بنەماکانیش بریتین لە: هەڵکەوتەی فیزیکی، سەرچاوەکان،

ناوچە و هەرێمەکان، لێکۆڵینەوەی جوگرافی و دانیشتووان. ئەگەر ئەڵمانیا نیازی هەبوو لە وڵاتێکی وابەستە بە رووبەرێکەوە ببێتە وڵاتێك کە چاوی لە رووبەری زیاتر لە زەوی بێت، ئەوا پێویست بوو رەچاوی توانای خۆی بکات لە رووی سەرچاوەو هەرێمایەتییەوە و لەسەر ئەو بنەمایانە هەنگاو هەڵگرێت.

هوشۆفەر هەروەها بیرۆکەی تیۆری "ناوچە گشتگیرەکان" ی هێنایە ئاراوە کە وای دادەنێت پێویستە ئەڵمانیاو وڵاتە بەهێزەکانی تری وەکو ژاپۆن پاڵپشتیی ئابوری و جوگرافی خۆیان بە شێوەیەك پەرە پێ بدەن کە دوور بێت لە رۆچوون بەناو یەکتردا. بۆ ئەوەی ئەڵمانیاش بتوانێ کۆنترۆڵی بەشێك لە خاکی بەرفراوانی ئۆراسیا بکات، پێویستی بە هەماهەنگی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتدا هەبوو، وەکو ئەو شێوازەی لەگەڵ بەرازیلدا پەیڕەو دەکرا کە وا دانرابوو کۆنترۆڵی ئەفریقای کردووە. سەرەکیترین بۆچوونە جوگرافییەکانی هوشۆفەر بە ئاراستەی رۆژهەڵات بوون، و ناوبراو یەکێك بوو لە پشتیوانە دڵگەرمەکانی پلانی هێڵی ئاسنینی بەرلین- بەغدا کە یارمەتی سەپاندنی رۆڵی ئەڵمانیای دەدا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای ناوەڕاست. ئەگەر پلانەکە سەرکەوتوو بوایە، ئەوا دەبووە ئاسانکارییەکی باش بۆ گەیشتن بە سەرچاوەکانی نەوت و هۆکارێکیش بۆ دروستبوونی نائارامیی لە رێگای بازرگانی بەرەو ئاسیا و بە پێچەوانەوە وەکو ئەوەی بەریتانیا مەترسی لێ دەکرد. هەرچەندە کۆنفرانسی ئاشتی لە ساڵی ١٩١٩ کۆتایی بەو خەونانەی ئەڵمانیا هێنا، بەڵام بۆچوونەکانی هوشۆفەر سەبارەت بە "ناوچە گشتگیرەکان" هەم ببونە جێگای رەزامەندی ناسیۆنالیستە تەقلیدییەکان کە هەمیشە چاویان لە رۆژهەڵات بوو، و هەم ئەو پیشەگەرانەش پێی قایل بوون کە بە پەرۆش بوون بۆ سوود وەرگرتن لە کەرەستەی خاو لە ناوچەکانی ژێر کۆلۆنیالی ئەڵمانیا لە دەرەوەی ئەوروپا.

هەرچەندە بیرۆکەکانی هوشۆفەر وەکو بنەمای فکری بۆ پرۆژە فراوانخوازییەکانی هتلەر و تونداوتیژیيە جینۆساید- هێنەرەکانی هەژمار دەکران، بەڵام چاودێران (بە تایبەتی چاودێرانی ئەمریکی لە چلەکاندا) بڕوایان وابوو کە ئەو بۆچوونانە جێگای بایەخن، بەهۆی دۆستایەتی هوشۆفەر لە گەڵ ئەدۆڵف هێسدا و هەروەها بە هۆی بەشداربوونی چڕو پڕی لە گفتوگۆکانی نێوان ئەڵمانیا و ژاپۆن لە سییەکان و چلەکاندا. ئەدۆڵف هێس بەر لە دامەزراندنی وەکو سکرتێری تایبەتی هتلەر و دواتریش وەکو جێگری لە پارتی نازیدا، قوتابی هوشۆفەر بووە لە زانکۆی میونخ. هتلەر لە کتێبەکەیدا بە ناوی "خەباتی من" ئاماژە بە چەند زاراوەیەك دەکات وەکو "ناوچەی ژیان" بۆ پشتگیری کردنی بۆچوونەکانی سەبارەت بەوەی کە پێویستە ئەڵمانیا رێککەوتنی ڤێرسای ساڵی ١٩١٩ پێچەوانە بکاتەوە و بەدوای ناوچەی جوگرافی تازە لە ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی ئەوروپادا بگەڕێت.

بەلاّم جیاوازی ئاشكراو جیددی لە نێوان ئەو دوو كەسایەتییەدا هەبوو، چونكە بە پێچەوانەی هوشۆفەر كە زیاتر باسی لە پەیوەندییە هەرێمایەتییەكان و حكومەتی ئۆرگانیك دەكرد، هتلەر تەركیزی زیاتری خستبووە سەر رۆڵی جەماوەر (كە بە بۆچوونی ئەو بە مانای نەژادی ئاری دێت) لە ئاراستە كردنی رەوتی مێژوو و جوگرافیا. بە واتایەكی تر، سەرقاڵبوونی هتلەر بە بابەتی نەژاد و رقی ئەستووری لە جووەكانی ئەڵمانیا و ئەوروپا بە هیچ شێوەیەك لە نوسینەكانی هوشۆفەردا جێگایان نەدەبووەوە. ئەگەر خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا هەبوبێت، ئەوا تەنها بڕوای هاوبەشیان بوو بەوەی حكومەتی ئەڵمانیا "سیستمێكی باڵا" یە كە پێویستی بە "ناوچەی ژیان" و دەروازەی هەرێمایەتی وابەستە لە جیهاندا هەیە. سەرەڕای پەیوەندی هوشۆفەر لە گەڵ بەرپرسانی نازیدا، بەلاّم لە كۆتاییەكانی سییەكان و سەرەتای چلەكاندا، كاریگەری نوسینەكانی رووی لە كزیی كرد. ئەو وەكو نازییەكان بڕوای بەوە نەبوو كە دەستەیەكی نێودەوڵەتی لە كۆمۆنیست و جو هەبێت و پلان بۆ كۆنترۆڵكردنی جیهان دابنێن. هەروەها ئارەزووەكانی هتلەریشی سەبارەت بە پووچەڵكردنەوەی كاریگەریی جووەكانی ئەڵمانیا لەسەر خۆشگوزەرانی نیشتمانی و تەنانەت خودی دەوڵەتی ئەڵمانیاشی بەلاوە پەسەند نەبوو.

لە ساڵانی ١٩٤١ و ١٩٤٢ بیرمەندە پەناهندە ئەڵمانییەكانی وەكو هانز ویگەرت و ئەندریاس دۆرپالێن و ئەندرۆ جیۆرجی و رۆبەرت شتراوس هیوپ ئەوەیان لە هزری ئەمریكییەكاندا چاند كە جیۆپۆلیتیكی ئەڵمانی هاوبەش بووە لەگەڵ نازییەكان لە تاوانەكاندا. لەبەر ئەوەی هوشۆفەریش بەوە تۆمەتبار كرابوو كە عەقڵی شەڕانگێزی پشتەوەی مەترسی نازییەكانە، بۆیە وەكو ئاماژەی پێ كرا، پێگە و كاریگەریی ئەو بیرمەندە رووی لە كز بوون و لەناوچوون دەكرد. هەروەها بڕوای وابوو كە هەڵمەتی ئەڵمانیا بۆ داگیركردنی یەكێتی سۆڤیێت لە ساڵی ١٩٤١ لە رووی ستراتیجییەوە بە ئاراستەی هەڵەدا چووە و دۆستایەتیە توندو تۆڵەكەشی لەگەڵ "ئەدۆڵف هێس" دا زیاتر ئاشكرا بوو، كاتێ دەركەوت كە هێس لە هەمان ساڵدا بە نهێنیی سەردانی ئیسكوتلەندای كردبوو بەمەبەستی بەدی هێنانی ئاشتی لەگەڵ بەریتانیا. هەرچەندە ئامانجی راستەقینەی ئەركەكەی هێس هەر بە شاراوەیی مایەوە، بەلاّم بە خاڵی وەرچەرخان دادەنرێت لەو كاریگەرییەی گوایا بیرمەندانی جیۆپۆلیتیكی ئەڵمانیا لەسەر هتلەر و هاوكارەكانی دروستیان كردبوو.

هوشۆفەر لە ساڵی ١٩٤٦دا خۆی كوشت دوای ئەوەی لە مانگی نیسانی ١٩٤٥ دا هەواڵی لە سێدارەدانی كوڕەكەی بەناوی "ئەلبریخت" پێ گەیشت بەهۆی بەشداری كردنی لە پلانی كوشتنی هتلەر لە تەمووزی ١٩٤٤دا. تەنها كەسێكیش كە گفتوگۆی لەگەڵ هوشۆفەر كردبێت دەربارەی

بۆچوونە جیۆپۆلیتیکییەکان، قەشەی یەسوعی ئەمریکی "ئیدمۆند وۆلش" بوو. وۆلش کە ئارەزووی لـە نوسینە جیۆپۆلیتیکییە ئەڵمانی و سۆڤییێتییەکان بوو. هەرچەندە وۆلـش خۆیشـی بـە وێنـەی نوسـەرە ئەڵمانییەکانی تاراوگە لەو بڕوایەدا بوو کە هوشۆفەر عەقڵی پلان دارێژەری هتلـەر بـووە، بـەڵام هـەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە نابێت هوشۆفەر بە تاوانی جەنگ تۆمەتبار بکرێت. لە کتێبێکیدا بە ناوی "هێزی گشتیی" کە لە ساڵی ١٩٤٨ بلاوی کردەوە، وۆلش لەم بارەیەوە دەنوسێت:

ناکرێت چیتر پەیوەندی دووسەرەی هۆ و ئەنجام بشاردرێتەوە، چونکە هەڵمەتـە داگیرکارییـە یـەك بەدوای یەکەکان لەسەر هەمان شێواز جێبەجێ کراون و لە نوسین و وانەی مامۆسـتایانی جیۆپۆلیتیـك بە روونی باس کراون.

## دارمانی دوای شەڕ لە ئەمریکا

بە حوکمی ئەوەی زاراوەکە ببوە جێگای رق و نەفرەت لێکردنی چاودێرانی بەناوبانگی وەکو ئیدمۆند وۆلش کە دواتر بووە راگری بەشی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا لە زانکۆی جۆرج تاون، بۆیە هیچ جێگای سەرسوڕمان نەبوو کە ناوبانگی جیۆپۆلیتیك بۆ ئاستێکی زۆر خراپ دابەزێت. نەوەی تازەی شارەزایانی ئەمریکی لە بواری جوگرافیای سیاسی ئەو زاراوەیان رەت کردەوە و لە جێگای ئەو هەوڵەکانیان چڕ کردەوە بۆ پێشخستنی جوگرافیای سیاسی، چونکە ئەم بوارە بەوە ناسرابوو کە لە رووی هزرییەوە بابەتییە و لە رووی کاریگەریی فاکتەرەکانی دەوروبەر لەسەر هەڵس و کەوتی ولاتان کەمتر یەکلاکەرەوەیە.

لە بەدواداچوونێکی گرنگدا سەبارەت بە جیۆپۆلیتیکی دوای شەڕی جیهانی لـە ناوچـە ئینگـایزی زمانەکاندا، لیسلی هێپڵ بڕوای وابوو کە زاراوەی جیۆپۆلیتیك لە ژیانی سیاسی و گشتی ئەمریکا لـە نێوان ساڵانی ١٩٤٥ تا ١٩٧٠ چووەتە دەرەوە. دیارە زاراوەکە بە دەستی ئەنقەست لە لایـەن زۆربـەی شارەزایانەوە پشت گوێ دەخرا، بێجگـە لـە چـەند کەسـێکی کـەمی وەکـو "جۆزیـف رۆسـیك" ی پرۆفیسۆری بواری کۆمەلایەتی لە زانکۆی بریج پۆرت نەبێت کە نوسینێکی زۆری لە گۆڤارە گشـتی و ئەکادیمییەکاندا بلاو کردۆتەوە لەسەر بابەتی وەکو جیۆپـۆلیتیکی ئـەمریکا و کیشـوەری جەمسـەری باشور. ئەوەی جێگای سەرنجیشە لە نوسینەکانی رۆسیك ئەوەیە کە بایـەخێکی ئـەوتۆیان نـەداوە بـە روونکردنەوەی ئەو بوارە هزرییەی کە زاراوەکە بەخۆوەی دەگرێت. بە کورتی، ناوبراو جیۆپۆلیتیـك بـە سوودبەخش دەزانێت تەنها لەبەر ئەوەی گرنگیی ناوچەکان و سەرچاوەکان نیشان دەدات.

بە گشتی، سەرەڕای بەکارهێنانی لە لایەن "ڕۆسیك"ەوە، بەلاّم تەنها ژمارەیەکی کەم لە پسپۆڕان ئارەزووی بەکارهێنانی زاراوەیەکیان دەکرد کە پێشتر بە هاوسۆزی نازییەکان تۆمەتبار کرابوو. بەلاّم ئەمە بەو مانایە نایەت کە جوگرافیناسان وازیان لە نەخشەی سیاسی جیهان هێنابێت. ئەوەتا جوگرافیناسانی وەکو نیکۆلاس سپایکمان (١٨٩٣ - ١٩٤٣) و دواتریش سۆڵ کۆهین لە دەستپێکردنی شەڕی ساردا ئاماژەیان بەوە کردووە کە پێویستە سروشتی ناوچەیی و ئایدۆلۆجی ئەو ململانێیە بزانرێت کە لە نێوان ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیێتدا درێژەی هەبووە.




٤. بیستن و سەیر کردن لە سەردەمی شەڕی ساردا.

" کۆهین" له کتێبێکیدا به ناوی "جوگرافیا و سیاسەت لە جیهانێکی دابەش بوودا" (١٩٦٣) بایەخ به تێگەشتنەکانی سپایکمان دەدات دەربارەی جیهانێك که به روونی پارچه پارچه بووه.

له کاتێکدا سپایکمان بایەخی بەو شوێنانه دەدا کـه نـاوی لێ نـابوون "ناوچـەکانی دەرەوە" لـه ئەوروپای ڕۆژهەلات و رۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت و باشـورو باشـوری رۆژهـەلاتی ئـەوروپا، کـۆهین لـه نوسیەنەکانی دواتریدا تەرکیزی لەسەر ئەو ناوچانه دەکرد که پێیان دەوترێـت "ناوچـەی پەرتـەوازە" و هـەوڵی داوە روونـی بکاتـەوە کـه لـه چ شـوێنێکدا دەکـرێ زلهێزەکـان بکەونـه ململانـێ لەسـەر وەدەستهێنانی ناوچه و سەرچاوەی زیاتر. لەم رووەوە ئـەو ناوچـه جوگرافییانـەی نـزیکن لـه یـەکێتی سۆڤییێت و چین وەکو مەیدانی سەرەکی شەڕی سارد دانرابوون. ئەڵبەتـه ململانـێ و تونـدو تیـژی لـه بەرلین و باشوری رۆژهەلاتی ئەوروپا و رۆژهەلاتی ناوەڕاست و کۆریا و ڤێتنام دووپـاتی ئـەو بۆچـوونه جوگرافییەیان کردەوە. هاوکات تەنگژەی ئـالۆزی موشـەکەکانی کوبـاش لـه سـاڵی ١٩٦٢، ئـەوەی دەرخست که ئەمریکا زۆر هەستیاره دەربارەی ناوچەی حەوزی کاریبی.

هەرچەنده زاراوەی جیۆپۆلیتیك متمانەی خۆی له ولاتانی وەکو ئـەمریکا و ژاپـۆن و بـەریتانیا و چەند بەشێکی تری ئەوروپا لەدەسـت دابـوو، بـەلاّم مشـت ومـڕ لەسـەر ئـەوە دروسـت بـوو گوایـا ستراتیجییەتی شەڕی ساردی ئەمریکا له پشت پـەردەوە ئیلـهامی لـه بۆچـوونه جیۆپۆلیتیکییـەکان وەرگرتووه. لەم چوارچێوەیەشدا، راپۆرتی ٦٨ دیکۆمێنتیی ئەنجومـەنی ئاسایشـی نەتـەوەیی کـه لـه نیسانی ١٩٥٠ ئاراستەی سەرۆك ترومان کرابوو، هوشیاری دەربارەی پلانی سۆڤێت بۆ کـۆنترۆڵکردنی جیهان دابوو و ئاماژەشی به ئەگەری بوونی ستراتیجییەتی جوگرافی رووسەکان بۆ گەیشتن بەو ئامانجـه بەخۆوە گرتبوو. هەرچەنده راپۆرتەکه جیهانی سێیەم و هەڵکەوته جۆراوجۆره جوگرافیەکەی پشـتگوێ خستبوو، بەلاّم دواتر کرا به پاشکۆ بۆ ئەو تیۆرەی که پێـی دەوتـرا "تیـۆری دۆمینـه". ئـەم تیـۆره هوشیاری ئەوەی دەدا که جیهانی سێیەم لەبەردەم ئەو هەڵمەتی بەرفاوانبوونەدا کراوەیه کـه سـۆڤێت پشتیوانیی لێ دەکات. لـه مـاوەی (١٠ ) سـالێش لـه دروسـتبوونی رێکخـراوی پـەیمانی بـاکووری ئەتلەسی ناسراو به (ناتۆ) له سـالّی ١٩٤٩، ئـەمریکا پەیماننامـەی لـه گـەلّ ئوسـترالیا لـه سـالّی (١٩٥١) و ئاسیای ناوەڕاست له سالّی (١٩٥٥) بەست،و هەروەها رێککەوتنی دووقۆلێیشـی لەگـەلّ ژاپۆن و کۆریای باشووردا گرێ دا.

ئەو ژماره کەمەی پسپۆڕانی بواری جوگرافیای سیاسی وەکو "کۆهین" که بـه ئاشـکرا رەخنـەیان له شەڕی سارد و ستراتیجییەتی ئـەمریکا دەگـرت، لـه لای خۆیانـەوە هـاوڕا بـوون لەگـەلّ ئامانجـه گشتییەکانی ئەو ستراتیجییەته وەکو ئامانجی سنووردار کردنی رۆلّی یەکێتی سۆڤێت، بـەلاّم هاوکـات

نیگەرانیش بوون لە تەرکیزکردن لەسەر ئەو هەمەجۆریە جوگرافییەی کە لە جیهـانی سـێیەمدا بـەدی دەکرا. لە ئەنجامی سووربوون لەسەر تێگەیشتنیشی بـۆ ئامانجـە جیهانییـەکانی یـەکێتی سـۆڤییێت، کۆهین هوشیاری دایە خوێنەرانی ئەمریکی کە پێویستە ئەو جیاوازییە قوولـە جـوگرافی و کلتـوری و سیاسییەی نێوان رۆژهەلاتی ناوەڕاست لە لایەك و باشوری ئاسیا لـە لایـەکی تـرەوە نادیـدە نـەگرن. دیارە وا مەزەندە دەکرا کە داڕێژەرانی ستراتیجییەتی ئەمریکا لەو سەردەمەدا وەکو "جـۆرج کینـان" کە لەسەردەمی سەرۆکایەتی سـەرۆك ترومـان لـە وەزارەتـی دەرەوە کـاری دەکـرد، ئـەو جیاوازییـە ناوچەییەیان لەبەرچاو نەگرتبوو. هەروەها راپـۆرتی ئەنجومـەنی ئاسایشـی نەتـەوەیی بـە راپـۆرتێکی جوگرافی زۆر سادە ناوزەد کرابوو کە تەنها بایەخ بـە دەرخسـتنی روسـیا دەدات وەکـو هەڕەشـەیەکی فراوانخوازی سەرسەخت لە لای رۆژهەلاتەوە.

## زیندوو بوونەوەی جیۆپۆلیتیك لە ئەمریکا

دیارە هەمیشە وەزیری پێشووی دەرەوەی ئەمریکا، هینری کێسنجەر وەکو هۆکاری زیندوو بوونەوەی بایەخی ئەمریکییەکان بە جیۆپۆلیتیك دادەنرێت، هەرچەندە بەکارهێنانەکەی ئەو زۆر نافەرمی تر بووە لە بەکارهێنانی هەمان زاراوە لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا. کیسنجەر وەکو هاوولاتییەکی بە رەگەز ئەلمانی کە کۆچی کردووە بۆ ئەمریکا،و هەروەها وەکو بیرمەندێك کە تێزی دکتۆراکەی بریتی بووە لە شیکردنەوەی مێژووی جیۆپۆلیتیکی ئەوروپی لە سەدەی ١٩دا، بە یەکێك لە وەزیرە نموونەییەکانی دەرەوەی ئەمریکا هەژمار دەکرێت لە سەردەمی دوای سالی ١٩٤٥. کیسنجەر بیرمەندێکی گرنگی سەردەمی ئیدارەی سەرۆك نیکسون و هاوکات چاودێرێکی وردی بارودۆخی هەمیشە گۆڕاوی سەردەمی شەڕی ساردیش بوو. ئەو سەردەمەش زۆر چارەنوسساز بوو، چونکە شەڕەکە پێی نابووە قۆناغی خاوبوونەوەیەکی رێژەییەوە هەرچەندە ئەو کاتە هێشتا ئەمریکا و سۆڤێت و چین هەر یەك لە لای خۆیەوە گومانی لە پالنەر و ئامانجە جیۆپۆلیتیکییەکانی ئەوانی تر هەبوو. لەولاشەوە ئەمریکا لە ململانێیەکدا چەقیبوو لە ڤێتنام کە رۆژ لە دوای رۆژ ناوبانگی ئەمریکای زیاتر ناشیرین دەکرد و بەکارهێنانی زاراوەی جیۆپۆلیتیك لە لایەن "کیسنجەر"ەوە بەشێکی بریتی بوو لە هەولی ئەمریکا بۆ بەدی هێنانی ئاسۆیەکی ستراتیجیی نوێ. بە گشتی، وەکو ئەوەی لیسلی هێپل ئاماژەی پێ کردووە، کیسنجەر زاراوەکەی بەکار هێناوە بۆ روونکردنەوەی

گرنگیی هاوسەنگیی جیهانی و بەرژەوەندیی نیشتمانیی هەمیشەیی لە جیهانێکدا کە هاوسەنگیی هێز بەخۆوە دەبینێت. هێپڵ کە ئارەزووی دەکرد ئەمریکا پەیوەندییەکی تازە لە گەڵ چیندا دروست بکات، ئاماژەی بەوە کردووە کە پێویستە رێگا لە "ئارەزووە جیۆپۆلیتیکییەکانی" مۆسکۆ بگیرێت:

یارییەکە ناوی "هاوسەنگی" بوو. ئێمە بەدوای ئەوەدا نەدەگەڕاین کە لە گەڵ ولاّتی چیندا رووبورووبوونەوەیەکی وروژێنەر دژ بە یەکێتی سۆڤێت بەرپا بکەین، بەلاّم لەسەر پێویستی رێگا گرتن لە ئارەزووە جیۆپۆلیتیکییەکانی مۆسکۆ رێککەوتین. هەلۆیستەکانی پەکین لە یەك کاتدا شەڕانگێزی و فەلسەفییش بوون چونکە ئەو ولاّتە نەك تەنها نەییاری ئارەزووە جیۆپۆلیتیکییەکانی مۆسکۆ بوو، بەڵکو لە رووی بالاّ دەستیی روسیاش دەوەستایەوە. ئێمە رێککەوتین لەسەر بەرەنگاربوونەوەی ئارەزووەکانی مۆسکۆ، بەلاّم هیچ هۆکارێکمان نەبوو بۆ دروستکردنی ململانێیەکی ئایدۆلۆجی لەگەڵ ئەو ولاّتەدا.

لە کاتێکدا ئەمریکا هەوڵی کەمکردنەوەی رۆڵی سۆڤێتی دەدا، هینری کێسنجەر بڕوای وابوو کە سیاسەتی ئەو سەردەمەی دەرەوەی ئەمریکا زیاد لە پێویست بەپەرۆش بووە بۆ ئامادەکردنی وەلاّمێکی سەربازی بۆ ئەو تەنگ و چەڵەمەیە. لە جێگای ئەوە ( بە بڕوای کێسنجەر) و لە سایەی لاوازبوونی رێژەیی هێزی سەربازیدا، ئەمریکادا پێویستی بە شێوازێکی نەرم و نیان بوو کە حسابی ئەگەرە سیاسیە تازەکان بکات و پەرە بە پەیوەندییەکانی ئەمریکا لەگەڵ هێزەکانی تری جیهان وەکو چین بدات.

هەرچەندە بەکارهێنانی زاراوەی جیۆپۆلیتیك لە لایەن "کێسنجەر" ەوە ناڕوون و تەم و مژاویی بوو، بەلاّم بە بۆچوونی ژمارەیەك لە پسپۆڕان، ئەو بەکارهێنانە ناوبانگی بۆ زاراوەکە لە ناو کلتوری سیاسی ئەمریکادا گەڕاندەوە و بووە هۆی تازەبوونەوەی بایەخدانی فەرمیی ئەکادیمی بە ستراتیجیەتی جیهانی. لە رووی ناوبانگەوە، زاراوەی جیۆپۆلیتیك جارێکی تر هاتەوە ناو گفتوگۆکانی تایبەت بە سیاسەتی شەڕی سارد و ئەو بابەتانەی کە پرسە نێوخۆیی و نێودەوڵەتییەکانیان بەیەکەوە دەبەستەوە.

هەرچەندە بەشێکی کەم لە نوسەران هەڵسەنگاندنێکی هزری و مێژوییان بۆ زاراوەکە کردووە، بەلاّم ئەو زاراوەیە بووە هۆکارێکی بەسوود بۆ تیشك خستنە سەر گرنگیی فاکتەرە جوگرافییەکان لە دروستبوونی پێشکەوتنە سیاسی و سەربازییەکاندا. کەسایەتییە سیاسیە ناودارەکانی تری وەکو

راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی لە سەردەمی سەرۆك کارتەر، زبیگنیڤ برزیزنسکی کە لە پۆڵەندا لە دایك بووە، بەکارهێنەری سەرەکیی زاراوەی جیۆپۆلیتیك بوون و زاراوەکەیان بەکار دەهێنا بۆ نیشاندانی بایەخی خۆیان بە وێناکردنی بەرژەوەندییە ستراتیجییەکانی ئەمریکا لە سەردەمێکدا کە تەنگژەی جیهانی روو لە هەڵکشانە. تەنگژەکان بەلای ئەوانەی پێیان دەگوترا بیرمەندە تازە-محافەزەکارەکان خۆیان لە هەڵمەتی فراوانخوازیی هەمەلایەنەی سۆڤییێتدا دەبینییەوە.




٥. هنری کێسنجەر. بەرگی گۆڤاری "تایم لایف" ١٩٧٤/٦/١٠.

ئەڵبەتە بڕیاری پشتیوانی کردن لە هێزی ئۆپۆزسیۆن دژ بە داگیرکردنی ئەفغانستان لە لایەن سۆڤێتەوە و پاڵپشتی کردنیان لە رووی داراییەوە لە ساڵی ١٩٧٩ بەسەرەوە، لەو بیرکردنەوە جیۆپۆلیتیکییەوە سەرچاوەی گرت کە پێویستە رێگا لە پەلهاویشتنی زیاتری سۆڤێت بگیرێت هەتاکو ئەگەر ئەو کارە پێویستی بەوە بکات ئەمریکا و هاوپەیمانە ناوچەییەکانی وەکو پاکستان پشتیوانی لەو بڕیارە بکەن بۆ بەرەنگار بوونەوەی هێزەکانی سۆڤێت. هەر وەکو چۆن هەندێك لە چاودێران پێشبینییان کردبوو، ئەم بڕیارە لق و پۆی زۆری لێ بووەوە و بووە هۆی دروستبوونی رێکخراوی تیرۆریستی قاعیدە و شەڕکەری خۆبەخشی وەکو ئوسامە بن لادن.

بێگومان یەکێك لە گرنگترین دەرەنجامەکانی زیندووبوونەوەی بایەخدان بە جیۆپۆلیتیك بریتی بوو لە دروستکردنی لیژنەی "مەترسیی ئێستا". ئەم لیژنەیە زاراوەی جیۆپۆلیتیك و بابەتە ئەکادیمییەکانی تری وەکو سۆڤیۆتۆلۆجی (واتا دیراسەت کردنی حکومەت و کۆمەڵگای سۆڤێت) بەکار دەهێنا بە مەبەستی گەیشتن بەو بڕوایەی کە پێویستە ئەمریکا واز لە سیاسەتی کرانەوە (انفراج) و هاوسەنگیی هێز بێنێت و شێوازێکی زیاتر هێرشکەرانە بەکار بێنێت، چونکە یەکێتی سۆڤێت سوورە لەسەر پەرەدان بە بالادەستی خۆی بەسەر هەموو ئاسیا و ئەورووپادا. ئەو بیرمەند و رەخنەگرە ئەکادیمییانەی وەکو کۆلن گرەی کە بێ ئومێد بوون لە سیاسەتی ئاشتیخوازانەی ئیدارەی جیمی کارتەر، بۆچوونێکی جیۆپۆلیتیکی جیهانییان هێنایە ئاراوە کە دواتر لە لایەن ئیدارەی (رۆناڵد ریگان ) ەوە پەیڕەو کرا. سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا ئەو کاتە سەرقاڵی بەدوادا چوون بوو بۆ ئەو لایەنانەی کە یەکێتی سۆڤێت پاڵپشتی دەکردن، و هاوکات پشتیوانیی لە رژێمەکانی دژ بە سۆڤێت لە سەرانسەری جیهانی سێیەمدا دەکرد. دواتریش موشەکی ناوکیی کورت مەوداو نیمچە دوور مەودا لە بەریتانیا و ئەڵمانیای رۆژئاوا وەکو بەشێك لە هەوڵەکانی ناتۆ بۆ بەرەنگار بوونەوەی هەر هەوڵێکی یەکێتی سۆڤێت لە فراوانکردنی کاریگەری خۆی لە ناوەڕاست و رۆژئاوای ئەورووپادا جێگیر کران.

لە ناوەڕاستی هەشتاکانیشدا گفتوگۆ کردن دەربارەی بابەتی جیۆپۆلیتیك لە ئەمریکا بە شێوەی سەرەکیی لە لایەن گروپێك لە پسپۆڕانەوە بەڕێوە دەبرا کە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی بەهێزی ریالیزمی سیاسی و ئارەزووی پارێزگاری کردن لە هێز و دەسەلاتی ئەمریکا، لە گەرمەی ئەو رووداوانەی کە پێیان دەوترا دووەمین شەڕی سارد. دیارە مەبەست لە "دووەمین شەڕی سارد" بریتیە لە ماوەی دوای هەرەس هێنانی سیاسەتی کرانەوەو هێورکردنەوەی نێوان زلهێزەکانی جیهان. لێرەدا جیۆپۆلیتیك جارێکی تریش بووە زاراوەی کورتکراوە بۆ کێبەرکێی نێوان زلهێزەکان، و هەروەها

ئاماژەیەکیش بوو بۆ گرنگیی هەوڵەکانی ئەمریکا لە پێناو بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی خۆی لە جیهانێکی پڕ لە پشێویدا. بێگومان سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لە سەردەمی رۆناڵد ریگان زیاتر سەرەڕۆییانە بوو لەوەی سەردەمی ئیدارەی کارتەر . زۆرێك لەو بیرمەندو داڕێژەرە سیاسییانەی کە بەو ئیدارەیەوە وابەستە بوون، دواتر بوون بە ئەندام لە هەردوو ئیدارەی( بۆش) ی باوك و(بۆش) ی کوڕدا . بۆ نموونە وەزیری بەرگری (دۆناڵد رامسفیلد) لە سەرەتای هەشتاکاندا دەستی خستە ناو دەستی سەدام حوسێن، بەلاّم دواتر بوو بە یەکێك لە سەرەکیترین پلان دانەرو جێبەجێکارەکانی هەڵمەتی داگیر کردنی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا، کە بووە هۆی رووخانی رژێمەکەی سەدام و دواتر لە سێدارەدانی خودی سەدام لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٦ دا.

## بەرەو جیۆپۆلیتیکی رەخنەیی

لەو کاتەی کە چەند بیرمەندێکی سیاسی لە چوارچێوەی شەڕی ساردا پێداچوونەوەیان بە زاراوەی "جیۆپۆلیتیك"دا دەکرد، نوسەری تر هەبوون کە لێکۆڵینەوەیان دەربارەی چەمك و تێگەیشتنی جیاواز بۆ زاراوەکە ئەنجام دەدا. ئەم شێوازە کە دواتر بە جیۆپۆلیتیکی رەخنەیی ناوزەد کرا، لە رووی تۆن و دیدگاوە ریالیستی نەبوو. بەلاّم ریالیزم وەکو شێوازێك بۆ لێکۆڵینەوە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان زۆر گرنگ بوو بە تایبەتییش لە ئەمریکا، چونکە ئەو شێوازە وای دادەنێت کە ولاّتان لە جیهانێکی پڕ لە پشێویدا دەژین بە هۆی نەبوونی حکومەتێکی "جیهانی" کە بتوانێت کۆنترۆڵی کردەوەی حکومەتەکانی تر بکات. سەرەتاترین و ئاشکراترین بنەماکانی ریالیزمیش بریتین لە بەرژەوەندیی خودیی و نیشاندانی هێزو دەسەلاّت. هەرچەندە زۆرێك لە نوسەرانی بواری جیۆپۆلیتیك ئاماژە بە ریالیستە بەرچاوەکانی وەکو "ی. هـ. کار"و "کینیس والتّس" نادەن، بەلاّم بە شێوەی ناڕاستەوخۆ کار بە مۆدێلێك دەکەن کە هاوشێوەی زۆربەی ریالیستەکانە. لەولاشەوە بەلای جەنەراڵەکانی ئەمریکای لاتینەوە کە لە شەستەکان و حەفتاکاندا سەرقاڵی ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان بوون، بۆچوونە ریالیستییەکان و هزری جیۆپۆلیتیکی پڕ بوون لە هەڕەشەو مەترسی لە لایەن هێزە کۆمۆنیستییەکانەوە لە ناوەوە و دەرەوەی ئەو ولاّتانە.

بەلای رەخنەگران لە جیۆپۆلیتیکی بونیاتنراو لەسەر ریالیزم، بۆچوونی نەرێنی دەربارەی سیاسەتی جیهانیی کارێکی تاکلایەنەیە، واتا زیاتر باس لە بابەتی ململانێ و کێبەرکێ دەکات لەسەر حسابی هەماهەنگی و کرانەوە (انفراج). بەلاّم سیستمی نێوان ولاّتان نیشانی داوە کە دەتوانێ هەماهەنگی دروست بکات و دامەزراوەی هاوبەشی وەکو یەکێتی ئەوروپا و نەتەوە یەکگرتووەکان و یاسای

نێودەوڵەتی و پێکهاتەی حکومی پێش بخات. هەروەها نەوەیەکی نوێ لە نوسەران کە ئیلهام لە نمونەی فەلسەفی جیاواز وەردەگرن، گومان دەخاتە سەر بۆچوونەکانی ئەو نوسەرانەی کە ریالیزم ئیلهامبەخشیانە . لەوانەیە جێگای سەرسوڕمان نەبێت کە "جیۆپۆلیتیک" ی بونیاتنراو لەسەر ریالیزم بە گەرمی لە ئەمریکا پێشوازیی لێ کرا، چونکە تێیدا وا باوە کە نوسەران نەخشەی تایبەتی خۆیان بۆ جیهان بە شێوەیەك دەخەنە روو وەکو ئەوەی چاودێری بێ لایەن بن و تەنها زنجیرەیەك "راستیی نێوخۆیی" بە خوێنەرانیان رابەگەیەنن. بە تایبەتی پسپۆرە فیمینیستەکانی وەکو "دۆنا هارەوەی" لە راکێشانی سەرنجی خوێنەران بۆ لای سێ شت کە لە ئەنجامی ئەو جۆرە بۆچوونانە دێنە ئاراوە زۆر گرنگ و بەرچاو بوون:




6. Axes of good and evil

٦. تەوەرەکانی خێر و شەڕ.

یەکەم: پێویستە ئەوە بۆ خوێنەرە شارەزاکان روون بکرێتەوە کە چۆن جیۆپۆلیتیك هاتە ئاراوە و جێبەجێ کرا. بۆ تێگەیشتن لە سیاسەتی جیهانییش، پێویستە ئەو راستییە بزانین کە ئەو سیاسەتە بە سەرپۆشی کلتوری و کۆمەڵایەتی داپۆشراوە. سیاسەتی ئێستای جیهانیی سروشتی و حەتمی نییە و ئەو چیرۆکانەی دەربارەی سیاسەتی نێودەوڵەتی باس دەکرێن، تەنها چیرۆکن و بەس. دیارە هەندێك لە چیرۆکەکان لەوانی تر گرنگترن و هەندێك کەسایەتی وەکو سەرۆکی ئەمریکا و سەرۆکی روسیا خاوەن

دەنگی زولاڵتترن لە بڕیاردان دەربارەی پرسە جیهانییەکان. ئەوەتا وتـاری سـالآنەی سـەرۆکی ئـەمریکا جیگای بایەخی زۆرە وەکو چۆن قسەو لیدوانی سەرانی ولآتە زلهیزەکانی وەکـو روسـیا و چـین هـەمان نرخ و بەهایان هەیە. ئایا ئیمە هەمان بایەخ بە وتاریك دەدەین کە سەرکردەیەکی سیاسی لە رۆژئـاوای ئەفریقا یان ئەمریکای ناوەڕاست پیشکەشی بکات؟ بیگومـان نـەخیر، بـەلآم تاکـە حالـەتی جیـاواز لەوانەیە وتار و لیدوانی سەرۆکی ولآتی ڤەنزویلا بیت کـە ولآتەکـەی بـە نـەوت دەولەمەنـدە. دیـارە رەخنەکانی (هۆگۆ چاڤیز) ی سەرۆکی ئەو ولآتە لە ئیـدارەی بـۆش و نـاوزەدکردنی خـودی بـۆش بـە "شەیتان" لە هزری زۆر کەسدا ماون، لەبەر دوو هۆکار: یەکەمیان شیوازی نادیبلۆماسـی وتەکانـە و دووەمیش بریتیە لە کاریگەریی لیدوانەکان لەسـەر جیهانیـك کـە بەدەسـت بـەرزیی نرخـی نەوتـەوە دەینالآند، لە کاتیکدا داواکاری ئەمریکا و چین و ئەوروپا بۆ نەوت لە زیاد بوونـدا بـوو. بـە گشـتیی پەیوەندییەکانی ئەمریکا و ئەمریکای لاتین هەمیشە لە گۆڕاندا بـووە، چـونکە بـەردەوام حکومـەتی تازەی چەپی- ناوەڕاست هەلدەبژیردران و بە بۆچوونی چاڤیز "تەوەری خیر" دروسـت دەبـوو. (هۆگـۆ چاڤیز ئیستا لە ژیاندا نەماوە بەلآم رژیمەکەی هەر بەرقەرارە——وەرگیڕ).

دووەم: وەکو دەرەنجامیکی لۆجیکی بۆ لیکدانەوەکەی سەرەوە، جیۆپۆلیتیك بە جۆریك لە گفتوگـۆ دادەنریت کە دەتوانیٚ سیاسەتی جیهانیی بەرهەم بینیت و ئیدارەی بدات. لیرەدا تەرکیز لەسەر ئەوەیـە کە چۆن زمانی سیاسی چەندین تیگەیشتنی بۆ بـارودۆخی جیۆپـۆلیتیکی ئیسـتا دروسـت کـردووە و بەمەش بەشدار بووە لە بەدی هینانی سیاسەتی ناسنامە کە زۆر گرنگە لە مسۆگەر کردنی هەست بـە بوونی خود لە ئەمریکادا. لە سەردەمیکدا کە بە سەردەمی بۆچوونەکان و کاریگەرییـەکان ناسـرابوو، شەڕی سارد کەوتە ژیر کاریگەریی ئەم جۆرە لە تەرکیزی جوگرافییەوە. ئیتر بایەخی تایبەت دەدرا بـە چەند جوگرافیایەکی وینا کراو بە هەمان رادەی بایەخدان بـە ململانـیٚ کردەییـەکان لـە شـوینەکانی وەکو ئەفغانستان و ئەمریکای ناوەڕاست. ئەو جوگرافیا وینا کراوانە هەمیشە وینای ئـەمریکایان لـە سەردەمی ئیدارەی رۆنالد ریگان وەکـو "سـەرکردەی جیهـانی ئـازاد" بـەخۆوە دەگـرت. لەولاشـەوە یەکیتی سۆڤیتیان وەکو ئیمپراتۆرییەتی شـەڕ دەناسـاند کـە مەترسـی لەسـەر شارسـتانیتی رۆژئـاوا دروست دەکات.

سییەم: جیۆپۆلیتیکی جیهانی لەگەلٚ پرسەکانی وەکو جیندەر و رەگـەز و (چـین) دا تیـك ئـالآوە. دیارە ئەزموونی رۆژانەی ئافرەتان و منداڵآن و ئەو ستراتیجیەتەی کە دەبیت پیادەی بکەن بـۆ ئـەوەی خۆیـان لەگـەلٚ پرۆسـەو پیکهاتـەی جیۆپـۆلیتیکی و جیـۆ-ئابووریـدا بگونجینن،پیویسـتە وەکـو ئەزموونیکی تەواو جیاواز لە ئەزموونی زۆریك لە پیاوان پیناسە بکریت. بـۆ نموونـە چـەمکی وەکـو

ناوچە و سنوور و هاوسەنکیی، ئەگەر بۆ حاڵەتی رفاندن لەکاتی شەڕ لە شوێنێکی وەکو کۆماری دیموکراتیی کۆنگۆ بەکار بهێنرێن، مانای جیاواز دەبەخشن بە بەراورد لە گەڵ ماناکانیان لە حاڵەتی کۆچکردنی لاوەکان لە باکوری ئەفریقاوە بەرەو باشووری ئەوروپا. راستە کە سنوورە سیاسیە جیهانییەکان زیاتر بە ڕووی سەرمایەدا کراوەن تا ئەوەی بە رووی خەڵکدا بکرێنەوە، بەڵام بە گشتی کراوەیی ئەو سنوورانە بۆ پیاوان زیاتر لە ئافرەتان فەراهەم دەبێت. هەروەکو ئەوەی "سینسیا ئینلۆ" ئاماژەی پیێ کردووە، پێویستە جیۆپۆلیتیکی جیهانیی ببەسترێتەوە بە پەیوەندییە جێندەرییەکانەوە، بە مەبەستی زیاتر تێگەیشتن لە کاریگەری جیاوازی سنوورە نەتەوەییەکان و ئاسایش و ململانێ و کۆچکردن لە کۆمەڵگا مرۆییەکاندا.

پەیمانگا ستراتیجییەکان
بیرکردنەوە
ئەکادیمیا

سیاسەتی دەرەوە
بیرۆکراسی
دامەزراوە سیاسییەکان

میدیا
سینەما
چیرۆک
فیلمی کارتۆن

جیۆپۆلیتیکی فەرمی

جیۆپۆلیتیکی پراکتیکی

جیۆپۆلیتیکی میللی

بە تایبەتکردنی سنوور و مەترسییەکان

نەخشەی جیۆپۆلیتیکی جیهان

نوێنەرایەتی کردنی جیۆپۆلیتیکی بۆ خود و ئەوی تر

خەیاڵی جیۆپۆلیتیکی

٧. جیۆپۆلیتیکی فەرمی و پراکتیکی و میللی.

بە مەبەستی تێگەیشتنی زیاتر لە چۆنێتی کاری جیۆپۆلیتیک، رەخنەگرانی بواری جوگرافیا پێشنیاری دابەشکردنی بابەتەکەیان کردووە بەسەر سێ جۆردا: فەرمی و کردەیی و گشتی . بابەتی

ئەم بەشەی کتێبەکەش بریتیە لە جیۆپۆلیتیکی فەرمی. لێرەدا پرسیار ئەمەیە: چۆن رەخنەگران و ئەکادیمیکاران شێوازێکی پسپۆرانە و پەیوەندیدار بە "جیۆپۆلیتیك"ەوە بەکار دێنن؟

جیۆپۆلیتیکی کردەیی لە لای خۆیەوە ئاماژە بەو شێواز و چوارچێوە جوگرافییانە دەدات کە لەسەر بنەمای سیاسی دارێژراون، و لە لایەن سەردەکانی وەکو سەرۆك "بۆش" ەوە لە پیادەکردنی سیاسەتی جیهانیدا بەکار دەهێنرێن. بەلاّم جیۆپۆلیتیکی گشتی رۆڵی میدیاو جۆرەکانی تر لە کلتوری گشتی بە خۆوە دەگرێت کە هاوولاّتیان بەکاریان دێنن بۆ تێگەیشتن لە رووداوەکانی ناوچەکەیان، ولاّتەکەیان، هەرێمەکەیان و یان جیهانی بە گشتیی.

ئەڵبەتە ئەم سێ جۆرە بەیەکەوە بەستراونەتەوە،چونکە پسپۆران و رۆژنامەنوسان بیروبۆچوون لەگەڵ یەکتردا ئاڵوگۆڕ دەکەن و هەردوو لاشیان پەیوەندیی بەردەوامیان لە گەڵ بەرپرسانی حکومی و رێکخراوەکاندا هەیە. هەروەها ئەو دوو گروپە نغرۆی ناو کاری میدیاو کلتوری گشتی بوون. دیارە چوارچێوەی جیۆپۆلیتیکی یارمەتی تاکەکان و گرووپەکانیش دەدات لە تێگەیشتن لە رەوتی سیاسی جیهان. بۆ نموونە، زاراوەی وەکو "تەوەری شەڕ" بە تایبەتی سەرنج رادەکێشێت چونکە بۆ ئەوە دارێژراون کە سیاسەت جیهانی سانا بکەنەوە و پێگەی دۆست و دوژمنان دیاری بکەن. هەرچەندە ئەم جۆرە زاراوانە زیاتر لە لایەن سەرۆك و سەرۆك وەزیرەکانەوە بە شێوەی سەرەکیی بەکار دەبرێن، بەلاّم هاوکات دەبنە مایەی دروستبوون و وروژاندنی گفتوگۆ لە نێوان رۆژنامەنوسان و رەخنەگران و خوێنەر و بیسەرانیش بە گشتیی.

جوگرافیناسی سیاسی "جیرۆید ۆ توسەیل" دووپاتی کردۆتەوە کە پلانە سێ لایەنییەکەی لە چوارچێوەی کلتوری جوگرافیدایە کە شێوەی رووبەڕوو بوونەوەی هەر ولاّتێك لەگەڵ جیهانی دەرەوەیدا دەستنیشان دەکات. بۆ نموونە هەرچەندە ناکرێت هەڵکەوتەی فیزیکی بەریتانیا لە کەناری ئەوروپادا وەکو دەرەنجامێکی سیاسی بڕیار لەسەر دراو و پابەند بوون بە پرۆسەی یەکگرتنی ئەوروپاوە سەیر بکرێت، بەلاّم زۆر گرنگ بووە لە دروستبوونی تێگەیشتنێکی کلتوری بۆ پێگە جوگرافییەکەی. خاڵێکی تری گرنگ بریتی بوو لە ئەزموونی سەردەمی شەڕ، کاتێ بەریتانیا ناچار بوو بەرگری لە سنوورە نیشتمانییەکەی خۆی بکات لە بەرامبەر هێزەکانی ئەڵمانیا کە خۆی لە بۆمباران کردنی ئاسمانی و هێرشی مووشەکیی دەبینییەوە. لەولاشەوە هەندێك لە سیاسەتمەدارانی بەریتانیا وەکو سەرۆك وەزیران، مارگرێت تاتچەر تووشی شۆك بوون بە بیستنی هەواڵی هەڵمەتی داگیرکردنی دوورگەکانی فۆکلاند لە لایەن ئەرجەنتینەوە لە نیسانی ساڵی ١٩٨٢. لە ئەنجامیشدا سیاسەتمەداران و رۆژنامەنوسان نموونەی جەنگی دووەمی جیهانیان دەهێنایە بەرچاو لە هەوڵەکانیاندا بۆ

روونکردنەوەی هۆکاری ناردنی هێزێکی دەریایی تایبەت بۆ ئەو دوورگانە، کــە لــە مــانگی تــەمووزی هەمان ساڵدا سەرکەوت بەسەر هێزەکانی ئەرجەنتیندا. لە کاتی ململانێ سەربازییەکەدا، تاتچــەر لــە پشتیوانی کردنی ئەمریکا بۆ وڵاتەکەی دڵنیا بــوو و ئــەو "پەیوەندییــە تایبەتییــە" گــرنگ بــوو لــە مسۆگەر کردنی دەستڕاگەیشتنی بەریتانییــەکان بــە چــەك و تەقەمــەنی و زانیــاری دەربــارەی هێــزی سەربازی ئەرجەنتین. تاتچەر بە هەمان شێوەی تۆنی بلێر لە کاتی جەنگی دژ بە عێــراق، گرنگییــەکی زۆری بە پەیوەندی وڵاتەکەی و ئەمریکا دەدا لەسەر حسابی داب و نەریتی جیۆپۆلیتیکی، کــە تێیــدا بەریتانیا لــە چوارچێوەی ئــەوروپادا دەخوێنرێتــەوە. بــە گشتی،چــوار نەریتــە جیۆپۆلیتیکییەکــەی بەریتانیا بریتین لە:

١. ئینگلتەرای بچووك/ بەریتانیا.
٢. بەریتانیای جیهانیی.
٣. بەریتانیای ئەوروپی.
٤. بەریتانیای ئەمریکی. (وەرگیراوە لە تیمۆسی کارتون ئەش، جیهانی ئازاد، ٢٠٠٤).

بە هەمان شێوە، بۆ تێگەیشتنی باشتر لە کلتوری جیۆپۆلیتیکی روسیا، پێویستە—وەکو ئــەوەی جوگرافیناس گراهــام سمــس ئامــاژەی پــێ کــردووە—بزانرێــت کــە چــۆن ســەرکردە سیاسییەکان و رۆژنامەنوسان کلتوری جیۆپۆلیتیکیی جیاوازیان بەکارهێناوە:

یەکەم: ئەو بۆچوونەی کە روسیا بەشێکە لە ئەوروپا و پێویستی بەوەیە کە مــۆدێلێکی رۆژئــاوایی لە پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی پیادە بکات.

دووەم: روسیا ناوچەیەکی ئەوروپی- ئاسیایی تایبەتمەندە کە شێوازی تایبــەتی خــۆی لــە شــێوەی حوکم و کۆمەڵگادا هەیە .

سێیەم: روسیاش وەکو بەریتانیا، لەم حاڵەتەدا بریتیە لە "پرد" ێك لە نێوان ئەوروپا و ئاسیادا.

دیارە جار بــە جــار نــەریتێکی جیۆپــۆلیتیکی تایبــەت زاڵ دەبێــت بەســەر ئــەوانی تــردا وەکــو سووربوونی ئیدارەی سەرۆك بۆش لە هەوڵدان بۆ وەدی هێنانی خەونی جیۆپۆلیتیکی بۆ ئەمریکایــەکی جیهانگیر کە بایەخ بە هەژموون و توانــای ئــەمریکا بــدات لــە دروســتکردنی هێــز، بــە مەبەســتی زامنکردنی بەرژەوەندی نەتەوەیی.

بەڵام، ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنەی جیۆپۆلیتیك وەکو سەرەڕۆییەکی کلتوری بەربڵاو و بــێ پێشــینە نییە، چونکە بە درێژایی مێژووی هزریی جیۆپۆلیتیك،نموونەی زۆر هەیــە لــە پــەنا بردنــی تاکــەکان و گروپەکان بۆ چەند جۆرێکی جیاواز لە شیکردنەوەی مێژوویی و کولتــووریی وەکــو ئــەوەی ئێســتا لــە

جیۆپۆلیتیکی ڕەخنەییدا بەدی دەکرێت. لەم چوارچێوەیەشدا، نوسینەکانی "ڤیس لۆکاستە" و هاوکارە پاریسییەکانی شایستەی ئاماژە پێکردنن چونکە لۆکاستە یەکێك بوو لە یەکەمین ئەو کەسانەی کە هەوڵی جیددی داوە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە چۆن جیۆپۆلیتیك جۆرێکە لە زانستی سیاسی و ستراتیجی. ئەو لە ساڵی ١٩٧٦دا کتێبێکی بە ناونیشانی "جوگرافیا لە سەرووی هەموو شتێکەوە بایەخ بە دروستکردنی جەنگ دەدات"، داناوە. ئەمەش لە دوای هەوڵێکی پێشتر دێت کە تێیدا پلان دانەرانی سەربازیی ئەمریکا زانیاریی جوگرافییان دەربارەی ڤێتنامی باکوور بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی رووبارو جەنگەڵستانەکان بکەنە ئامانج لە پێناو سەپاندنی حاڵەتی "ئیکۆساید" بەسەر دانیشتوواندا (ئیکۆساید واتا بە ئەنقەست تێکدانی سیستمی دەوروبەر بۆ لاوازکردنی رۆحی بەربەرەکانێ-- وەرگێڕ). هەروەها ناوبراو لێکۆڵینەوەی دەربارەی تیۆرە جیۆپۆلیتیکییەکانی سەرۆکی پێشووی چیلی "بینۆچیت" ئەنجامداوە، کە پێشتر لە ساڵانی شەستەکاندا پرۆفیسۆری بواری جیۆپۆلیتیك بووە لە کۆلیجی جەنگ لە وڵاتی چیلی. بینۆچیت کتێبێکی گەورەی لە بواری جیۆپۆلیتیك داناوەو تێیدا ئەو بۆچوونەی وەرگرتووە کە دەوڵەت بە ئۆرگانێکی باڵا دەناسێنێت و تەنانەت تیۆرەکەشی خستە واری پراکتیکییەوە، کاتێ بەشداری کرد لە رووخاندنی حکومەتی سۆشیالیستی "سەلفادۆر ئەلیند" لە ١١ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٣. لەو کاتەدا پشتیوانی ئەمریکا بۆ هەڵمەتەکە بە چارەنووسساز ناوزەد کراو، لەم چوارچێوەیەدا هینری کێسنجەری وەزیری ئەو کاتەی دەرەوەی ئەمریکا وتی:

من نازانم بۆچی دەبێت راوەستین و سەیری وڵاتێك بکەین کە چۆن خەریکە دەبێتە وڵاتێکی کۆمۆنیستی تەنها لەبەر ئەوەی گەلەکەی هەست بە بەرپرسیارێتی ناکەن؟ بابەتەکان زۆر لەوە گرنگترن کە بەجێ بهێڵرێن بۆ دەنگدەرانی چیلی کە بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆیان بدەن.

لۆکاستە وای بۆ دەچوو کە پێویستە نوسەرانی بواری جیۆپۆلیتیك زیاتر بە چاوی رەخنەییەوە سەیری پرسەکان بکەن و رۆڵی خۆیان ببینن لە پەردە لادان لەسەر چۆنێتی تێکەڵکردنی جیۆپۆلیتیك لە گەڵ لەشکر و هێزی دەوڵەتدا. گۆڤارەکەی لۆکاستە بە ناوی "هیرۆدۆت" تا ئێستا گەورەترین گۆڤاری جوگرافییە کە لە وڵاتانی فەرەنسی زماندا پەخش و بڵاو دەبێتەوە،و شیکردنەوەی رەخنەییش دەربارەی رووداوە هاوچەرخەکانی جیهان وەکو جەنگی جیهانیی دژ بە تیرۆر بڵاو دەکاتەوە. هەرچەندە لۆکاستە ئاماژەی بەوە کردووە کە "ئاماژە کردن بە جیۆپۆلیتیك باش نییە"، بەڵام هاوکات شێوازێك لە بابەتەکەدا پەیڕەو دەکات کە پشت بە شیکردنەوەی رەخنەیی لۆکاڵ دەبەستێت (واتا، دەرخستنی

جیاوازییە نێوخۆیی و هەرێمایەتییەکان)، و هەرەوها پشت ئەستوورە بە پەیوەندیی نێوان زانیاری جوگرافی و پراکتیزەکردنی سیاسی.

ئەگەر جیۆپلیتیك بە شایستەی لێکۆڵینەوەی زیاتر بزانین، هۆکارەکەی ئەوەیە کە سەرنجێکی زۆری لەسەر هەردوو ئاستی ئەکادیمی و گشتی بۆ لای خۆی راکێشاوە کە هەمیشە بایەخی کەمیان بە مێژووە هزریە پڕ لە مشت و مڕەکەی داوە. ئەوەتا دەبینین کە سەرۆك و سەرۆك وەزیرەکان و رەخنەگران بە هەمان رادده ئارەزووی بەکارهێنانی دەکەن. جیۆپۆلیتیك یارمەتی شرۆڤە کردنی دۆخی جیهان بە شێوەیەکی سادەو ساکار دەدات، لە نموونەی چوارچێوەی جوگرافیی وەکو "جیهانی سێیەم" کە هەمیشە بایەخی بەرچاوی خۆی هەیە. هەروەها یارمەتی بەکارهێنەرانی دەدات لە پێشبینی کردنی رەوتی ئایندەی سیاسەتی جیهانی. لەولاشەوە رۆژنامەنووسان و لێکۆڵەرەوە ئەکادیمییەکان زاراوەکە بەکار دەبەن بۆ هەڵسەنگاندنی گۆڕانکارییە سەرەکییەکانی ئایندە وەکو پێکدادانی شارستانییەتەکان، سەرهەڵدانی چین وەکو هێزێکی تازەی جیهانی، کۆتایی مێژوو (و جوگرافیا)، سەدەی تازەی ئەمریکا، و یان ئەو بۆچوونەی دەڵێت چارەنوسی ئەمریکییەکان و ئەوروپییەکانە کە بە هەڵە لە یەکتر تێ بگەن، چونکە دەستیان بەسەر دوو جیهانی جوگرافیی جیاوازدا گرتووە.

## ئەنجام گیریی

بەشی کۆتایی ئەم چاوخشاندنە خێرایە بە زاراوەی جیۆپۆلیتیکدا وەکو زاراوەیەکی هزری، جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا و ئەو شوێنانەی دیکە کە بە زمانی ئینگلیزی دەدوێن. وەکو ئەوەی لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەی پێ کرا،پێویستە بە وریایەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم بابەتەدا بکرێت. بەڵام، ئەگەر ئەم بەشە تەرکیزی لەسەر ئەزموونەکانی ئەمریکای باشوور بکردایە، ئەوا لایەنێکی زۆر جیاواز دەردەکەوت و ئەو کاتە پێویست دەبوو بە هەمان رادده بایەخ بە بەناو و شورەیی نازییەت بدرێت.

بە درێژایی ماوەی دوای ساڵی ١٩٤٥، لە شوێنەکانی وەکو ئەکادیمیا سەربازییەکانی ئەرجەنتین و بەرازیل و چیلی و پارگوای کە پەیوەندیی پتەویان لەگەڵ لایەنە سەربازییەکانی ئیتاڵیا و ئەڵمانیا هەبوو، کارمەندانی سەربازی بەردەوام بوون لە وانە وتنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەم لە بواری جیۆپۆلیتیکدا. هاوکات نوسینە جیۆپۆلیتیکییە ئەڵمانییەکان وەردەگێڕدرانە سەر زمانەکانی ئیسپانی و پورتوگالی، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە جوگرافیناسە ئەمریکییەکان سوودیان لە هاوکارەکانی

خۆیان له بەشەکانی دیکەی جیهان وەردەگرت بۆ ئـەوەی خۆیـان لـە بـەکارهێنانی ئـەو زاراوەو مانـا ترسناکەکانی بپارێزن.

ئیتر له کیشوەری ئەوروپا که له بەشی زۆری ماوەی جەنگی ساردا رژێمـە سـەربازییەکان تێیـدا بالاّدەست بوون، زاراوەی جیۆپۆلیتیك بـە بـێ تـرس لـە بەسـتنەوەی بـە نازییـەت و سیاسـەتەکانی بەرفراوانکردن، گەشەیەکی زۆری بەخۆوە بینی.

بێگومان له یەکێتی سۆڤێتی پێشوو،جیۆپۆلیتیك بەوە تاوانبار دەکرا که لـە رووی ئایدۆلۆجییـەوە بە نازییەت "لەکەدار کراوە"، بۆیە هیچ پێشوازییەك لەم بابەخدانە بە زاراوەکە نەدەکرا بە تایبـەتییش لە هەشتاکانی سەدەی رابردوودا. هەرچەندە لە روسیای دوای یەکێتی سـۆڤێت بایـەخێکی زیـاتر بـەم بابەتە دەدرێت، بەلاّم یادەوەری جەنگی دووەمی جیهانیی و زیانە گیانییـەکانی سـۆڤێت تێیـدا رۆڵـی خۆی هەبووە لە دروستبوونی کاردانەوەی ئەکادیمی بۆ ئەم بایەخ پێدانە تازەیە لە ئـەمریکای بـاکوور و ئەوروپای رۆژئاوا. بەلاّم وا دیارە دوای پەنجا ساڵ، ئیتر نەنگیی و شورەیی لەسەر زاراوەکە هـەڵگیراوەو نەوەیەکی تازەی رووسی که بە زۆریی راسـترەوە،هاوکات لـە گـەڵ خـەڵکی تـری وەکـو لێکۆڵـەرەوە ئۆزبەکییەکان نوسینی جوگرافیناسی پێشووی خۆیان وەکو "هـالڤۆرد ماکنـدەر" بـەکار دەهێـنن بـۆ شیکردنەوەی چارەنووسی جیۆپۆلیتیکیی ولاّتەکەیان.

ئەڵبەتە ئەو بوارەی که بایەخی زیاتری بۆ خۆی مسۆگەر کردووە، بریتییە لە گرنگیی سـتراتیجیی ئاسیای ناوەڕاست و دەرکەوتنی ئەوەی پێی دەوترێت "یارییە گەورەکان" لـە نێـوان ئـەمریکاو چـین و روسیا. ئەمریکا و چین کار بۆ ئەوە دەکەن کە پەرە بە وەبەرهێنانی سەربازیی و سەرچاوەیی خۆیان لـە ناوچەیەکدا بدەن کە دەوڵەمەنـدە بـە نـەوت و گـازی سروشـتیی لـە دەریـای قـەزوێن (یـان دەریـای خەزەر)دا.

دوا خاڵیش کە پێویستە دووپات بکرێتەوە، ئەوەیە کە ناکرێت هەڵە تێگەیشتن هەبێت لـە بەشـی تایبەت بە جیۆپۆلیتیکی رەخنەیی تەنها لەبەر ئـەوەی گروپێکـی بچـووك لـە پسـپۆڕانی ئـەمریکاو شوێنەکانی تر خۆیان وەکو پسـپۆڕی جیۆپـۆلیتیکی رەخنـەیی دەناسـێنن. لـە زۆربـەی ولاّتانـدا بـە ئەمریکاشەوە، بەشی زۆری ئەوانەی زاراوەکە بەکار دەهێنن،بایەخێکی کەم بە تێگەیشتن لـە مێـژووی هزریی شێوێنراوی جیۆپۆلیتیك دەدەن. هەروەها زاراوەکە وەکو کورتکراوەیەك بەکار دێـنن بـۆ ئـەوەی جۆرێك لە شکۆمەندیی بدەنە بەرهەمەکانیان. بۆ نموونـە نوسـەرانی وەکـو لێکۆڵـەرەوەی بـەناوبانگی ئەمریکی "تۆماس بارنیت"ـــــبە هەمان شێوەی نوسەرانی پێشـووی جیۆپۆلیتیـكـــــبانگەشـە بـۆ ئەوە دەکات کە دەتوانێ بە چاوی رەخنەگرانـەوە جیهـان ببینێـت و پێشـبینی متمانەبـەخش بکـات

سەبارەت بە ئایندەی ئەو جیهانە بە قازانجی ولاتێکی دیاریکراو لـە بەرامبـەر ولاتێکـی تـردا. بـەلاّم ئامانجی نوسەرانی رەخنەی جیۆپۆلیتیکی بریتیە لە وردبینی کردنی ئەو بانگەشە (ئیـدعایان) ە و لـە کاتی گونجاویشدا پێشنیارکردنی رێگای جوگرافی گونجاو بـۆ تێگەیشـتن لـە سیاسـەتی جیهـانی. بـۆ نموونە، لەوانەیە ئەم پێشنیار کردنانە خالّی جیاواز لەخۆ بگرن، وەکو بایەخـدانی زیـاتر بـە ئاسایشـی مرۆیی و سروشتی جەندەریی بۆ جۆپۆلیتیکی جیهانی. ئەمەش مانای وایـە کـە هەمیشـە منـداڵ و ئافرەتان زیاتر روو بەڕووی توندوتیژیی جیۆپۆلیتیکی و نایەکسانیی جیۆ- ئابووری دەبنەوە.

ئەم نوسینەش بە ئامانجی رزگارکردنی دانیشتووانە لـە پێکهاتـەی جیۆپـۆلیتیکی داپلۆسـێنەر و هێنانەدی تێگەیشتنێکی جوگرافی بۆ جیهانێك کە رادەیەکی زیاتر لە یەکسانی بەخۆوە ببینێت. بـۆ ئەم مەبەستەش، بابەتەکانی گرنگیدانی زیاتر بە سروشـتی جەنـدەریی بـۆ جیۆپـۆلیتیکی جیهـانی و نایەکسانیی جیۆ-ئابووری لە سیستمی بازرگانیی جیهاندا بەخۆوە دەگرێت.

# بەشی سێیەم
# نەخشەی جیۆپۆلیتیکی

لەم ساڵانەی دواییەدا زاراوەی جیهانگەرایی گرنگترین کورتکراوە بووە کە لە لایەن سەرکردە سیاسییەکان و رۆژنامەنوسان و لێکۆڵەرەوە ئەکادیمییەکانەوە بەکار هاتووە بۆ وێنا کردن و روونکردنەوەی گۆڕانکارییە ئابووری و سیاسییەکانی جیهان. لە ساڵانی هەشتاکانیشەوە زاراوەکە باڵی بەسەر نێوەندە ئەکادیمییەکان و بازنەکانی دروستکردنی بڕیاردا کێشاوە، هەر بۆ نموونە سەرۆك بیلّ کلنتون لە نەوەتەکاندا بە زۆری بەکاری دەهێنا. لە چوارچێوەی ئەو گفتوگۆیانەشدا، هەمیشە وا دادەنرا کە جیهانگەرایی جیهانی چواردەورمان بۆ شێوەی حکومەت و ئاژانسەکانی وەکو رێکخراوی بازرگانیی جیهانیی و نەتەوە یەکگرتووەکان و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی دەگۆڕێت کە هەوڵ دەدەن بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ ئەم بارودۆخە گۆڕاوەدا. لە ئەنجامیشدا سنوورە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەکان کەمتر رۆڵ دەبینن لە پرسە مرۆییەکاندا بە رادەیەك کە لێکۆڵەرەوەی وەکو ریچارد ئۆبرەین ئاماژە بە "کۆتایی جوگرافیا" دەکات.

ئەم بەشە، لە جێگای ئەوەی هاودەنگیی بۆ بۆچوونەکەی سەرەوە دروست بکات، ئەو راستییە روون دەکاتەوە کە چۆن جیهانگەرایی شان بە شانی نەخشەی جیۆپۆلیتیکی لە پێکهاتە جوگرافییەکاندا دەردەکەوێت، لەو پێکهاتانەی کە وڵاتن، و هەروەها ئەوانەی پێناسەی وڵاتیش نایانگرێتەوە. ئەو دوو چەمکەش نەك تەنها گرنگیی سنوورو و هەرێمەکان ناسرنەوە، بەڵکو رۆڵی خۆیان دەبینن لە دووبارە دارشتنەوەی پێکهاتەکان بە شێوەیەکی دینامیکی. لە سەردەمی دوای شەڕی ساردیشەوە، شێوازی رێکخستنی ئەم جیهانەو پێناسە کردنی رۆڵ و بەرپرسیارێتی رێکخراوەکانی وەکو نەتەوە یەکگرتووەکان و هەروەها بەڕێوەبردنی وڵاتان، کەوتوونەتە ژێر وردبینیی زۆرەوە.

> کاتێ کۆمۆنیزم رووخا، دیواری بەرلین رووخا و ئابووری بە راستی بوو بە ئابووری جیهانیی، ئەمریکا و نەتەوە دەوڵەمەندەکانی تر سوودی گەورەیان چنییەوە. بەڵام بە بۆچوونی،من رێژەیەکی زۆر کەم لە خەڵك بیریان لە بەدی هاتنی ئەم جیهانە تازە کردبووەوە کە ئێمە خۆمان تێیدا دەبینینەوە، جیهانێك کە نەك تەنها بە خەسڵەتی ئابووری جیهانیی دەناسرێتەوە، بەڵکو کۆمەڵگای زانیاری جیهانییشی بەرهەم هێناوە.کاتێك وەکو سەرۆك لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٩٣ سوێندی یاساییم خوارد، تەنها ٥٠ سایتی ئەلیکترۆنی هەبوون. بەڵام کە پۆستەکەم جێهێشت، ژمارەی سایتەکان گەیشتە ٣٥٠ ملیۆن و هەر لە هەڵکشانیشدا بوو. ئێستا لەوانەیە ژمارەیان گەیشتبێتە ٥٠٠ ملیۆن.
>
> (بیلّ کلینتون، زانکۆی کالیفۆرنیا، کاننونی دەەمی ٢٠٠٢ )

بەلاّم پێویستە بزانین جیهانگەریی چییە؟ دیارە ئەم زاراوەیە ئاماژە بە جموجوڵی خەڵك و بیرو بۆچوونەکان و تەکنەلۆجیا و شت و مەکەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەکات، هاوکات لەگەڵ ئاماژەکردن بە پەیوەندییە مرۆییەکان. لەوەتای سەدەکانی (١٥ ) و ( ١٦ ) ەوە، ئەم جووڵەیە زیادی کردووە و کاریگەریی زۆریشی خستووەتە سەر دانیشتووان لەو شوێنانەی کە دواتر بە جیهانەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم ناسران. ولاّتانی وەکو هۆڵەندا و پورتوگال و ئیسپانیا و بەریتانیا و فەرەنسا لە سەرەتایترین ئەو ولاّتانەن کە پرۆسەی جیهانگیرییان دەست پێکرد و دواتریش "روو بەڕوو بوونەوەی کۆلۆنیالی" بووە سەرەتایەك بۆ بازرگانی کردن بە شت و مەك و خەڵکەوە کە بازرگانی کردن بە بەندەکانەوە دیارترین وێنەی ئەم کارەیە. لەولاشەوە پێکهاتە جیهانگەراییەکانی وەکو "کۆمپانیای رۆژهەلاّتی هندی هۆڵەندی"، بەشدار بوون لە دروستکردن و بەڕێوەبردنی ئەم تۆڕە بازرگانییانە بە پاڵپشتی ئەو ولاّتانەی کە سەرپەرشتییان دەکردن. بەلاّم لە سەدەی (١٩) دا ئەمریکا وەکو هێزێکی تازەی جیهانی هاتە مەیدانەوەو رۆڵی خۆی دەرخست لە پرۆسەی هاتوچۆکردنی خەڵك و شت و مەك و بیرو بۆچوونەکان بە درێژایی ناوچەی کاریبی و زەریای هێمن. کاتێکیش لە هەمان ماوەدا ئابووری جیهان زیاتر شێوەی ماددی بەخۆوە گرت، هەست بە پێویستی زیاتر دەکرا بە هەماهەنگیی نێودەوڵەتی لە نێوان ولاّتاندا. ئەوەبوو لە ساڵی ١٨٨٤دا کۆنفراسی مێریدیانی نێودەوڵەتی هێڵی "گرینچ"ی وەکو یەکەم هێڵی ناوەڕاست دامەزراند، و بەمەش بووە هۆکارێك بۆ نەخشەیەکی تازەی جیهان کە کۆدەنگیی گشتیی لەسەر دروست ببێت.

دیارە لە سەدەی بیستەمیشدا نیشانەکانی پەیوەندیی پتەوتری کۆمەلاّیەتی و سیاسی و کلتوری دەرکەوتن، بەهۆی پێشکەوتنی بەرچاو لە فڕۆکەوانی و ئۆتۆمبیل و هۆیەکانی تری پێکەوە گرێدان. لە کۆتاییشدا، کاتێ سیستەمی نێودەوڵەتی زیاتر فراوان و قووڵ بووەوە، ئیتر جوگرافیا بە مانا فیزیکییەکەی وەکو بابەتی گرنگ بوونێکی بۆ نەمایەوە. بەلای رۆژنامەنووس "تۆماس فریدمان" ەوە ساڵی ٢٠٠٠ ساڵی بەرزترین ئاستی جیهانگەرایی بوو، چونکە تێیدا تەکنەلۆجیای زانیاری و ئینتەرنێت خەڵکی زیاتر لەیەك نزیك کردەوە.



٨. بارەگای کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هندی هۆڵەندی، باباڤیا - جاکارتا - ئەندەنوسیا.

هەرچەندە هاوشێوەی "کۆتـایی مێـژوو"، بانگـەواز بـۆ "کۆتـایی جوگرافیـا"ش دەکـرا، بـەڵام جوگرافیا جیاجیاکانی جیهانگەرایی تیشـکی زیاتریـان خسـتە سـەر گرنگیـی سـنوورەکان و ناوچـە دوورەکان و پەیوەندییە هەمەلایەنییەکان و بەرپرسیارێتییەکانیش. لەوەتای سەدەی (١٧) شەوە وڵاتـە ئەورووپییەکان و (دواتریش ئەمریکا) چـالاکانە هـەوڵیان دەدا بـۆ دامەزرانـدنی پەیوەنـدی لـە نێـوان نەتەوەکان کە هاتوچۆی خەڵك و شت و مەك و دراو و ئایدیاکانی لە نێوان ئەو نەتـەوەو وڵاتانـەدا بـە دوای خۆیدا دەهێنا. وەکو ئەوەی "جێرت گـۆنگ" ئامـاژەی پـێ کـردووە، سـەدەی (١٩) دەرفـەتی تەواوی خولقاند بۆ دامەزراوەکانی تایبەت بە شارستانیە جیهانییەکان تـا یارمـەتی وڵاتـان بـدەن بـۆ دەستنیشانکردنی شێوازی ئێستاو ئایندەی سیستمە نێودەوڵەتییـەکان و هـەروەها بـۆ ڕوونکردنـەوەی ئەو پێوەرانەی کە لە ڕێگایانەوە وڵاتە تازەکان بە فەرمی دەناسران، دوای ئەوەی شێوازێکی تایبـەتیان لە سەروەریی بۆ خۆیان مسۆگەر دەکرد. دوا شـێوازییش لـە دووتـوێی ئـەو شـێوازانەی بـاس کـران، تـوخمێکی کاریگـەرە بـۆ جیهانگـەرایی، چـونکە ڕۆڵێکـی سـەرەکیی لـە دابینکردنـی "ڕێسـا" و "پێشبینییەکان" بۆ سیستمی جیهانیی دەبینێت. وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا وەکـو هێزێکـی گەورەی جیهان، لەم دواییـەدا دەستپێشـخەر بـووە لـە دامەزرانـدنی ئـەم جـۆرە سیسـتمە یاسـاییە جیهانییەدا. ئەوەتا دەبینین ئەمریکا چەند کاریگەر بوو لە دروسـتکردنی دامـەزراوەکانی دوای سـاڵی

١٩٤٥، وەکو نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕاگەیاندنی جیهانیی مافـەکانی مـرۆڤ لـە سـاڵی ١٩٤٨. بـۆ نموونە لە پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە کە وڵاتان ڕازین بەوەی ئەنجومەنی ئاسایش بڕیـار بدات کە چی هەڵس و کەوتێکی وڵاتان دەبێتە مایەی هەڕەشـە بـۆ سـەر ئاشـتی و سـەقامگیری لـە جیهاندا . هەروەها بە پێی هەمان پەیماننامە، پێویستە وڵاتان پابەند بـن بـە هـەر بڕیـارێکی نەتـەوە یەکگرتووەکان لەو بارەیەوە. بە شێوەیەکی گشتگیر تر بڵێین، هەمیشە بۆشـاییەك هـەبووە لـە نێـوان سەروەریی یاسایی و سەروەریی دیفاکتۆدا، بە واتای ئـەوەی کـە سـەروەرییەکە زۆر جـار شـێوێنراوە، دابەش کراوە، یان هاوبەش بووە لە نێوان زیاتر لە یەك وڵاتدا.

هەر وەکو چۆن لەم ساڵانەی دواییەدا ڕوون بووەوە، ئیدارەی جۆرج دەبلیو بـۆش (٢٠٠١-٩ ٢٠٠) بەوە تۆمەتبار دەکرا کە بایەخی بـەم پێکهاتـە ڕێگرانـە نـەداوە، لـە کاتێکـدا کـە هـەوڵی دەدا بـۆ کۆنترۆڵکردنی جموجوڵی تیرۆریستان و سەرچاوەی داهاتەکانیان. هەرچەندە سیاسەتەکانی بـوش بوونـە هۆی کەمبوونەوەی ڕووداوی تیرۆریستی لە ناو ئەمریکادا، بەڵام ئەو سیاسەتانە سەرکەوتوو نەبوون لـە ڕێگا گرتن لە ڕوودانی زیـانی گیـانیی زۆر،و هـەروەها لـە زیـان کـەوتن بـە ژێرخـانی ئـابووری لـە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ناوەڕاستی ئاسیا بە هۆی کردەوە تیرۆریستیەکانەوە. لەوەش گـرنگتر، ئیـدارەی بوش هەوڵی بۆ ئەوە دەدا کە جیهان دووبارە دابەش بکاتەوە بەسەر چـەند ناوچـەیەکی سـادەی وەکـو "جەمسەری شەڕ". بۆیە یەکێك لە شێوازەکانی ئەمریکا بۆ ڕاگرتنـی جموجـوڵی خـەڵك و داهـات و شت ومەکەکان، بریتی بوو لە هەوڵدان بۆ لەکارخستنی چەند ناوچەیەکی جـوگرافی بـەهیوای بـرەودان بە بیرۆکەی سەقامگیریی جیۆپۆلیتیکی و زامنکردنی کلتوری لەسەر ئاستی جیهان.

دیارە زاراوەی نەخشەی جیۆپۆلیتیکی بۆ باسکردنی ئەو ڕێگایانـە بـەکار هێنـراوە کـە وڵاتـان و ڕێکخراوە ناحکومییەکان بەکاریان بردووە بۆ دەستگەیشـتن و بـەڕێوەبردن و ڕێکخسـتنی پەیوەندییـە هەرێمایەتییەکان کە لە ئەنجامدا دەبێتـە مایـەی دەستنیشـانکردنی سـنووری نێـوان: نـاوەو دەرەوە، هاووڵاتی و بیانی، و خۆماڵی و نێودەوڵەتی. بۆ نموونە، وڵاتان هەوڵێکی زۆر دەدەن بـۆ کـۆنترۆڵکردنی سنوورەکانیان لە ڕێگای دانانی خاڵی هاتن و چوون لەسـەر سـنوورە نێودەوڵەتییـەکانیان. دیـارە ئـەم شێوازە لە کۆنترۆڵکردنی سنووریش دەبێتە خاڵێکی گرنگ بـۆ نیشـاندانی سـەروەرییەکی کاریگـەر و ڕاستەقینە بۆ ئەو وڵاتە. بۆ نموونە، لە هاوینی ٢٠٠٦دا، حکومـەتی بـەریتانیا چـەند ڕێوشـوێنێکی ئاسایشیی لە سەرجەم فڕۆکەخانەکانیدا گرتەبەر، کاتێك پلانی تەقاندنەوەی چەند فڕۆکەیەك لەو وڵاتـە ئاشکرا بوو. ئەم هوشیاری دانە ئاسایشییەش بـوو بـە بیانوویـەك بـۆ دەسـتپێکردنی زنجیرەیـەك لـە ڕێوشوێنی نوێ بە مەبەستی چاودێری وردبینی کردنی ئەو گەشـتیارانەی نیـازی هاتنـە نـاو وڵاتیـان

هەبوو یان بەریتانیایان بەجێ دەهێشت. هەرچەندە زووە بۆ بڕیـاردان لەسـەر رادەی کاریگـەریی ئـەو ڕێو شوێنانە، بەڵام کۆنترۆڵکردنی جموجوڵی ڕێبواران لە ناوچەیەکی دیاریکراودا، یەکێکـە لـە شـێوازە ئاشکراو بەرچاوەکانی نەخشەی جیۆپۆلیتیکی.

لەبەر ئەو هۆکارانە، دەکـرێ بڵـێین کـە چـەمك و پرۆسـە پەیوەندیـدارەکان بـە جیهانگـەرایی و سەروەریی و یاسای نێودەوڵەتییەوە،هۆکاری سەرەکیین بـۆ دروسـتبوونی نەخشـەی جیۆپـۆلیتیکی لـە سیاسـەتی جیهانیـدا. دیـارە سیسـتمی نێودەوڵـەتی کـە لەسـەر پێکهاتـەی ولاتـان و پرنسـیپە پەیوەندیدارەکانی وەکو سەروەریی تایبەتی و دەست تێوەرنەدان بونیـاتنراوە، بـە تێپـەڕبوونی کـات و گۆڕینی شوێن گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. ئیتر بەمەبەستی تێگەیشتن لەو گۆڕانکارییانـەو جێبـەجێ کردنیان لە چوارچێوەی تیۆرە کردنی جیۆپۆلیتیکیدا، پێویستە دوو بابەتی بنەڕەتی لەبەر چاو بگیرێن:

یەکەم: زاراوەی سەروەریی و چۆنێتی گوزارشت لێ کردنی لە چالاکییەکانی دەوڵەتدا.

دووەم: نەخشەی جیۆپۆلیتیکی لە سەدەی بیستەمدا کە دروستبوونی ژمارەیەکی زۆرتر لە ولاتی نوێی بەخۆیەوە بینی، بە بەراورد لەگەڵ ماوەکانی پێشوودا. هەروەها لەو سەدەیەدا پاڵەپەستۆیەکی گەورەتر لە لایەن ولاتە جیاجیاکان و ڕێکخراوە ناحکومییەکانەوە هاتە کایەوە.

## جیۆپۆلیتیکی سەروەریی نەتەوەیی و سیستمی نێودەوڵەتی

ئەو بیرۆکە و پراکتیزەکردنانەی کە پەیوەندیدارن بـە سـەروەرییەوە، زۆر گـرنگن لـە دروسـتبوونی نەخشەیەکی جیۆپۆلیتیکیی بونیاتنراو لەسەر ولاتان، سنورەکان، و یان هەرێمە نەتەوەییـەکان. وەکـو ئەوەی "ستیفن کراسنەر" یش ئاماژەی پێ کـردووە، هەرچـەندە حکومەتـە نیشـتمانییەکان دان بـە گرنگیی سەروەریدا دەنێن، بەڵام بە بەردەوامی ئەو بیرۆکەو پرنسیپانە پێشێل دەکەن کـە تایبـەتن بـە سەروەری و لە دووتوێی پەیماننامەی دامەزراندنی نەتەوە یەککگرتووەکاندا جێگایـان کراوەتـەوە. دیـارە داگیرکردنی عێراق لە لایەن ئەمریکاوە لە ساڵی ٢٠٠٣ تازەترین نموونەیـە بـۆ ئـارەزووی ولاتـان لـە پێشێلکردنی سەروەریی نیشتمانیی ولاتانی تر، لە کاتێکدا پێداگیریی لەسەر گرنگیی یـەکێتی خـاکی ولاتان دەکەن. ئەڵبەتە نموونەی زۆرتر هەن کە ئاماژەیان پێ بکرێت وەکو داگیرکردنی کوێت لـە لایـەن ڕژێمی سەدام لە ساڵی ١٩٩٠ و داگیرکردنی یەکێتی سۆڤێت بۆ ئەفغانستان لە ساڵی ١٩٧٩. هەنـدێ جاریش حکومەتەکان بە ئارەزووی خۆیان ڕێگـا دەدەن بـە پێشـێلکردنی سـەروەریی ولاتـەکانیان لـە ڕێگای هاندانی هاتوچۆی سەرمایەو خەڵکی پسپۆڕ و ئایدیا تازەکان بۆ نـاو ولاتـەکانیان. بـۆ نموونـە، لەوەتای یەکێتی ئەوروپا فراوان کراوە،حکومەتی بەریتانیا هـانی کۆچـکردنی هێـزی کـار دەدات لـە ولاتانی وەکو (پۆڵەندا) و (سلۆڤاکیا) وە. لە هەندێ حاڵەتی تردا، حکومەتەکان خۆیـان داوای دەسـت

تێوەردانی مرۆیی یان سەربازی لە وڵاتەکانیاندا دەکەن، کاتێك رووبەڕووی ئـازاری زۆر و پێشـێلکردنی گەورەی مافەکانی مرۆڤ دەبنەوە. ئەو حاڵەتەی کە رووبەڕووی حکومـەتی( بۆسـنیا ) ش بـووەوە لـە ساڵی **١٩٩٢** نمونەیەکی تراجیدییە، چونکە ئەو وڵاتە توشی دەست درێژیی سـەربازیی سـربیا هـات و هانابردنی بۆسنییەکان بۆ یەکێتی ئەوروپا و نەتەوە یەکگرتووەکان هـەتاکو سـاڵی **١٩٩٥** بـێ ئـەنجام مایەوە. بەڵام لەو ساڵەدا بڕیاردرا بە کۆتایی هێنـان بـە داگیرکردنـی خـاکی بۆسـنیا و دەسـتدرێژیی کردنە سەر دانیشتوانەکانی لە لایەن سربەکانەوە، ئـەویش لـە رێگـای هـەڵگرتنی گـەمارۆی چـەك و ناردنی هێزێکی سەربازیی گەورەی ناتۆ بۆ ئەو وڵاتە. لەو کاتەوە پلانی ئاشـتیی دایتـۆن بـۆ بۆسـنیا دارێژراوە و لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە چاودێری دەکرێت.



٩. پردی بەناوبانگی سەدەی( ١٦ )هەم بە رووخاوی. مۆستار-بۆسنە- ١٩٩٣/١١/١٠.

بەڵام پێویستە لە هەر بیرکردنەوەیەکدا دەربارەی سەروەریی، جیاوازیی لـە نێـوان چـوار جـۆر لـە لێکدانەوە بکرێت:

یەکەم: چاودێران بەردەوام ئاماژە بە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتی دەکەن لە شـێوازی ئەنـدامێتی وڵاتان لە نەتەوە یەکگرتووەکان و توانای گفتوگۆ کـردن و پەسـەندکردنی پەیماننامـەکان، بێجگـە لـە کاروباری گشتیی پەیوەندیدار بە بواری دیبلۆماسییەوە. دیـارە یـەکێك لـە خاڵـە بنەڕەتییـەکان لـەم

چوارچێوەیەدا بریتییە لەوەی وڵاتێك بتوانێت وڵاتێكی تر بە فەرمی بناسێت. ئەمەش مانای وایە ئەو وڵاتە توانای مامەڵە كردنی لە چوارچێوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكاندا هەیە. ئیتر هەتاكو ئەگەر وڵاتانی تر رقیشیان لەو وڵاتە و سەركردایەتییە سیاسییەكەی بێت، تەنها ئەو بە فەرمی ناسینە بۆ خۆی گرنگ و چارەنوسسازە بۆ وڵاتەكە. بۆ نموونە، لە چەند حەفتەو مانگێكی پێش داگیركردنی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا، ئەمریكا و هاوپەیمانەكانی ناچار بوون دانوستان لە گەڵ نوێنەری دیبلۆماسیی سەدام حوسێن لە نەتەوە یەكگرتووەكاندا بكەن.

لە هەندێ حاڵەتی تردا، لەوانەیە بەشێك لە وڵاتان توانای وڵاتی تر نەزانن لە رووی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكانەوە، چونكە وای دادەنێن كە ئەو وڵاتانە ناتوانن ئیدارەی هەرێمە نیشتمانییەكانی خۆیان بكەن، ئیتر چۆن بتوانن مامەڵە لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا ئەنجام بدەن. ئەوەتا زاراوەی وەكو "وڵاتە شكست خواردووەكان" و "نیمچە وڵاتەكان" بەكار دەهێنرێت بۆ ئاماژە كردن بەوەی كە هەندێ وڵات لە ناوچەكانی وەكو رۆژئاواو ناوەڕاستی ئەفریقا نە دەتوانن كۆنترۆڵێ تەواویان بەسەر خاكی خۆیاندا هەبێت و نە رێوشوێنی یاساییش بۆ هاووڵاتیانیان مسۆگەر دەكەن. بە شێوەیەكی تر بڵێین، وڵاتانی رۆژئاوا هەمیشە ئەوە دووپات دەكەنەوە كە وڵاتانی وەكو سۆماڵ و كۆماری دیموكرتیی كۆنگۆ وڵاتی ناتەواون و یان ناتوانن رێگا لە هاتوچۆی ماددەی هۆشبەر و پارەو چەك و تەقەمەنی لە وڵاتەكانیاندا بگرن.

بەڵام گرنگە ئەوەمان لەبیر بێت كە نوسەرانی بواری جیۆپۆلیتیكی وەكو (كجیلین) ئەو چەمكە تەواو یاساییە دەربارەی سەروەری رەت دەكەنەوە، چونكە ئەو راستییە لە بەرچاو ناگرێت كە جوگرافیای سیاسەتی جیهانی تا رادەیەكی زۆر گۆڕاو و جۆراوجۆرە. بۆیە زاراوەی وەكو "وڵاتە شكست خواردووەكان" نیمچە دانپێدانانێكە بەو راستییەی كە توانای وڵاتان لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر دەگۆڕێت، هەتاكو ئەگەر بە هەمان شێوە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیی بەفەرمییش بناسرێن.

<u>دووەم:</u> لەوانەیە سەروەریی وا لێك بدرێتەوە كە مەرجی پشت بەیەك بەستنی تێدایە. ئیتر لەسەردەمی جیهانگەرابیەكی تۆكمە و بەهێزدا، دەكرێ وای دابنێین كە وڵاتان كۆنترۆڵێكی بێ پێچ و پەنایان بەسەر ناوچەكانی خۆیان و هەموو جموجوڵەكان لەو چوارچێوەیەدا هەیە. هەتاكو بەهێزترین وڵاتانی جیهانیش وەكو ئەمریكا و چین پێویستە لەسەریان (هەر یەكەو بە شێوازی خۆی)، دان بەو راستییەدا بنێن كە هەرچەندە پشت بەیەك بەستن سەروەریی وڵاتان بەتەواویی لەناو نابات، بەڵام سیاسەتی وڵاتان و پرۆسەی دارشتنی ئەو سیاسەتە دەگۆڕێت.

لە هەندێك بواری ژیانی کۆمەڵایەتییشدا وەکو ئەوانەی کە مۆرکی ئاسایشــی نیشــتمانییان پێــوە دیارە، وڵاتان هەوڵیان داوە پەنا بۆ پشت بەیەك بەستن ببەن لە ڕێگای بەهێزکردنی کۆنترۆڵی حکــومی و یان هەرێمایەتی، وەکو کۆنترۆڵکردن و وردبینی کردنــی دیــاردەی کۆچــکردن، لــە کاتێکــدا کــە لــە بوارەکانی وەکو پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و هەماهەنگیی ئــابووری، لــە ســەروەریدا هاوبــەش دەبــن. ئەمەش جار بەجار بە "سەروەریی نیمچەیی" ناوزەد دەکرێت.

> دیارە کۆدەنگییەکی جیهانی هەیە بەوەی کە تایبەتمەندیی جیهانی مۆدێرن بریتییــە لــە پشــت بەســتن بــە یــەکتر. بەڵام تا ئێستا کاتی پێویستمان بەدەستەوە نەبووە بۆ ئەوەی بیر لە دەرەنجامەکانی بکەینــەوە، یــان لــەو ڕاســتییە بگەین کە کتێبی یاسای نێودەوڵەتی لەبەر یەك هەڵوەشاوەتەوە.
> (سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، تۆنی بلێر، بۆینس ئایرس، ٢٠٠٥)

سێیەم: دەکرێ سەروەریی لەسەر ئاستێکی نێوخــۆیی رووت پێناســە بکرێــت، و وا دابنرێــت کــە هەندێك وڵات لە رووی کۆنترۆڵکردنی سنوورە نیشتمانییەکانیانەوە لە وڵاتانی تر باشترن. لەم بارەیــەوە بەراورد کردنی ئەمریکا لەگەڵ کۆماری دیمــوکراتیکی کۆنگــۆ زۆر زەق و بەرچــاوە، چــونکە لــەوەتای کۆتایی نەوەتەکانەوە، کۆنگۆ بەدەست زنجیرەیەك لە ململانێوە دەناڵێنێت کــە بوونەتــە هــۆی مردنــی ملیۆنەها کەس لە خەڵکی ئەو وڵاتە و ڕفاندنی بەکۆمەڵی ئافرەتان و کچان، بێجگــە لــە وێرانکردنــی ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکان. حکومەتی کۆنگۆش کە بارەگاکەی لە کینشاسای پایتەختە، نــەیتوانیوە کۆنترۆڵێکی کاریگەری بەسەر ناوچەو هەرێمەکانی وڵاتدا هەبێت، ئەمەش بوو بە هاندەر بــۆ وڵاتــانی تر تا بەشداری لە درێژەدان بە نائارامی لەو وڵاتەدا بکەن لە ڕێگای دابینکردنی سەرچاوەی داراییــی بــۆ میلیشیا جیاوازەکان. لە سەردەمی شەڕی ساردیشدا، ئەو وڵاتە کە پێشتر بــە (زائــیر) ناســرابوو، لــە لایەن ڕژێمێکی پلوتۆکراتییەوە بــە ســەرۆکایەتی مۆبوتــو (١٩٥٦-١٩٩٧) بــەڕێوە دەبــرا، و چــەند حکومەتێکی وەکو ئەمریکا پاڵپشتییان دەکرد، چونکە بە هاوپەیمانێکی چالاکی دژە کۆمۆنیستی لــە ناوەڕاستی ئەفریقا هەژمار دەکــرا. مۆبوتــوش تــوانی جۆرێــك لــە ســەروەریی نــاوخۆیی لــە وڵاتــدا بخولقێنێت، چونکە هێزی سەربازی تۆکمەی بەکار دەهێنا (کە پاڵپشتیی داراییــی لــە ڕێگــای هــەناردە کردنی نەوت و کانزاکانەوە بۆ دابین دەکرا) بۆ سەرکوتکردنی هەر جۆرێك لە ئۆپۆزســیۆن و نائــارامی. بەڵام بە مردنی مۆبوتو لە تاراوگە لە وڵاتی مەغریب لە ساڵی ١٩٩٧، ئەو دۆخە ئارامە بــە تــەواوی گۆڕا و کۆتایی پێ هات.

بە هەرحاڵ، هەتاکو وڵاتانی بەهێزی وەکو ئەمریکاش کە خاوەن ژێرخانی سەقامگیر و پێکهاتــەی ئیداریی تۆکمەن، هەر لە هەوڵی بەردەوامــدان بــۆ پیــادەکردنی کــۆنترۆڵێکی تــەواوی ســەروەریی لــە

وڵاتەکانی خۆیاندا. یەکێك لەو هەوڵانە بریتییە لە کۆنترۆڵکردنی دیاردەی کۆچکردن بە تایبەتییش لە سنوری نێوان ئەمریکا و مەکسیك کە بەردەوام کێشە بۆ دەسەڵاتە فیدراڵییەکانی ئەمریکا دروست دەکات. ئەوەتا سەرەڕای دابینکردنی ڕێژەیەکی زیاتر لە پاسەوان و تۆتۆمبیل و کەرەستەی چاودێریی، هێشتا تیمەکانی پاسەوانیی سەر سنووری ئەمریکا ڕۆژانە لە هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵکردنی هاتوچۆی خەڵك لە خاڵی سنووریی (ریۆ گراند) و ناوچە بیابانییەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئەمریکا. لەبەر ڕۆشنایی ئەم گرفتانەشدا، هاووڵاتیانی ئەمریکا لیژنەی ئاسایشی میللییان دروست کردبوو وەکو "پرۆژەی مانیوتمان" بەمەبەستی چاودێری کردن و راونانی ئەو کەسانەی نیازی هاتنە ناو وڵاتیان بە شێوەی نایاسایی هەیە. بەڵام ئەم گروپە تەنها تایبەت نییە بە بابەتی کۆچکرنی نایاساییەوە، بەڵکو هەمیشە هۆشیاری دەدات دەربارەی دۆخی ئەمریکا لە رووی رق و کینە بەرامبەر خەڵکانی بە رەچەڵەك ئینگلیزی و مەترسیی زیادبوونی ڕێژەی ئیسپانی — زمانەکان لە باشوری ڕۆژئاوای ئەمریکا. لەبەرامبەریشدا ئاماژەیەکی ئەوتۆ نەکراوە بە ڕۆڵی ئەرێنیی کۆچبەرانی باشور لە پاڵپشتی کردنی کەرتەکانی کشتوکاڵ و پیشەسازی و خزمەتگوزاری، بە تایبەتییش کە زۆربەی ئەو کۆچبەرانە سەرقاڵی کار کردنن بە کرێیەکی کەم و نزمترین ڕاددەی مسۆگەرکردنی ژیانی تاکە کەسیی یان دارایی.



١٠. سنووری نێوان مەکسیك و ئەمریکا. مندڵاڵن لە تەنیشت دیواری سنوورەکە یاری تۆپی پێ دەکەن.

چوارەم: هەندێ جار سەروەری بە شێوەی ناراستەوخۆ لە لایەن حکومەتی بەرامبەرەوە بە فەرمی دەناسرێت، ئەویش لە چوارچێوەی پرنسیپی دەست تێوەرنەداندا. ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت پێویستە وڵاتان بتوانن بە بێ دەست تێوەردانی دەرەکی چارەسەری پرس و کێشەکانی خۆیان بکەن، لە لایەن یاساناسی سویسری (ئیمیریخ دو ڤاتیل) ەوە برەوی پێ درا و گەشەی کرد، و ئێستا بووەتە توخمێکی سەرەکی لە پێکهاتەی سیاسەتی جیهانیدا. ئەم پرنسیپە بە تایبەتی بۆ ئەو وڵاتانە زۆر گرنگە کە لەژێر سێبەری کۆلۆنیالیزمی ئەوروپاوە سەریان هەڵداوە، چونکە یارمەتییان دەدات لە دروستکردنی حکومەتی دوای کۆلۆنیالیزمی تایبەت بە خۆیان.

بە گشتی، هەردوو ئیدارەی ئەمریکا و سۆڤێت هەمیشە دەستیان وەردەدا لە پرس و کێشەی وڵاتانی تر، بە تایبەتییش ئەو وڵاتانەی کە پێیان دەوترێت "جیهانی سێیەم" بە شێوەی جیاجیای وەکو داگیرکردنی سەربازی، سەپاندنی ئابڵۆقەی ئابووری، دەست تێوەردانی کولتووری، بە پاشکۆ کردنی سیاسی و یان سزادانی سیاسی. هەر بۆ نموونە، لەساڵی ١٩٦٥دا ئەمریکا وڵاتی( دۆمەنیکان) ی داگیر کرد و هەروەها لە ساڵی ١٩٧٣دا ئاسایش و ئۆقرەیی لە وڵاتی چیلی تێکدا،چونکە لەوە دەترسا کە لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی کوبا لە ساڵی ١٩٥٩ بە سەرۆکایەتی ڤیدل کاسترۆ، حکومەتی زیاتری سۆشیالیستی لە هەردوو کیشوەری ئەمریکا دروست ببێت. لەولاشەوە لە ساڵەکانی ١٩٥٦ و ١٩٦٨دا حکومەتی سۆڤێت تانك و زرێپۆشی رەوانەی هەردوو وڵاتی رۆمانیا و چیکوسلۆڤاکیا کرد بەمەبەستی سەرکوت کردنی حکومەتە ریفۆرمستەکانی ئەو دوو وڵاتە.

لە چەند شوێنێکی تری جیهانیشدا، چەندین وڵات هانی پرنسیپی دەست تێوەرنەدانیان دەدا،چونکە پێشکەوتن لە بواری مافەکانی مرۆڤ لەو وڵاتانەدا دەیسەلماند کە شایستەی سەروەریی تەواون. بەلاّم سەرەڕای پاڵەپستۆی گروپەکانی فشار لە سەرانسەری جیهاندا، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی کە خۆی لە ئەندامە هەمیشەییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەبینێتەوە، کاردانەوەی پێویستی بەرامبەر پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ و جینۆساید کردن لە شوێنەکانی وەکو دارفور لە سودان، نیشان نەداوە.

لەولاشەوە بۆمباران کردنی پێگە سەربازییەکانی سربیا لە کۆسۆڤۆ لە لایەن هێزەکانی ناتۆوە لە ساڵی ١٩٩٩، لەسەر بنەمای ئەوەبوو کە پێشێلکردنی سەروەریی وڵاتی سربیا لەبەر ئەو رەشە کوژییە بووە کە سربەکان لە دژی موسڵمانەکانی کۆسۆڤۆ بەرپایان کردبوو. بێجگە لەوەی چاودێران دوویاتیان دەکردەوە کە ئەو کردە سەربازییانەی ناتۆ لە لایەن ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە

یەکگرتوەکانەوە بە فەرمی ڕێگای پێ نەدرابوو، هەروەها ناتۆ بەوەش تۆمەتبار دەکرا کە لە چەند شوێنێکی تری جیهاندا مافی مرۆیی موسڵمانان پێشێل دەکرێت و دەکوژرێن بە بێ ئەوەی ئەو ڕێکخراوە هیچ کاردانەوەیەکی هەبێت. بۆ ئەمەش هەمیشە فەلەستین و هەرێمی کشمیر لە نێوان هند و پاکستان بە بەڵگە دەهێنرێنەوە. چاودێران گەیشتوونەتە ئەو دەرەنجامەی هەر کاتێ پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و تەنانەت جینۆسایدیش لە لایەن وڵاتێکەوە ئەنجام بدرێت کە خاوەن هێزێکی سەربازی زەبەلاح بێت (بە هێزی ناووکییشەوە) و یان هاوپەیمانی گەورەی وەکو ئەمریکای هەبێت( وەکو حاڵەتی ئیسرائیل)، ئەوا بابەتی دەست تێوەرنەدان پشتگوێ دەخرێ و باس ناکرێت. لە ساڵی ٢٠٠٥دا، دۆکیومێنتەکانی کۆبوونەوەی لووتکەی نەتەوە یەکگرتووەکان (بە تایبەتی ماددەکانی ١٣٨ و ١٣٩) ئاماژەیان بەوە کرد کە وڵاتان دەتوانن لە چەند حاڵەتێکی تایبەتدا دەست تێوەردان ئەنجام بدەن، چونکە لەو حاڵەتانەدا "بەرپرسیارێتی پاراستن"ی خەڵك دەکەوێتە ئەستۆیان.

**ئێران و وەدەستهێنانی چەکی ناووکی**

لەکانوونی دووەمی ٢٠٠٧دا، چەند ڕۆژنامەیەکی ئیسرائیلی و بەریتانی لە ڕاپۆرتەکانیاندا ئاماژەیان بەوە کرد کە ئیسرائیل بڕوای وایە ئەنجامدانی کردەی سەربازی لە دژی پێگە ناووکییەکانی ئێران زۆر پێویستە. بە پێی ئەو لێکدانەوەیە، نابێت ڕێگا بە ئێران بدرێت تا ببێتە خاوەن چەکی ناووکی. بۆ وڵاتێکی وەکو ئێرانیش کە دەربارەی پاڵەپستۆ خستنە سەری و یان هەڕەشە لێ کردنی زۆر هەستیارە (وەکو پاڵپشتی کردنی کودەتاکەی ١٩٥٣ و یان پشتگیری کردنی سەدام حوسێن لە شەڕی ئێران- عێراق لە هەشتاکاندا)، قسە کردن دەربارەی پێشێلکردنی یەکێتی خاکەکەی دەبێتە هۆی بەهێزبوونی پشتیوانیی نێوخۆیی بۆ وەدەستهێنانی هەمان چەك کە ئیسرائیل مەترسی لێ دەکات. دیارە بۆچوونی جوگرافی مەزەندە کراو دەربارەی ئێران لە دوو خاڵ پێك دێت:

<u>یەکەم:</u> ئێران هێزێکی ناوچەکەیە و خاوەن مێژوویەکی دوورو درێژە لە کاریگەریی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوەڕاستی ئاسیا. بۆ بەریتانیاش، ئێران هێزێکی ئیمپراتۆریی پێشووە.

<u>دووەم:</u> ئێران خاوەن وڵات و کلتورێکی دەورە دراوە بە چەند دراوسێیەکی عەرەب زمان و چەند هێزێکی نەیاری وەکو ئیسرائیل کە لە لایەن ئەمریکاوە پاڵپشتی دەکرێن. بۆیە پێویستە هەر هەوڵێك بۆ دەست تێوەردان لە ئێراندا ئەم تایبەتمەندییانە لەبەر چاو بگرێت.

وادیارە ئەگەری ئەوەش لاوازە کە بۆمبارانی سەربازی، گۆڕینی ڕژێم، یان گۆشەگیرکردنی زیاتری ئەو وڵاتە، سەرکردە دێرینخوازەکانی ئێران قایل بکات بەوەی واز لە بەرنامەی وەدەستهێنانی چەکی ناووکی بێنن.

هەندێ لە وڵاتان توانای باشتر بۆ پاراستنی سەروەریی خۆیان نیشان دەدەن، بە مانای ئەوەی توانایان هەیە لە کۆنترۆڵکردن و بەڕێوەبردنی خاکی نیشتمانەکانیان و ڕێکخستنی هاتوچۆی پارەو

خەڵك و شت ومەك و ئایدیا و تەكنەلۆجیا لە وڵاتەكانیاندا. بەڵام چەند وڵاتێكی تری وەكو ئەمریكا و چین خاوەن توانای دەرەكین، بۆیە دەتوانن مامەڵەی گونجاو لەگەڵ پەیوەندییە جیهانییەكانـدا بكـەن. بێگومان كۆنترین بیرمەندانی جیۆپۆلیتیك هەستیان بـە توانـای ئـەو دوو وڵاتـە كـردووە لـە دەست تێوەردان لە وڵاتانی تر، نەتەوەكانی تر و یان ناوچەكانی تری جیهـان. هـەر ئـەو دەسـت تێوەردانـەش پرنسیپی "دەست تێوەرنەدان" ی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكاندا خستۆتە مەترسییەوە.

## نەخشەی جیۆپۆلیتیكی لە سەردەمی جیهانگەراییەكی بەرفراواندا

ئەگەر بمانەوێ بە شێوەیەكی باشتر بزانین چۆن جیۆپۆلیتیكی جیهانیی لە سـەردەمی (مایكنـدەر) ەوە تا ئێستا گۆڕاوە، پێویستە وردبینی ئـەوە بكـەین كـە كاردانـەوەی وڵاتـان چـۆن بـووە لـە گـەڵ پرۆسەكانی پەیوەندیدار بە جیهانگەراییەوە. ئەگەر هزری جیۆپۆلیتیكیی كۆن سەرقاڵی لێكۆڵینەوە لـە وڵاتان و گۆڕانی بارودۆخی ئیمپراتۆرییەتەكانی ئەوروپا بووبێت، ئەوا لێكۆڵینەوە تازەكان زیـاتر بـاس لە رۆڵی ئەكتەرو تۆڕە ناحكومییەكان، رێكخراوە هەرێمایەتییەكان، دامـەزراوە نێـو نەتەوەییـەكان،و رێكخراوە حكومییە نێودەوڵەتییەكان لەم بارەیەوە دەكەن. هەرچەندە چەمكی سەروەریی وڵاتـان هـەر بە گرنگـی دەمێنێتـەوە، بـەڵام چـەمكی پشـت بەیـەك بەسـتن بووەتـە هـۆی گـۆڕینی پەیوەندییـە نێودەوڵەتییەكان و جوگرافیای جیهانیش. ئێستا زۆر ئاساییە كە ببینین وڵاتان خاوەن جۆرە سـنوورێكن كە بە ئاسانی تێپەڕ دەكرێت و ئیدارە كردنی وڵاتان بـە شـێوازی جیهـانیی و فـرە سـەنتەریی ئـەنجام دەدرێت، چـونكە دامـەزراوەكانی وەكـو بـانكی نێودەوڵـەتی و نەتـەوە یـەكگرتووەكان و دامـەزراوە جیهانییەكانی بواری میدیاو رێكخراوی بازرگانیی جیهانی رۆڵی خۆیان دەبینن لـە دارِشـتنی شـێوازی تازە بۆ مامەڵە كردن لەسەر ئاستی جیهان.

لێرەدا چەمكی فراوانیی گرنگە، چونكە تێیدا بەڵگەی زیـاتر دەردەكـەوێت كـە پێویسـتە وڵاتـان خۆیان لەگەڵ چەندین كێشەو بابەتی تازەدا بگونجێنن، بە شـێوەیەك كـە سـنوورە نێودەوڵەتییـەكان و سەروەریی تایبەتییش تێپەڕ بكەن. بێگومـان لیسـتەكە چـەندین بابـەت بـە خـۆوە دەگرێـت وەكـو گۆڕانكاری لە بـارودۆخی جیهـان و مافـەكانی مـرۆڤ و بازرگـانی كـردن بـە مـاددە هۆشـبەرەكان و دێوەزمەی قڕكردنی ناووكی. بە درێژایی ٦٠ سـاڵی رابـردووش، هەمیشـە دەوتـرا كـە لـە ئـەنجامی شكستی ژاپۆن و ئەڵمانیا لەساڵی ١٩٤٥دا، شێوازێكی تازە لە رێكخسـتنی جیهـانی بـاڵی بەسـەر جیهاندا كێشاوە. ئـەو رێكخسـتنەش كـە ئـەمریكا و هاوپەیمانـە سـەركەوتوەكانی وەكـو بـەریتانیا سەرپەرشتییان دەكرد، سـێ خەسـڵەتی تایبـەتی هـەبوو: پێشـكەوتنی ئابووریـەكی سـەرمایەداریی

جیهانی ودامەزراندنی نەتەوە یەکگرتووەکان و پێشخستنی دیموکراتییەتی لیبراڵی. دیارە ئـەمریکا زۆر کاریگەر بوو لە دامەزراندنی سیستمێکی ئابووری بونیاتنراو لەسەر دوو دەزگا کە بریتین لـە سـندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتی.

یەکەم: ئەم دەزگایانە لە (بریتون وودز) لـە ویلایـەتی (نیـو هامپشـایەر) لـە سـاڵی ١٩٤٤ بـە ئامانجی بەدی هێنانی سەقامگیرییەکی ئـابووری نێودەوڵـەتی و دابینکردنـی سەرچـاوەی دارایـی بـۆ بونیاتنانەوەی دوای شەڕی جیهانیی دووەم دروست بوون.

**بریتون وودز: کۆتایی سیستمێکی ئابووری نێودەوڵەتی؟**

سیستمی بریتون وودزی تایبەت بە ئیدارە کردنی دراوی نێودەوڵەتی بە ئامانجی دارشتنی چەند رێسـایەك بـوو کـە سەرپەرشـتی پەیوەندییـە ئـابووری و بازرگانییـەکانی دوای شـەڕ بکـات. تێیـدا دێوەزمـەی شـێوازە سەرکوتکارییەکانی ئابووری نەتەوەیی وەلاوە نرا. ئەم سیستمە ٤٤ نەتـەوەی بـەخۆوە دەگـرت کـە لـە تـەمووزی ١٩٤٤دا ئامادەی کۆنفرانسی نەتەوەیەکگرتووەکانی تایبەت بە دراو و دارایی بـوون. کـاتێکیش سیسـتمەکە لـە ساڵی ١٩٤٦پەسەند کرا، پێویسـت بـوو هـەر یـەك لـە ولاتـە بەشـداربووەکان رازی بێـت بـەوەی رێـژەی دراوە نیشتمانییەکەی لە چوارچێوەی بەهایەکی نـەگۆڕدا بمێنێتـەوە، بـۆ ئـەوەی سـندوقی دراوی نێودەوڵـەتی بتوانێـت پارێزگاری لە سەقامگیریی دارایی جیهان بکات. بەلاّم لە ساڵی ١٩٧١،سیستمی دراوی نەگۆڕ هەرەسـی هێنـا و لە ئەنجامدا ئەمریکا پرۆسەی گۆڕینی دۆلاری بۆ زێـڕ راگـرت. لـە دوای سـاڵی (١٩٧١ ) یـش، وردە وردە دراوە نیشتمانییەکان پابەند بوونیان بە رێژەیەکی دیاریکراو لە مامەڵە کردن بە دراو لەدەسـت دا و لـە ئەنجامـدا رێـژەی دراوەکان زیادی کرد. بۆیە چەند شارێکی گەورەی جیهان وەکو نیویۆرك و پاریس و لەندەن جێگـای( بریتـون وودز) یان گرتەوە وەکو چەقی بازاڕی جیهان.

دووەم: دامەزراندنی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٥ کاریگەریی گەورەی هـەبوو لە سەرپەرشتی کردن و رێکخستنی هەڵس و کەوتی ولاّتان لە دوای شـەڕی جیهـانیی دووەم، چـونکە پەیماننامەی ئەو رێکخراوە رۆڵی سـەرەکیی بینـی لـە بونیاتنـانی رێ وشـوێنی تایبـەت بـە بابـەتی سەروەری و هەروەها بابەتەکانی تری وەکو رێککەوتنی گشتی دەربارەی بازرگانی و باجی گـومرك بـە ئامانجی پێشخستنی بازرگانییەکی ئازاد لە سەرانسەری جیهاندا.

سێیەم: پێشخستنی دیموکراتیەتی لیبراڵی لە لایەن ئەمریکاوە وەکو سیستمێکی پەسـەندکراو بـۆ حوکمداریی سیاسی بایەخێکی گەورەی هەبوو لە بە یاسایی کردنـی رۆڵـی ئـەو جـۆرە سیسـتمە لـە ململانێکانی شەڕی ساردد‌ا کە یەکێتی سۆڤێت و چینیش تێیدا بەشدار بوون، واتا ئـەو ولاّتانـەی کـە پشتیوانییان لە شۆڕشی سۆشیالیستی دەکرد. لە ئـەنجامی دارمـانی یـەکێتی سـۆڤێتیش لـە سـاڵێ

١٩٩١ و شکستهێنانی سیستمە سۆشیالیستییەکان لە رۆژهەلاتی ئەوروپا و شوێنانی تر، ئەو دەزگایانەی کە مۆرکی ئابووری و سیاسی ئەمریکایان پێوە دیار بوو، پێشبینی پێشکەوتنی سەرمایەدارییەکی جیهانییان کرد کە لەسەر بنەمای بازرگانیی ئازاد، بازاڕی ئازاد، و وەبەرهێنانی راستەوخۆی بیانی بونیات نرابێت. دامەزراوە نێونەتەوەییەکانیش لە لای خۆیانەوە ئاسانکارییان بۆ بەهێز کردنی کەش و هەوای ئەو جۆرە ئابوورییە جیهانییە لە رێگای وەبەرهێنان و چالاکییە بەرهەمهێنەرەکانیانەوە دەکرد.



١١. بینای بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان و زۆربەی ئالای ولاتانی ئەندام لە کاتی (٦٦) ەمین دانیشتنی ئەنجومەنی گشتیدا. بینا لە مەڕمەڕ دروستکراوەکە (٣٩) قاتەو بە بینای سکرتاریەتی نەتەوە یەکگرتووەکان ناسراوە. لە لای چەپیشەوە دیمەنێکی بینای ئەنجومەنی گشتیی دەردەکەوێت.

**لە یالْتاوە بۆ بەرلین: کەوتنی سنوورە سیاسییەکانی ئەوروپا**

لە مانگی شوباتی ١٩٤٥ ولاّتانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤێت و بەریتانیا بەشدارییان کرد لە کۆبوونەوەیەك لە شاری گەشتیاری یالْتا لە نیمچە دوورگەی کریمیا (نیمچە دوورگەیەکە لە ولاّتی ئۆکرانیا و دەکەوێتە سەر کەناری باکووری دەریای رەش- وەرگێڕ). کۆنفرانسەکە کە ستالین و رۆزڤلْت و چێرچلْ بەشدارییان تێدا کردبوو، چارەنووسی ئەوروپای دوای ١٩٤٥ ی دەستنیشان کرد. دیارترین دەرەنجامەکانیشی بەم شێوەیە بوون: یەکێتی سۆڤێت دەبێتە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان بەرامبەر وەدەستهێنانی بالآدەستی بەسەر ناوچەیەك لە رۆژهەلاّت و ناوەڕاستی ئەوروپا. یەکێتی سۆڤێت شەڕ لە دژی ژاپۆن رادەگەیەنێت. ئەلْمانیا و نەمسا داگیر دەکرێن و دابەش دەکرێن بەسەر چوار سێکتەردا کە بەڕێوەبردنیان بە سێ ولاّتە بەشداربووەکەی ئەو کۆنفرانسە لە گەلْ فەرەنسادا دەسپێردرێت. پێویستە ئەلْمانیا قەرەبووی زیان لێکەوتووان بکاتەوە. ولاّتانی وەکو ئیستۆنیا و لاتڤیا لە ژێر داگیرکاریی سۆڤێتدا دەمێننەوە.

ئەلْبەتە ٤٤ سالّی تر پێویست بوو بەر لەوەی جیۆپۆلیتیکی ئەوروپا لە ئەنجامی داڕمانی رژێمی ئەلْمانیای رۆژهەلاّت و بزوتنەوە کۆمۆنیستەکانی تر لە رۆژهەلاّت و ناوەڕاستی ئەوروپادا بە تەواوی بگۆڕدرێت. روخاندنی دیواری بەرلینیش کە لە سالّی ١٩٦١ دروست کرابوو، یەکێکە لە ساتە لەبیرنەکراوەکانی ئەو گۆڕانکارییە. لە کۆتایی نەوەتەکاندا، یەکێتی سۆڤێت لەبەر یەك هەلْوەشایەوەو حکومەتە کۆمۆنیستەکانی ئەوروپای رۆژهەلاّتی پێشوویش بوون بە ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا و رێکخراوی پەیماننامەی باکووری ئەتلەسی ناسراو بە (ناتۆ). روسیاش لە لای خۆیەوە دۆستایەتی لەگەلْ هەردوو رێکخراودا دامەزراند.

بێگومان بابەتی پەهاویشتنی ولاّتان لە سەردەمی جیهانگەراییەکی بەربلاّودا قسەو باسی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا. بە لای هەندێکەوە، ولاّتان کەوتوونەتە ژێر سێبەری پێداویستییەکانی سیستمی سیاسی و ئابووری جیهانییەوە. دیارە دامەزراوە ئابوورییەکانی وەکو بانکی نێودەولّەتی و سندوقی نەختی نێودەولّەتی، دەتوانن تا رادەیەکی زۆر کاریگەریی لەسەر خەرجییە حکومییەکان و سیاسەتی گشتیی ئابووریی ولاّتان لە هەر کات و شوێنێکدا دروست بکەن ئەگەر ولاّتان داوای پالْپشتی داراییان لێ بکەن. ئەمەش بە شێوەی بەرچاوتر لە ولاّتانی باشووری هەردوو بیابانی گەورە لە ئاسیا و ئەفریقا بەدی دەکرێت. تێیدا پرۆگرامەکانی گونجاندنی پێکهاتەیی (برامج التكييف الهيكلي) بەسەر ولاّتاندا دەسەپێنرێت بە چەندین مەرجەوە وەکو مەرجی هەلْگرتنی پالْپشتی حکومەت بۆ خەرجییە گشتییەکان یان ئاسانکاری کردن بۆ وەبەرهێنانی دەرەکیی لەو ولاّتەدا. (واتا، بۆ ئەوەی ئەو دوو رێکخراوە قەرز بە ولاّتان بدەن،پێویستە ئەو ولاّتانە بازاڕەکانیان ئازاد بێت و کەرتی تایبەت چالاك

بکەن و هەروەها حکومەت پێداویستییە سەرەکییەکانی وەکو خواردن و سووتەمەنی بە هەرزان بۆ هاووڵاتیان دابین نەکات-وەرگێڕ).

لە کاتی شەڕی سارددا،ئەو جۆرە ڕێوشوێنە ئابوورییە نێودەوڵەتییانە مانای جیۆپۆلیتیکییان هەبوو، چونکە ئەمریکا کۆنترۆڵی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی وەکو سندوقی نەختی نێودەوڵەتیی کردبوو، ئەمەش دەبووە هۆی دروستبوونی هەژموون و کۆنترۆڵی زیاتری ئەو زلهێزە بەسەر ناوچەکانی وەکو رۆژئاوای ئەفریقا کە بە هۆی دەوڵەمەند بوونیان بە نەوت و غاز، لە رووی ستراتیجییەوە بە گرنگ هەژمار دەکران. لەم بارەیەوە جوگرافیناسی مارکسی "دەیڤد هارڤی" ئاماژە بە (کۆکردنەوە بە لێ دەرکردن) دەکات بۆ باسکردنی ئەو شێوازەی تێیدا دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان ئاسانکارییان دروست کردووە بۆ دەست گەیشتن بە سەرچاوەو بازاڕەکانی جیهانی سێیەم. لە شوێنەکانی تری وەکو باشووری رۆژهەلاتی ئاسیاش، قەرزە نێودەوڵەتییەکان بەو ولاتانە دەدرا کە بە هاوپەیمانی رۆژئاوا هەژمار دەکران لە شەڕ و ململانێکان لە دژی بەرزخوازیی سۆشیالیستی کە لە لایەن سۆڤێت و چینەوە پشتیوانی دەکرا. لەم چوارچێوەیەدا، ولاتانی وەکو کۆریای باشوور و مالیزیا سوودمەند دەبوون، بە تایبەتییش لە سەروبەندی شەڕی ڤێتنامدا. ئیدارەی ئەمریکا لەوە دەترسا کە ئەگەر ڤێتنام بکەوێتە دەست هێزە کۆمەنیستییەکان، ئەوا ولاتانی دراوسێیشی دەبنە ئامانج بۆ کۆنترۆڵکردنیان لە لایەن ئەو هێزانەوە.

چاودێرانی تریش لە لای خۆیانەوە دووپاتی دەکەنەوە کە ڕێکخراوە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکانی وەکو سندوقی نەختی نێو دەوڵەتی یان دامەزراوە نێونەتەوەییەکان تەنها لەگەڵ ئەو ولاتانەدا مامەڵە دەکەن کە لە ئەنجامی جیهانگەراییدا گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە. لە ئەنجامیشدا، ولاتان ئابووریی دوای شەڕیان دروست کرد،و لەمەشدا ئەمریکا گرنگترینیان بوو. هەروەها، یاساکانی ئەو ئابوورییە دەربارەی موڵك و باج و وەبەرهێنان، دەبنە هۆی ڕێکخستن و پاراستنی چالاکیی دامەزراوە نێونەتەوەییەکان. بۆیە چەمکی "ولاتی گۆڕاو" بەو مانایە سوودبەخش دەبێت بۆ ئەوەی بزانرێت لە چی روویەکەوە جیهانگەرایی گۆڕانکاریی دروست کردووە. مایەی سەرسوڕمانە کە ئێستا ژمارەی ولاتان زیادی کردووە لە کاتێکدا زۆرێك لە چاودێران پێشبینی کەمبوونەوەی ئەو ژمارەیان دەکرد وەکو دەرەنجامێکی لۆجیکی بۆ جیهانگەرایی فراوان کە باڵی بەسەر جیهانی ئێستادا کێشاوە.

ئەڵبەتە مانای ناڕاستەوخۆی جیۆپۆلیتیك زۆر قووڵ و فراوانە. ئەوەتا لە لایەکەوە، کۆتایی هاتنی شەڕی سارد پەیدابوونی چەند ولاتێکی تازەو ژمارەیەك ڕێکخراوی ناوچەیی بەدوای خۆیدا هێنا، وەکو سلۆڤینیا و کۆمۆنوێلسی ولاتە سەربەخۆکان (ڕێکخراوێکە کە لە ساڵی ١٩٩١ بەمەبەستی

جێگرتنەوەی یەکێتی سۆڤێت دامەزرا کە وڵاتانی بیلا روسیا و ئۆکرانیا و روسیای ئیتحادی دامەزرێنەری بوون- وەرگێڕ). بێگومان دارمانی یەکێتی سۆڤێت و هاتنی قۆناغ بە قۆناغی روسیا و چین بۆ ناو پێکهاتە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکانی وەکو رێکخراوی بازرگانیی جیهانی، ئاماژە بوون بۆ چۆنێتی توانەوەی وڵاتانی کۆمۆنیستی و سۆشیالیستی پێشوو لە ناو ئەو تۆڕ و پێکهاتانەی کە وابەستەن بە پێشکەوتنی سەرمایەداریی جیهانییەوە.

دیارە هاوکات لەگەڵ شێوازی بەربڵاوی دیموکراتیزەکردن لە ئەورووپای رۆژهەڵات و ئەمریکای لاتین و بەشێك لە ئاسیا و ئەفریقا، سیاسەتە پەیوەندیدارەکان بە لیبرالیزمی تازە وەکو بازاڕی ئازاد و وەبەرهێنانی راستەوخۆی دەرەکیی هەژموونێکی گەورەیان دروست کرد. ئیتر وێنەیەکی ریك نەخراوی جوگرافیای جیهان هاتە ئاراوە - تێیدا جیهان وەکو ناوچەیەکی بێ سنوور دێتە بەرچاو کە هانی هاتوچۆ کردنی شت و مەك و وەبەرهێنانەکان دەدات. لێرەدا ئەرکی وڵاتان تەنها بریتیە لە ئاسانکاری کردن بۆ جموجوڵی بازرگانی لە ناو وڵاتەکانیاندا، بۆیە ژمارەیەك لە گەورە کۆمپانیاکانی ئەمریکا وەکو کۆمپانیای "ئینرۆن" توانییان سوودێکی تەواو لە هەل و مەرجی نەبوونی پێکهاتە دادوەریی و داراییەکان لە وڵاتەکانی تردا وەربگرن. لە ساڵانی نەوەتەکانیشدا، چاودێرانی وەکو فرانسیس فۆکۆیاما ستایشی سەرکەوتنی ئەو ئایدیاو کردارانەیان کرد کە پەیوەست بوون بە دیموکراتییەت و لیبراڵیەتی تازە بە سەرپەرشتی و سپۆنسەری کردنی ئەمریکا.

لە لایەکی ترەوە، دیار بوو کە دیموکراسییەت بە مانای هەڵبژاردنی ئازاد و نوێنەرایەتی هەڵبژێردراو نەبووەتە باو لە بەشێك لە وڵاتانی جیهان وەکو چین و باشووری بیابانی ئەفریقا و بەشێك لە جیهانی ئیسلامییش. هەروەها ئەو وڵاتانەش کە هەندێك لە چاودێران بە دیموکراتی ناوزەدیان دەکردن، جیاوازییەکی زۆریان هەبوو لە گەڵ نموونەی دیموکراتیەتەکەی ئەمریکا و ئەورووپای رۆژئاوا. لەولاشەوە، بەکارهێنانی سیستمی ئابووری تایبەت بە لیبراڵیزمی تازە،رووبەڕووی بەربەرەکانێیەکی زۆر بووەوە لە لایەن زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێیەم و ئەورووپای رۆژئاواو بگرە ئەمریکاشەوە. یەکێك لە بەرچاوترین شێوازەکانی ئەو بەربەرەکانێیەش خۆی لە دەرکەوتنی بزوتنەوەی دژە جیهانگەرایی دەبینێتەوە.

ئەڵبەتە بەرچاوترین خۆپیشاندانەکانی دژی جیهانگەرایی لە شارەکانی کۆڵن، جەنەوا، لەندەن، و سیاتڵ ئەنجام دەدران و بە زۆرییش هاوکات بوون لەگەڵ کۆبوونەوەکانی رێکخراوی بازرگانیی جیهانی و گرووپی ( ٨ ). خۆپیشاندانەکان رەخنەیان لەو شێوازە دەگرت کە تێیدا لیبراڵیزمی تازە سنوورە نیشتمانییەکان لەناو دەبات،و لە ئەنجامدا کۆمەڵگای ئەو وڵاتانە رووبەڕووی دەست تێوەردانی

نەخوازراوی دام و دەزگا جیهانییەکان و دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان و هێـزە باڵادەسـتەکان دەکاتـەوە. گەورەترین مەترسییش ئەوە بووە کە هەندێك لـەو کاریگەرییـە بیانییانـە باڵیـان بەسـەر نیشـتمان و کۆمەڵگاکاندا کێشاوەو حکومەتەکانیش توانا و ئارەزوویان نەبووە کە رێگـا لـە هـەژموونیان بگـرن، هەرچـەندە ئـەو کاریگەرییانـە لـە گـەڵ داب و نەریتـە خۆماڵییەکانیشـدا نـاگونجێن. یـەکێك لـە دراماتیکیترین ئەو هەوڵە دژە جیهانگەراییانە لە شاری سیاتڵی ئەمریکی لە ساڵێ ١٩٩٩ ئـەنجام درا و بەرنامەی بۆ داڕێژرابوو تا هاوکات بێت لەگەڵ کۆبوونەوەی رێکخـراوی بازرگـانیی جیهـانی. تێیـدا ٦٠٠٠٠ کەس رژانە سەر شەقامەکان بەمەبەستی نیشاندانی نارەزایی بەرامبەر جیهانگـەرایی،و ئـەو کردەوەش دەسەلاتدارانی ناچار کرد پەنا بۆ هێزی سەربازی ببەن بۆ گەڕاندنـەوەی یاسـا و هێمنـی بـۆ شارەکە. بەلاّم نارەزاییەکان لەسەرانسەری جیهاندا درێژەیان هەبوو و لە سـاڵی ٢٠٠١دا کۆڕبەنـدێکی کۆمەلاّیەتی جیهانی لە ولاّتی بەرازیل گرێ درا بە ئامانجی یەکخسـتن و چـڕکردنەوەی هەوڵـەکان بـۆ دژایەتی کردنی شێوازەکانی جیهانگەرایی. لە سالاّنی ٢٠٠٤ و ٢٠٠٥ یشدا زیـاتر لـە( ١٠٠٠٠٠) کەس ئامادەی هەردوو کۆڕبەندەکە بوون لە ولاّتانی هند و بەرازیل بۆ هەمان مەبەست.

بە گشتیی بزوتنەوەکانی دژ بە جیهانگەرایی جۆراوجـۆرن و هەرچـەندە ئێسـتا تـا رادەیـەك بـە هەماهەنگی لەگەڵ بزوتنەوەکانی دژە شەڕ سەرقاڵی ئەنجامدانی هەڵمەتن بۆ رەتکردنـەوەی شـەڕی دژ بە تیرۆر و داگیرکردنی عێراق (کتێبەکە لە ساڵی ٢٠٠٧ نوسـراوە- وەرگێـڕ)، بـەلاّم چـالاکییەکانیان بوونە هۆی گومان خستنە سەر سیستمی سیاسـی و ئـابووریی لیبرالیزمـی تـازە و تـا رادەیـەکیش تێکدانی ئەو سیستمە. ئیتر بەهۆی نارەزاییەکان لە سیاتڵ و شوێنەکانی تر، ئەو ولاّتانەی میوانـداری کۆبوونەوەکانی رێکخراوی بازرگانیی جیهانی و گروپی ( ٨ ) و بـانکی نێودەوڵـەتییان دەکـرد، ناچـار بوون کات و پارەیەکی زۆر لە دابینکردنی ئاسایش لە کاتی کۆبوونەوەکاندا خەرج بکەن. لـە سـەرێکی تـرەوە و لـە دوای هێرشـەکانی ١١ی سـیپتەمبەری ٢٠٠١، دەرفـەتی زیـاتر خوڵقـا بـۆ ولاّتـە دەوڵەمەندەکان و رێکخراوە هەرێمایەتییەکانی وەکو یەکێتی ئەوروپا بـۆ پتـەوکردنی زیـاتری سـنوورە نیشتمانییەکانیان. هەروەها، وەکو لە کۆبوونەوەی رێکخراوی بازرگانیی جیهانی لە دەوحە دەرکـەوت، ئەو هێرشانە بیانوویان دایە دەست ولاّتە گەورەکان تا گفتوگۆی چڕتر ئەنجام بـدەن و جڵـەوگیری زیـاتر دروست بکەن لە رێگای هاوردە کردنی بەرهەمی کشتوکاڵی و پیشەسازی لە ولاّتانی بەشی باشـووری گۆی زەوی.

# ئەمریکا و ئیمپراتۆرییەتێکی تازە

کاردانــەوەی ئــەمریکا بەرامبــەر هێرشــەکانی ١١ی ســیپتەمبەری ســاڵی ٢٠٠١ بــووە بابــەتی هەڵسەنگاندن و مشت و مڕێکی زۆر، و ئێستا دەکرێ ئەو رووداوە وەکو خاڵی وەرچەرخان لە مێــژووی هاوچەرخی ئەمریکا و سیستمی تازەی جیهانیی دابنرێت. لە ماوەی شەست ساڵ بەر لــەو رووداوەش، ئەمریکا رۆڵی کاریگەری بینی لە دامەزراندنی سیســتمێکی سیاســی و ئــابووریی بونیــاتنراو لەســەر نەتەوە یەکگرتووەکان و بانکی نێودەوڵەتی و سندوقی نەختی نێودەوڵــەتی. بــەڵام کاتێــك ئــەو وڵاتــە رووبەڕووی زیانی گیانی گەورە لە هاووڵاتیانی بووەوە کە پێشتر زیانی لەو جۆرەی پێ نەکەوتبوو، ئــیتر ئیدارەی بوش بە هەماهەنگی لە گەڵ هاوپەیمانانی وەکو بــەریتانیا و پاکســتان و ئوســترالیا، دەســتی دایە شەڕ لە دژی تیرۆر لە چوارچێوەی هەوڵەکانی بۆ راوەدوونانی ئــەو کەسایەتییانەی کــە نەخشــەی هێرشــەکانیان داڕشــتبوو. هــەردوو چوارچــێوەی دیبلۆماســی و ســەربازیی هەوڵــەکانیش وڵاتــانی ئەفغانستان و عێراق و ئێران و یەمەن و سودان و سوریای گرتــەوە. لەولاشــەوە هاوپەیمانــەکانی وەکــو ئیسرائیل و قەتەر و شانشینی سعودی و پاکستان رۆڵی کاریگــەریان بینــی لــە هەماهــەنگی کردنــی ئاسایشیی و رێگاکردنەوە بۆ کردە سەربازییەکان لەناو خاکی وڵاتەکانیاندا لە دژی ئــەو کەســانەی بــە بەشێك لە تۆڕی تیرۆریستی هەژمار دەکران. ئەمەی خوارەوەش خشتەیەکە بە توخمــە ســەرەکییەکانی سیاسەتی هەردوو سەرۆکی ئەمریکا، بیل کلینتون و جۆرج بوش:

| سەرۆك کلینتون ( ١٩٩٣-٢٠٠١ ) | سەرۆك بوش ( ٢٠٠١-٢٠٠٩ ) |
|---|---|
| جیهانگەرایی | شەری جیهانی دژی تیرۆر |
| هێزی زانیاری | هێزی سەربازی |
| یاسای نێودەوڵەتی | مافی پێشینە بۆ خاوەندارێتی |
| فرە لایەنی | تاك لایەنی |

بێگومان شەڕی دژە تیرۆر گرنگییەکی زۆری لە رووی جیۆپۆلیتیکییــەوە هەیە،چــونکە ئاراســتەی ئەو وڵاتانە کرا کە بە داڵدەدانی گروپە تیرۆریستییەکان و تــۆڕە پەیوەندیــدارەکان تۆمــەتبار کرابــوون. ئامانجی سەرەکیی شەڕەکەش بریتی بــوو لــە تێکشــکاندنی تــۆڕی تیرۆریســتی قاعیــدە و ســەرکردە باڵاکانی بە تایبەتییش ئوسامە بن لادن و جێگرەکەی، دکتۆر ئەلزەواهیری، کــە تۆمــەتبار بــوون بــە هێرشەکانی ١١ی سیپتەمبەر و تەقینەوەکانی پێشوو کە باڵیۆزخانەکانی ئەمریکایان لــە رۆژهــەڵاتی ئاسیا کردبووە ئامانج. رێکخراوی قاعیدە کە لە ئەنجامی شــەڕکردن لــە دژی هێزەکــانی ســۆڤیێت لــە

ئەفغانستان ئەزموونێکی گەورەی پەیدا کردبوو، لە هەشتاکانی سەدەی رابردوو دامەزرا،و وڵاتانی ئەمریکا و پاکستان و سعودیە بەشارییان کرد لەپشتیوانی لێکردنی لە رێگای چەکدار کردن و دابینکردنی سەرچاوەی داراییەوە. بەڵام ناردنی هێزی سەربازی ئەمریکا بۆ نیمچە دوورگەی عەرەب لە لە سەروبەندی شەڕی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١، رێکخراوەکەی تووڕە کرد و لە ئەنجامدا ئەو رێکخراوە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکای لە سەرانسەری جیهاندا کردە ئامانجی کردەوە تیرۆریستییەکانی خۆی. هەر بۆ ئەو مەبەستەش پەیوەندیی لە گەڵ یاخیبووانی تردا لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا و باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا و وڵاتی چیچان دروست کرد.

هەرچەندە زۆربەی حکومەتەکانی جیهان زۆر بە خێرایی سۆزی خۆیان بەرامبەر قوربانییەکانی ١١ی سیپتەمبەر نیشاندا، بەڵام شێوازی داڕشتن و جێبەجێ کردنی ستراتیجییەتی شەڕی دژە تیرۆر لە لایەن ئەمریکاوە بووە هۆی توڕەیی و رقی وڵاتان بەرامبەر ئەو زلهێزە. بەلای رەخنەگرانی ئەو سیاسەتەوە، هێرش کردنە سەر عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣، ئەشکەنجە دانی بەردەوام و بێ جیاوازی کردن، و دامەزراندنی کەمپەکانی وەکو کامپی (ئێکس رەی)، ئاماژە بوون بۆ رێز نەگرتنی ئەمریکا لە نەریت و یاسا نێودەوڵەتییەکان. هەرچەندە کۆدەنگیی لە سەر راگرتنی ئەو پرنسیپانە لە حاڵەتی رووبەڕووبوونەوەی ئەگەری جینۆساید یان پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤدا هەیە، بەڵام رۆڵی شەرعیەتی نێودەوڵەتی هەر گرنگ و بایەخدارە لە پارێزگاری کردن لە بەها باوەکان و نەخشەی جیۆپۆلیتیکی. لەم چوارچێوەیەدا، بڕیاری ئیدارەی بوش بۆ جێبەجێ کردنی پرنسیپی مافی پێشینە گرنگییەکی زۆری هەبوو، چونکە مافی دەدایە ئەمریکا بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتی سەربازی دژ بە هەر حکومەتێك یان گروپێکی ناحکومی کە بە دوژمنی خۆی بزانێت.

بە هەر حاڵ، لە رووی جیۆپۆلیتیکەوە، کردەوەکانی ئەمریکا هاوکات ئاماژە بوون بۆ پیادە کردنی سیاسەتی دەرەوەی هەرێمایەتی (واتا فراوانتر لە هەرێمایەتی- وەرگێڕ) کە لە ئاکامدا بووە هەڕەشە بۆ سەر چەند پرنسیپێکی گرنگی تایبەت بە دەست تێوەرنەدان و سەروەریی نیشتمانی . ستراتیجییەتەکانی ئاسایشی نیشتمانیی (٢٠٠٢-٢٠٠٥) لەم بارەیەوە زۆر روون و ئاشکرا بوون، کاتێ ئاماژەیان بەوە دەکرد کە چیتر ئەمریکا چاوەڕوان ناکات تا ئەو کاتەی هێرش بکرێتە سەری. دیارە دروستکردنی پێگەی سەربازیی دەرەکی وەکو ئەوانەی پێگەی دەریایی ئەمریکا لە کەنداوی گوانتانامۆ لە کوبا، بە ئامانجی دەرباز بوون بوو لەو پاراستنەی کە دەستووری ئەمریکا بۆ دیلەکانی شەڕی دابین دەکرد. بەڵام هاوکات مەترسیی ئەوەشی هێنایە ئاراوە- وەکو ئەوەی فەیلەسوفی ئیتاڵی (جیۆرجیۆ ئاگامبین) تێبینی کردبوو- کە شەڕی دژە تیرۆر دروستبوونی دەوڵەتی نائاسایشی لێ

بکەوێتەوە. ئەمەش مانای وایە لە حاڵەتی ئەمریکادا، "دەوڵەتی فریاکەوتن" وەکو زاراوەیەك بەکار دێت بۆ پاساو هێنانەوە بۆ پشتگوێ خستنی بارودۆخی یاسایی تاکەکان و دروستکردنی حاڵەتێك کە تێیدا تاکەکان خاوەن هیچ پێناسەسەك نین . بۆ نموونە، ئەو کەسانەی لە ساڵی ۲۰۰۱ لە ئەفغانستان لە لایەن هێزەکانی ئەمریکاوە دەستگیر کران، نە وەکو دیلی شەڕ پێناسە کران (بە پێی ڕێککەوتننامەکانی جنێڤ) و نە بە پێی یاساکانی ئەمریکا بە تۆمەتبار بە ئەنجامدانی تاوان ناوزەد کران.




۱۲. وێستگەی دەریایی ئەمریکا لە کەنداوی گوانتانامۆ- کوبا

ئەڵبەتە شێوازی نائاسایی لە گواستنەوەی ئەو دیلانەی گومانی ئەندامێتی ڕێکخراوی قاعیدەیان لێ دەکرا لە شوێنەکانی وەکو ناوەڕاستی ئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و شوێنەکانی تر، وڵاتی تری وەکو بەریتانیاشی دەگرتەوە. ئەو وڵاتە ئاسانکاری و پشتیوانیی لە پرۆسەیەك کردووە کە ئامانجی تەنها ئەوە نەبووە تاکەکان لە رووی جوگرافی و یاساییەوە لە یاساو ڕێساکانی تایبەت بە پاراستنی دیلەکانی شەڕ جیا بکاتەوە، بەڵکو گواستنەوەشیان بووەتە حاڵەتی یاسایی و جوگرافیی "نائاسایی". ئەگەر ئەم لێکۆڵینەوەیە بە (کافکایی) دەربکەوێت، ئەوا خوێنەر دەتوانێت چیرۆکی سەرسوڕهێنەری بایۆ-جوگرافی هاووڵاتیی بەریتانی "موعەززەم بەگ بخوێنێتەوە. ناوبراو باسی ئەوە دەکات چۆن لە

پاکستانەوە براوە بۆ ئەفغانستان و لە دواییشدا بۆ کامپی "ئێکس رەی" لە کوبا. لەوێ زیندانەکان ئەم ناوانەی خوارەوەیان لەسەر بوو: سۆماڵ، لوبنان، یو ئێس ئێس کۆل، نایرۆبی، هەردوو بورجەکە، و پەنتاگۆن. ئەمەش ئاماژەیەکی روونە بۆ ناوی ئەو شوێنانەی کە بوونە ئامانجی هێرشە تیرۆریستییەکان، بۆ ئەوەی ببێتە پاساو بۆ شەرعیەت دان بە دەستگیر کردن و زیندانی کردنی ئەو کەسانەی لەناو کەمپەکەدا بوون. لە وەڵامی پرسیاری بەرپرسە ئاسایشییەکانی ئەمریکا و بەریتانیادا، موعەززەم بەگ هەوڵی دەدا بێتاوانیی خۆی بسەلمێنێت. بەلام دەسەڵاتدارانی کەمپەکە زاراوەی وەکو "شەڕکەری نایاسایی" یان بۆ بەکار دەهێنرا . ئەمەش کاریگەریی ترسناکی هەبوو لە بێبەش کردنی موعەززەم و گیراوەکانی تر لە مافی زانینی تۆمەتەکانیان و هەروەها ئەو بەڵگانەی کە تۆمەتەکان پشتراست دەکەنەو.

بە گشتی، کردە سەربازییەکان زیانێکی بەرچاویان بە نەخشەی جیۆپۆلیتیکی ناوچەکە گەیاند و "فرانسیس فۆکۆیاما"ش لە لای خۆیەوە نارەزایی بەرامبەر ئەو دۆخە دەربڕی. بێگومان لە وڵاتێکدا کە رۆڵی سەرەکیی بینیوە لە دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتووەکان و بەدی هێنانی مافەکانی مرۆڤدا،پێشێلکردنی یاسای نێودەوڵەتی و پیادەکردنی توندوتیژی بە بێ جیاوازی مایەی سەرسوڕمان و نائومێدییە. دیارە فۆکۆیاما پشتیوانیی خۆی لە رۆشنبیرانی موحافەزەکار راگرتووە، ئەوانەی بەشدارییان کردبوو لە داڕشتنی سیتراتیجیەتەکەی سەرۆك جۆرج بوش، لەبەر چەندین هۆکاری وەکو: هێرشی بێ بەرنامە بۆ سەر عێراق، شکستهێنان لە پێشبینی کردنی کاردانەوەی توند لە دژی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، نەبوونی ئارەزوو بۆ چارەسەر کردنی کێشەی فەلەستین، و کەمیی بایەخدان بە پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی عێراق و ئەفغانستان لە دوای هێرشە موشەکییەکانی ئەمریکا بۆ سەر ئەو دوو وڵاتە. بە بۆچوونی فۆکۆیاما، پرنسیپەکانی وەکو مافی پێشینە و گۆڕینی رژێم و تاك لایەنی، ناتوانن لەسەر مەودایەکی دوور بە هەمان شێوە بمێننەوە . هەروەها ناکرێ ببنە جێگرەوەی یاسای نێودەوڵەتی و نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەو رێکخراوانەی ئەمریکا رەتیان دەکاتەوە، وەکو دادگای تاوانی نێودەوڵەتی. ستراتیجیەتی ئاسایشی نیشتمانی ساڵی (٢٠٠٢) یش دژی کۆڕبەندە نێودەوڵەتییەکان بوو، چونکە داڕێژەرانی ئەو سیاسەتە بڕوایان وا بوو وڵاتە لاوازەکان بە ئامانجی جڵەوگیری کردن لە ئەمریکا و ئەرکە جیهانییەکەی بۆ لەناوبردنی تیرۆر پەنا بۆ ئەو جۆرە کۆڕبەندانە دەبەن.

ئێستا ئەمریکا بە پشت بەستن بە پرنسیپی مافی پێشینەو جۆرێکی تایبەتی لە فرە لایەنی، بووەتە تاکە مەترسیی گەورە بۆ سەر نەخشەی جیۆپۆلیتیکی لەم سەردەمەدا. هەروەها، بەکارهێنانی

ساویلکانەی دروشمی "یان دەبێ لە گەڵمدا بیت یان لە دژم" لە لایەن سەرۆکی ئەمریکاوە، رەنگدانەوەی جیۆپۆلیتیکی بەدواوە دەبێت، چونکە هەندێك لە وڵاتان و هەرێمەکان بەرامبەر پابەند بوونیان بە پرنسیپەکانی ئەمریکا لەو رووەوە پشتیوانی دارایی و سەربازییان بۆ دابین دەکرێت. لەم چوارچێوەیەدا چەند وڵاتێك لە قەرنی ئەفریقا و رۆژهەڵاتی ئەفریقا وەکو وڵاتانی جیبۆتی و کینیا و ئیسیوبیا سوودمەند بوون لەو پاڵپشتییە دارایی و سەربازییەی ئەمریکا. هاوکات پێشبینی کردن بۆ بوونی سەرچاوەی نەوت لە کەنداوی غینیا بووە مایەی سەرنجی زیاتری ئەمریکا بۆ ناوچەکەو لە ئەنجامیشدا وەبەرهێنانی ئەمریکا لە رۆژئاواو ناوەڕاستی ئەفریقا رووی لە زیادبوون کرد. هەرچەندە شەڕی دژە تیرۆر رێگرییەکی جیۆپۆلیتیکی دروست دەکات، بەڵام ناوچەکانی کیشوەری ئەفریقا لە ستراتیجییەتی ئاسایشی نیشتمانی بۆ ساڵی ٢٠٠٢ وەکو هەڕەشەیەکی ئاسایشی سەرەکیی هەژمار کرابوون، بە هۆی بوونی ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتی "لاواز" کە ناتوانن کۆنترۆڵی هاتوچۆی خەڵك و پارە و چالاکییە تیرۆریستییەکان بکەن و یان ئارەزووی ئەو کارەیان نییە. ئەم هەڵسەنگاندنە نەرێنییەش بووە پاڵنەر بۆ ئیدارەی سەرۆك "بوش" کە لە ساڵی (٢٠٠٤) دا دەستپێشخەریی "هەموو کەنارەکان" (پان-ساحل) رابگەیەنێت کە وڵاتانی چاد و مالی و مۆریتانیا و (نەیجەر) ی دەگرتەوە، بە ئامانجی هەماهەنگی کردن لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکا. ئامانجی سەرەکیی دەستپێشخەرییەکە بریتی بوو لە راگرتنی جموجوڵی چەکدارە ئیسلامییەکان لە ناوچەکە و بۆ ئەو مەبەستەش (١٠٠) ملیۆن دۆلاری ئەمریکی تەرخان کرابوو.

لە کاتێکدا کە راوەدوونانی تۆڕە تیرۆریستییەکان لە سەرانسەری جیهاندا پاساوێکی روون و ئاشکرا بوو بۆ سیاسەتی هاوچەرخی دەرەوەی ئەمریکا، بەڵام ژمارەیەك هۆکاری ئابووری — سیاسی تر لە ئارادا بوون. دیارە لە ماوەی دوای ساڵی (١٩٤٥) و بڕیاری ئیدارەی سەرۆك (رۆزفلت) بۆ دامەزراندنی سیستمێکی جیهانی بونیاتنراو لە سەر نەتەوە یەکگرتووەکان و ئابوورییەکی کراوە بە رووی بازرگانی و وەبەرهێنانی ئەمریکادا، گۆڕانکاریی گەورە بەسەر جیهاندا هاتووە. ئەوەتا ئێستا ئابووری ئەمریکا لە ژێر قەرزێکی زۆردایە و لەولاشەوە خەریکە چین وەکو گەورەترین هێزی ئابووری لە جیهاندا دەردەکەوێت. ئێستا ئەو هێزە سەرنجی بەرزترین رێژەی وەبەرهێنانی راستەوخۆی بیانی بۆ لای خۆی راکێشاوە و هاوکات دووەمین گەورە وڵاتیشە لە رووی خەرجی سەربازییەوە لە دوای ئەمریکا. دیارە ئەم دوو ئابوورییە گەورەیە پێویستییان بە سەرچاوەو کەرەستەی خاوی زۆر هەیە، بۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە کە چاودێران کردە سەربازییەکانی ئەمریکایان لە عێراق و لە سەرانسەری جیهانیشدا وەکو بەشێك لە ستراتیجییەتی ئەمریکا بۆ دابینکردنی گەورەترین رێژەی

هەڵگیراوی نەوت و غاز بۆ ئابووری ئەو وڵاتە لێك داوەتەوە. ئێستا ئەمریکا بە شێوەی سەرەکی پشت بە نەوتی هاوردەکراو دەبەستێت، بۆیە هەوڵی زۆری داوە بۆ سوود وەرگرتن لەو سەرچاوەیە،نەك تەنها لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەڵکو لە ئەفریقا و ئەمریکای لاتین و ناوەڕاستی ئاسیاش، بە تایبەتی لە ناوچەی دەریای خەزەر. راپۆرتێکی تازەی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆنگریسی ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٠٦ بە ناونیشانی "دەرهاویشتەکانی ئاسایشی نیشتمانی لە ئەنجامی پشت بەستنی ئەمریکا بە نەوت"، هانی ئیدارەی بوش دەدات بۆ جۆراوجۆر کردنی سەرچاوەکانی وزە و پێشخستنی کاریگەری و وەبەرهێنان لە بواری سەرچاوەی تازەبووەوەی وزەدا.

لە کاتێکدا کە پێداویستییەکانی چین بۆ وزە زیادی کردووە، وا مەزەندە دەکرێت ئەو وڵاتە لە ساڵی (٢٠٥٠) پێویستی بە ١١ هەزار بەرمیل نەوت بێت لە رۆژێکدا. ئەمەش مانای وایا بە بەراورد لە گەڵ ساڵی ٢٠٠٥دا پێداویستی ئەو وڵاتە لە رۆژێکدا بە رێژەی ٦ ملیۆن بەرمیل زیاد دەکات. هەر بۆیە وەبەرهێنانی دەرەکیی چین ئاراستەی وڵاتانی وەکو ئێران و ئەنگۆلا و سودان کراوە بە مەبەستی مسۆگەرکردنی سەرچاوەی زیاتری وزە لە سەرانسەری جیهاندا. دیارە بە پێچەوانەی سالانی حەفتاکان و پرنسیپی "زۆریی سەرچاوە"، سالانی (٢٠٠٠) ەکان شێوازی "زۆریی پێداویستی" یان بەخۆوە بینیوە، چونکە هێزە ئابووریە تازەکانی وەکو چین پێویستی زیاتریان بە وزە هەیە بۆ بەکارهێنانی نێوخۆیی و پیشەسازی.

**روسیا و سەردەمێکی تازە بۆ جیۆپۆلیتیکی سەرچاوەکان**

لەم مانگانەی دواییەدا (ساڵی ٢٠٠٧ — وەرگێڕ)، دامەزراوە حکومییەکانی تایبەت بە وزە لە روسیا وەکو کۆمپانیای گاسپرۆم کاریگەرییەکی زۆرتریان کردە سەر وڵاتانی دراوسێی روسیا وەکو بیلا روسیا و ئۆکرانیا. نرخی بەرزی وزە و پێویستی روو لە زیادبوونی جیهان هاوکات لە گەڵ باڵادەستی بەسەر بۆرییە نەوتی و غازییەکاندا لە لای خۆیەوە هانی روسیای دەدا تا سوود لەو تایبەتمەندییانە وەربگرێت بۆ خۆ بەهێز کردن. هەروەها، کۆمپانیا بیانییەکانی وزە بە شێوەیەك راهێنابوون کە رازی بن بەو کۆت و رێگرییانەی کە ئەو وڵاتە لە سەر خاوەندارێتی ووەبەرهێنان لەو کەرتەدا داینابوو. بەڵام لەوانەیە ئەو خۆشبەختییەی روسیا زۆر درێژە نەکێشێت، چونکە سەرچاوە سروشتییەکانی ئەو وڵاتە زۆر گرانن و هاوکات سەرچاوەی تری وەکو وڵاتی قەتەر غازی شل داین دەکەن کە بە کەشتی دەگوازرێتەوە، ئەمەش مانای وایە غازی قەتەر پێویستی بە بۆری نییە.

یەکێتی ئەوروپاش کە لە بەردەوامیی روسیا وەکو دابینکەرێکی وزە نیگەران بووە، ستراتیجییەتێکی تازەی بۆ وزە لە ساڵی ٢٠٠٧دا دارشت بە مەبەستی جۆراوجۆر کردنی سەرچاوەکانی وزە و پێشخستنی سەرچاوە تازەبووەوەکان بۆ بەربەرەکانێ کردنی دڵەڕاوکێکان لەم رووەوە. رێکخراوە ئەوروپییەکە لە ستراتیجییەتەکەیدا پێشنیاری ئەوەی کردووە کە وەبەرهێنانی زیاتر لە بواری غازی شلدا بکات، بۆ ئەوەی لە لایەکەوە غازی زیاتری لە قەتەرەوە دەستکەوێت، و لە لایەکی ترەوە گەشە بە سەرچاوەکانی وزەی ئەمریکای باشوور بدات لە وڵاتانی بۆلیڤیا و پیرۆ و ڤەنزوێلا.

بێگومان ئەم پێشبڕکێیە بۆ سەرچاوە سروشتییەکان، هەرچەندە ململانێ لە پێناو کۆنترۆڵکردنی وڵاتی زیاتر لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمی سەدەی ١٩ وەبیر دێنێتەوە، بەڵام گرنگیی زۆریشی هەیە بۆ نەخشەی جیۆپۆلیتیکی باڵا دەست لە سەردەمی جیهانگەراییدا. هەندێك لە چاودێران لەوە دەترسن کە ململانێ لە پێناو وەدەستهێنانی سەرچاوەی وزەدا ببێتە هۆی هەڵگیرساندنی چەند شەڕێکی تری گەورە لە جیهاندا. لەو رووەوە هەمیشە ناوچەی دەریای خەزەر لە گەڵ بەرژەوەندیی درێژخایەنی وڵاتان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەکو بریسکەی ئاگری ئەو شەڕە ناوزەد دەکرێت. لە کاتێکیشدا کە ئەمریکا و چین پەرەیان بە بەرژەوەندیە دارایی و سەربازییەکانی خۆیان لەو ناوچانە داوە، چاودێرە جیۆپۆلیتیکییە روسییەکان بەم وەبەرهێنانە لە ناوچەی خەزەر تووشی ترس و دڵەڕاوکێ بوون، چونکە هێشتا ئەو ناوچەیە وەکو بەشێك لە سنوری بەرژەوەندی خۆیان سەیر دەکەن. حکومەتی روسیاش سەرەڕۆیانە گفتوگۆی لەگەڵ وڵاتانی دراوسێی وەکو ئۆکرانیا دەکرد سەبارەت بە نرخی غاز و چۆنێتی دەستگەیشتنی بەو سامانە سروشتییە. هەروەها هەوڵی دەدا بۆ سەپاندنی باڵادەستییەکی زیاتر بەسەر وەبەرهێنانی دەرەکی لە رووی دەرهێنان و سوود وەرگرتن لەو ناوچانەی کە بە نەوت

دەوڵەمەندن، وەکو ناوچەی سیبیریا. ئێستاش سەنتەرە جیۆپۆلیتیکییەکانی روسیا بە فراوانی باس لەوە دەکەن کە پێویستە روسیا سوود لە سەرچاوە سروشتییە گرنگەکانی وەربگرێت بەمەبەستی مسۆگەرکردنی رۆڵێکی زیاتر بۆ خۆی لەسەر ئاستی جیهاندا. ئینجا بە هۆی ئەوەی کە لەوانەیە دەستگەیشتن بە سەرچاوەکانی وزە ببێتە فاکتەرێکی گرنگ بۆ سیستمێکی فراوانتری سیاسیی جیهانی، دەکرێ چاوەڕوانی توندبوونەوەی ململانێ هەرێمایەتییەکانیش لەسەر ئەو سەرچاوەیە بکرێت.

بێگومان بوونی بەردەوامی ئەمریکا لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئەفریقا و ناوەڕاستی ئاسیا "دانی زیاتر بە ئاشەکە دەدات" بۆ چەکدارە ئیسلامییەکان، ئەوانەی کە دژایەتی بوونی کۆمپانیا و هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامی بە گشتی دەکەن.

ئێستا ئەمریکا هێزێکی دروستکەری سەرەکیە بۆ جیۆپۆلیتیکی جیهانی، و شەڕی دژە تیرۆریش بووەتە هۆی زیادکردنێکی گەورە لە خەرجیە سەربازییەکان بە مەبەستی ئەنجامدانی ئەو هێرشانە لە سەرانسەری جیهاندا. ئەمەش لە لای خۆیەوە مشت و مڕێکی زۆری هێناوەتە ئاراوە کە ئایا ئەم ئاستە لە چالاکی ئەمریکا نیشانەی هەڵس و کەوتی ئیمپریالییانەیە یان نا؟ بە لای ژمارەیەك لە چاودێرە تازە- محافەزەکارانی وەکو "ماکس بووت" ەوە، زاراوەی وەکو "ئیمپراتۆرییەت" بووەتە باجی شەرەف و شانازی. بەلای هەندێکی تریشەوە، ئەو جۆرە هەڵس و کەوتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمریکییەکان مافی ئەوەیان هەیە (لە پێناو باشتر کردنی جیهاندا) وەکو ئیمپراتۆرییەت مامەڵە بکەن و لە هەمان کاتیشدا بەرژەوەندی نیشتمانی خۆیان بپارێزن. بەلاّم رەخنەگران لە سیاسەتی ئەمریکا دووپاتی دەکەنەوە "ئەمریکای ئیمپریالی" سەرقاڵی پرۆژەیەکی کۆلۆنیالی و رەگەزپەرستییە کە بۆ ژێر دەستە کردنی چەندین گەل و ناوچە لە بەشی باشووری جیهان داڕێژراوە لە پێناو دابینکردنی بەرژەوەندی بژاردەیەکی سیاسی و بازرگانی کە لە دەرەوەی ئەمریکا کار دەکەن.

بە گشتی پسپۆڕان و چاودێران ناکۆکن لەسەر ئەوەی کە ئایا ئەمریکا بە شێوازێکی ئیمپریالی هەڵس و کەوت دەکات یان نا. هەردوو نوسەر "هارد و نیگری" لە پڕفرۆشترین کتێبیاندا بە ناونیشانی "ئیمپراتۆرییەت"، ئاماژە بەوە دەکەن کە چەندین کاراکتەری وەکو ئەمریکا و دامەزراوە گەورەکان و رێکخراوە حکومییە نێودەوڵەتییەکان پێکەوە کار دەکەن بۆ رێکخستن و پاراستنی بازاڕی جیهانی. واتا لە فەرهەنگی ئەو دوو نوسەرەدا، "ئیمپراتۆرییەت" ئامرازێکی حوکمی جیهانییە کە وابەستە نییە بە سەنتەرێکی هەرێمایەتی تایبەتیی وەکو ئەمریکا.

بەهەر حاڵ، ئێستا زووە بۆ کەمکردنەوە لە گرنگیی بەردەوامبوونی هێـزی سیاسـی و ئـابووری و سەربازیی ئەمریکا و کاریگەریی ئەو هێزانە لە شوێنەکانی وەکو عێراق. نوسەر "مایکـل مـان" لـە دووتوێی هەڵسەنگاندنی بۆ بەرزخوازیی ئیمپریالی ئەمریکا، دەگاتە ئـەو دەرەنجامـەی کـە ئـەمریکا خاوەنی هێزی ئیمپریالی نییە و پشـت بەسـتنیش بـە چارەسـەری سـەربازی بـۆ کێشەکان،نیشـانەی لاوازییە نەك هێز.

وەکو ئەوەی "جۆزیف نای" ئاماژەی پێ دەکات، هێزی سەربازیی گەورە بۆ تێکشکاندنی لایـەنی بەرامبەر سوود بەخشە، بەلاّم ئەگەری کەم هەیە کە لە مەودایەکی دووردا کاریگەر بێت لە چارەسـەر کردنی ململانێکان و بەدی هێنانی ئاشتی و ئاسـایش. دیـارە کـە بـەها سیاسـی و کولتوورییـەکانی ئەمریکا بە ئاشکراو بە توندی رەت کراونەتەوە، و بلاّو بوونەوەی بیرۆکەی دژە ئەمریکا لە رۆژهـەلاّتی ناوەڕاست ئاماژەیە بۆ لەناو چوونی ئەو چەمکەی کـە "جۆزیـف نـای" بـە "هێـزی نـەرم" نـاوزەدی کردووە. "نای" لەم بارەیەوە دەڵێت:

ئەوانەی گومانیان لە هێزی نەرم هەیە (وەکو وەزیری پێشووی بـەرگری "دۆنالـد رامسـفیلد" کـە دان بەوەدا نانێت کە لە زاراواکە تێ ناگات)، بڕوایان وایە کە پەیدا کردنی ناوبانگ بابـەتێکی کاتییـە و نابێت ببێتە نەخشە رێگا بـۆ سیاسـەتی دەرەوە. ئـەوان دووپـاتی دەکەنـەوە کـە ئـەمریکا هێـزی پێویستی هەیە بۆ ئەنجامدانی هەر کردەیەك کـە نیـازی هـەبێت بـە بـێ رەزامەنـدیی جیهـان، بۆیـە پێویستە پێشبینی ئەوە بکات کە ولاّتانی تر رقیان لێی ببێت و حەسوودیشی پێ ببـەن. دیـارە تاکـە زلهێزی جیهان پێویستی بە هاوپەیمانی بەردەوام نییە، بەڵکو پێویستە هاوپەیمانەکانی بە پێـی کێشـەو بابەتەکان بن نەك بە پێچەوانەوە.

بەلاّم لەسەر مەودای دوورتر، گەشە کردنی بەردەوامی چین و هند و پێویستی روو لـە زیادبوونیـان بۆ سەرچاوەی وزە و پێشینەی جیۆپۆلیتیکی، کار دەکاتە سەر ئـەم هەژموونـەی ئێسـتای ئـەمریکا. بێگومان دوور نییە گۆڕانکاری بەسەر ئەندامێتی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایشـی سـەر بـە نەتـەوە یەکگرتووەکاندا بێت، چونکە ولاّتانی وەکو بەرازیل و هند و ئەندەنوسیا داوای بە فەرمی ناسین دەکـەن لەو ولاّتانەی کە لایەنی براوە بوون لە شەڕی دووەمی جیهاندا. بەلاّم لەوانەیە داواکاری ژاپۆن بۆ بـوون بە ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەنەکە لە لایەن ولاّتی چینەوە بەربەرەکانێ بکرێت. بێگومان بـە هـۆی پێشێلکردنی زەقی شـەرعییەتی نێودەوڵـەتی لـە لایـەن ئیـدارەی سـەرۆك( بـوش ) ەوە لـە رێگـای راوەدوونانی بێ رەحمانەی ئەو کەسانەی هێرشەکانی ١١ی سیپتەمبەریان جێبـەجێ کردبـوو، تەحـەدا کردنی ئەمریکا وەکو تاکە هێزی جیهانی بەردەوام دەبێت . ئەڵبەتە هەر قـازانجێکی کـورت مـەودای

سیاسی یان ئابووری كه لـەم سـتراتیجییەتەی ئێسـتای ئـەمریكا وەدەسـت بێـت، لەوانەیـە لەسـەر مەودایەكی دوور ناوبانگی ئەمریكا و هاوپەیمانـە نزیكـەكانی وەكـو بـەریتانیا لـە جیهانـدا لەكـەدار بكات.

## دەرەنجامەکان

بێگومـان رقـی ئاشـكراو بـێ پـێچ و پـەنای ئیـدارەی سـەرۆك بـوش لـە نەخشـەی ئێسـتای جیۆپۆلیتیكیی و یاسای نێودەوڵەتی، بوونەتە پاڵنەر بۆ دەربڕینی هەستی دژە ئەمریكایی تەنانەت لـە دەرەوەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامییش. هەروەها دەرفەتی خوڵقانـدووە بـۆ حكومەتـە میللییەكانی كیشوەری ئەمریكای لاتینی (چاڤیز لە ڤەنزویلا و مۆرالیز لە پۆلیڤیا)
( چاڤیز لە دونیادا نەماوە بەلاّم رژێمەكەی بەردەوامە——وەرگێڕ) كە رۆڵی خۆیان ببینن لە نیشـاندانی "ئیمپریالیزمی ئەمریكی" و باس لە" تەوەری خەیر" بكەن لە بەرامبەر ئەمریكا و هاوپەیمانەكانیدا.
ئەم ولاّتانە لە گەڵ ئێران و روسیا، بەهۆی نغـرۆ بوونیـان لـە نـاو داهـاتی وەدەسـتهاتوو لـە رێگـای فرۆشتنی نەوت و غازەوە، توانیویانە لە رووی ئەمریكا بوەستن و جار بەجاریش گاڵتەی پێ بكـەن، بـە تایبەتییش كە لەوە دڵنیا بوون ئابووری ئەمریكا هەمیشە بە دوای سەرچاوەی نەوت و غـازدا هەڵپـە دەكات. لەوەش خراپتر و بە هۆی ئەو پاشا گەردانییەی كە عێراقی پێـدا تێپـەڕ دەبێـت و تێیـدا ئـەم ولاّتە نەیتوانیوە چوارچێوەیەكی یاسایی بۆ كۆمپانیا بیانییەكان دابین بكات تا گەشە بە وەبـەرهێنان و پێشخستنی كەرتی نەوتی عێراق بدەن، بەرهەمی نەوتی عێراق هەر بە گەشە نەكردووی دەمێنێتـەوە.
(لەم بوارەدا دەكرێ كوردستان جیا بكرێتەوە چونكە ئەو هەنگاوانەی بە سەركەوتوویی ناوە- وەرگێـڕ).
ئەڵبەتە ئەم شێوازە بۆچوونە سەبارەت بە یاساو رێسا نێودەوڵەتیەكان هانی رەخنـەگرانی لـەناو ریـزی چەكدارە ئیسلامییەكاندا داوە كە بە بەڵگەوە ئاماژە بە رەچاو نـەكردنی مافـەكانی مـرۆڤ بكـەن لـە لایەن ئەمریكاوە، ئەمەش پاساویان دەداتێ تا كۆمەڵگا مرۆییەكانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و جیهـانی ئیسلامی هەڵخەڵەتێنن و بە لاڕێـدا بیانبـەن. هـەر وەكـو ئـەوەی ژمارەیـەكی زۆر لـە رەخنـەگرانی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی ئاماژەی پێ دەكەن، هـەر كـاتێ تاكـە ئەمریكییـەكان رەچـاوی مافـە بنەڕەتییەكانی كەسانی تر نەكەن، ئەوا ولاّتەكەیان تووشـی دارِمـانێكی كولتـووری گـەورە دەبێـت.
ئەڵبەتە ئەم كارە لە دڕندەیی كاری گروپە چەكدارە ئیسلامییەكان كـەم ناكاتـەوە، بـەڵكو ئـەوە روون دەكاتەوە كە تا چی رادەیەك گرنگە وا لە ئەمریكا بڕوانرێت كە لـە هـەڵس و كەوتەكانیـدا ئەوپـەڕی رێز لە ستانداردە یاساییە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەكان دەگرێت.




١٣. تەنگژەی بارمتە ئەنکلۆ- ئێرانییەکان (٢٠٠٧)

دیارە نەخشەی جیۆپۆلیتیکی ئێستا روو بەڕووی چەندین تەحەدا بووەتــەوە، چــونکە هەســتی دژە ئەمریکایی بووەتە پاڵپشت بۆ بزووتنەوە دژە جیهانگەراییەکان، چەکدارە ئیسلامییەکان، ململانێکــان لەسەر سەرچاوەی وزە، و هەروەها تەحــەدا جیۆپۆلیتیکییــەکانی تــری وەکــو وڵاتــی چــین. هاوکــات ئەمریکا وەکو گەورەترین زلهێزی جیهان بە سەرمەشقی شێوازی لیبراڵیــەتی تــازە لــە جیهانگەراییــدا هەژمار دەکرێت. بێگومان گەورەترین کێشەی ئیدارەکانی دوای سەرۆك بوش ئەوەیــە چــۆن ئــەمریکا شــەرعییەتی نێودەوڵــەتی وەدەســت بێنێتــەوە، و هاوکــات بگەڕێتــەوە بــۆ نــاو ریــزی پێکهاتــە نێودەوڵەتییەکان کە لە لە سەدەی رابردوودا یارمەتی ئەمریکایان داوە بــۆ وەدەســتهێنانی هــەژموونی ئێستای. داگیرکردنی عێراقیش نیشانەیەکە بــۆ هــەژموونی بــەرزخوازی ئەمریکا،کــە تێیــدا بــوونی سەربازی ئەو وڵاتە چارەنووسساز بوو لە داڕشتنەوەی ژێرخانی ئابووری و سیاسی عێراقدا. لەولاشــەوە هێزی ئابووری چین وهێزی سەربازی ئیسلامییەکانیش، هەر یەکەو بە رێگای تایبەتی خۆی، دووپــاتی دەکەنەوە کە ناکرێ سەدەی (٢١) بە سەدەیەکی ئەمریکی ناوزەد بکرێت.

# بەشی چوارەم

# جیۆپۆلیتیك و ناسنامە

لە رۆژی ٢٠٠١/٩/١٢ رۆژنامەی "لومۆند" ی فەرەنسی ناونیشانێکی بلاّو کردەوە کە دەلێت: "ئێستا ئێمە هەموومان ئەمریکیین". دیارە وەکو ئاماژەی هەماهەنگی کردن لە گەلّ ولاّتێکی تردا،ئەو ناونیشانە تەنها یەکێك بوو لە دەیان هەولّی نیشاندانی هاوسۆزی جیهانی لە گەلّ ئەمریکا لە ئەنجامی هێرشەکان بۆ سەر سەنتەری بازرگانیی جیهانی و پەنتاگۆن لە رۆژی پێشتردا. سەرۆك و سەرۆك وەزیرەکان بە خێرایی پەیوەندییان بە "جۆرج دەبلیو بوش" ەوە کرد بۆ دەربڕینی سەرەخۆشی . بەشێك لەو سەرکردانە توشی شۆك بوون کاتێ بۆیان دەرکەوت کە پاشماوەی وێرانکارییەکەی سەنتەری ناوبراو بووەتە گۆڕی ژمارەیەك لە هاوولاّتیانی خۆیانیش. بە هەر حالّ شعرێکی شاعری ئەمریکی " و. هـ. ئۆدن" بە ناونیشانی "١ی ئەیلوولی ١٩٣٩" هەندێك سەبووری بە زیان لێکەوتووانی ئەو رووداوە بەخشی:

لەسەر یەکێك لە نغرۆ بووەکان دانیشتووم
لە جادەی پەنجاو دوو
نیگەران و ترساو
کاتێ کە ئاواتە زیرەکەکان تەواو دەبن
لە دەیەیەکی نزم و نا شەریفدا:
شەپۆلی ترس و کینە
بە دەوری رۆشناییدا دەسوورێتەوە
و پارچە تاریکەکانی زەوی
بوونەتە خولیای ژیانی تایبەتیمان
بۆنی لە وەسف نەهاتووی مردن
شەوی سیپتەمبەر زویر دەکات.

لە ئەنجامی ئەو"بۆنی مردن"ەشدا، رۆژی ١١ی سیپتەمبەر نەك تەنها بووە تراجیدیایەك بۆ ئەمریکا و شاری نیویۆرك، بەلّکو خەم و پەژارەیەکی گشتیی خولقاند، چونکە کۆتایی بە ژیانی ژمارەیەکی زۆر لە خەلّکی ولاّتە جیاجیاکانی جیهان هێنا. ناونیشانەکەی سەرەوەش دووپاتی کردەوە

که چۆن پرسی ناسنامه له رووی سۆزو جوگرافیاشەوە بەیەکەوە بەستراونەتەوە. بـەلاّم دوای ماوەیـەکی کورت، مۆرکێکی نیشتمانی بە رووداوەکە درا و بە هێرش کردن بۆ سەر ئـەمریکا نـاوزەد کـرا. رووی تراجیدی پرسەکەش ئەوە بوو، وەکو جێگـری پێشـووی سـەرۆکی ئـەمریکا،ئال گـۆر، ئامـاژەی پـێ کرد،ئەمریکا بە دەست تێوەردانی تاکلایەنە لە عێراق و چەند چالاکییەکی تر کە چـاودێرانی سیاسـی بە زیانبەخش بۆ یاسای نێودەوڵەتی هەژماریان دەکرد، ئەو سۆزە جیهانییەی بەرامبـەر بـە خـۆی لـە دەست دا. ئێستا بێگومان هەمووومان ئەمریکی نین!

لە ئەنجامی ئەو دۆخەشدا، ئێستا دەرکەوتنی کتێب و وتارو پەیام لە ئینتەرنێتدا کـە بـە ئاشـکرا ئیدارەی بوش سەرزەنشت دەکەن، مایەی سەرسوڕمان نییە. بە لای زۆرێك لـە چـاودێرانەوە، بـە بـێ رەچاو کردنی رادەی ئاشناییان بە ولاّتــە ٣٠٠ ملیۆنییەکە،ئـەو نەتەوەیـە زیـاتر بـە وەسـفی وەکـو "ئیمپراتۆرییەتی شەڕ" یان "ولاّتی زیانبەخش" ناو دەبـەن تـا ئـەوەی زاراوەی "قوربـانیی" دەسـتی توندوتیژی تیرۆریستی بۆ بەکار بهێـنن. ئەڵبەتـە خـراپ بـوونی ناوبـانگی نێودەوڵـەتی، ولاّتـان بـە رادەیەکی زۆر تووڕە دەکات، چونکە ناسـنامەی نیشـتمانی و بابەتـەکانی پەیوەندیـدار بـە ئامانجـە نیشتمانییەکانەوە زۆر جێگای بایەخی سەرجەم ولاّتـانن. هـەتاکو ولاّتـە گـەورەو بـەهێزەکانی وەکـو ئەمریکاش نیگەران دەبن لە شێوەی وێناکردنی ناسنامەو رواڵەتیان لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی. زانـای سیاسیی هۆڵەندی "پیتەر ڤان هام" لە دووتوێی بابەتێکیدا لە گۆڤاری "فۆریەن ئەفەیـەرز" دووپـاتی دەکاتەوە کە بابەتەکانی تایبەت بـە بونیاتنـانی وێنـە و نوێنەرایـەتی کردنـی ولاّتـان لـە سـەردەمی ئێستادا گرنگییەکی زیاتریان پەیدا کـردووە، چـونکە ئێسـتا گۆڕانکارییـەکی گـەورە لـە سیاسـەتی نێودەوڵەتیدا هاتۆتە ئاراوە، تێیدا، وەکو "هام" دەنوسێت، "گۆڕانکاری و جموجوڵێك دروست بووە لـە جیهانی مۆدێرنی هێز و سیاسەتەوە بۆ جیهانی پۆست مۆدێرنی وێنە و کاریگەرییەکانی":

لەم رۆژانەدا، تاکـەکان، دامـەزراوەکان، شـارەکان، هەرێمـەکان، ولاّتـان، و کیشـوەرەکانیش بـە شێوەی پرۆفیشناڵ لە رێگای تەکنیکی فرۆشتنەوە خۆیان پێناسە دەکەن. بە راستی،ناوبانگی خـراپ و یان نەبوونی ناوبانگ بە کەم و کوڕییەکی جیددی بۆئەو ولاّتانە هەژمار دەکرێت کە هەوڵ دەدەن درێـژە بە بەربەرەکانێ بدەن لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی، چونکە ولاّتی ناوبانگ زڕاو بە زەحمەت دەتوانێت لـە رووی سیاسی و ئابوورییەوە سەرنجی ولاّتان بۆ لای خۆی رابکێشێت.بەمەش وێنـەو ناوبـانگ بوونەتـە بەشی بنەڕەتی لە ستراتیجییەتی هەموو ولاّتاندا.

سەرکردە سیاسییەکان و رۆژنامەنوسان بە گشتی پشت بە نەریتی جیۆپۆلیتیکی و کلتوری بینـراو و مێژووی نیشتمانی دەبەستن بۆ دەربڕین و بەهێز کردنی ناسـنامەو ئامـانجی نیشـتمانییان. ئەڵبەتـە

پێویسته ساتەوەختە نائاساییەکانی وەکو هێرشـەکانی ١١ی سـیپتەمبەری ٢٠٠١ و دیمەنـە وێنەییـە وابەستەکانی وەکو سووتانی سەنتەری بازرگانیی جیهانی، نەبنە مایەی تەم و مـژاوی کردنـی شـێوازە ئاساییەکانی ناسیۆنالێزم. هەر وەکو "مایکل بیلیگ" یش ئاماژەی پێ کردووە، ژیانی رۆژانە پڕە لـەو کردەوەو سیمبولانەی کە نیشانەی ناسنامەی نیشتمانی و هەرێمایـەتیین وەکـو ئـالا و دراو و هـەواڵی نیشتمانی و ئاماژە کردن بە هەرێم و نیشتمان بـە زاراوەی وەکـو "خـاکی بـاو بـاپیران " یـان تـەنها "نیشتمان" وەکو ئەوەی لە ئەمریکا بەکار دەهێنرێـت. دیـارە حکومەتـەکان کـات و شـوێن بـەکار دەهێنن بۆ مسۆگەرکردنی ناسنامەی نیشتمانی. بۆ نموونە، نەخشـەو سـنووری وڵات دیـاری دەکرێـت ولە بەرواری دیاریکراویشدا ئاهەنگ دەگێڕدرێت وەکو ئاماژەیەك بە رۆژی نیشـتمانی وەکـو رۆژی ٤ی تەمووز لە ئەمریکادا. لەولاشەوە چەند دیمەنێك وەکو پیرۆز یان نیشـانەی میراتـی نیشـتمانی نـاوزەد دەکرێن. بۆ نموونە، "گراوند زیرۆ" لە شاری نیو یۆرك شـان بـە شـانی چـەند شـوێنێکی تـری وەکـو پەیکەری ئازادی، بریتین لە سـیمبولێ گـرنگ بـۆ ئـەمریکا وەکـو ولاتێکـی سەرمەشـقی ئـازادی و دیموکراسی.

لە لایەکی ترەوە، ئەمریکا وەکو ولاتێکی شۆڕشگێڕ لە نموونـەی فەرەنسـا و روسـیا، پـەرەی بـە پرنسیپەکانی مافی چـارەی خۆنوسـینی نیشـتمانی و دژە کۆلۆنیـالێزم دەدا، هـەروەها بەشدارییشـی کردووە لە دارِشتنی سیستمی جیهانیی دوای ساڵی ١٩٤٥. لە سەردەمی شەڕی ساردیشدا، بیرۆکـەی بوونی ئەمریکا بە نموونە بۆ پەیڕەو کردنی لە سەرانسەری جیهاندا، زیاتر بایەخی پـێ درا بـە تایبـەتی کە نموونەیەکی رکابەر لە بەرامبەریدا هەبوو، ئـەویش نموونـەی ناسـیۆنالی بـوو کـە لەسـەر بنـەمای سۆشیالیزم دارێژرابوو بۆ رکابەری کردنی سەرمایەداری و دیموکراسیەتی لیبرالی پەیڕەو کراو لـە لایـەن ئەمریکاوە. بەلام دەبێ ئەوەش بلێین کە لەو کاتـەی ئـەمریکا رابەرایـەتی دیموکراتیـەتی لیبرالـی لـە جیهانـدا دەکرد،هاوولاتیـانی ئـەفریقی- ئـەمریکی لـە خەباتـدا بـوون بـۆ مسـۆگەر کردنـی مافـە مەدەنییەکانیان و بەشداریشیان دەکـرد لـەو سیاسـەتە دیموکراتییـەدا. بـەلام لـە رووی جوگرافییـەوە ئەفریقیە ئەمریکییەکان لە رەوتی گشـتی ژیـانی کۆمەلایـەتی و سیاسـی جیـا کرابوونـەوەو مـافی دەنگدانیشیان پێ نەدرابوو. بۆیە هەر بانگەشەیەك بۆ" ناسنامەی نیشتمانی" پێویستی بـە وردبینـی دەبێت بۆ ئەوەی بزانرێت ئەو ناسنامەیە کێ دەگرێتەوە، چی دەگرێتەوە، و لـە چـی جێگایەکـدا؟ بـەم شێوەیەش هەمیشە چەمکەکانی مێژوو و جوگرافیا پڕ گرفتترن لەوەی کە بژاردەی سیاسی مەزەندەیان دەکات.

ئەم بەشە تایبەتە بە باسکردنی هەندێك لەو بابەتانەی کـە لـە رێگـای زاراوەی وەکـو ناسـنامەی نیشـتمانی ئاماژەیـان پـێ کـراوە، و دووپـاتی دەکاتـەوە کـە تـوخمێکی سـەرەکی لـە تیـۆرەکردنی جیۆپۆلیتیـك پەیوەسـتە بـەم بابەتەوە.پێویسـتە ناسـنامەی نیشـتمانی بونیـات بنرێـت وهەمیشـە مێژوونوسان لە پێش هەمووانەوە بوون لە تێبینـی کردنـی ئـەوەی کـە چـۆن نـەریت و تایبەتمەنـدیی نیشـتمانی دادەهێنرێـت. دیـارە پرۆسـەی دروسـتکردن و دروسـتکردنەوەی ناسـنامەی نیشـتمانی پرۆسەیەکی جوگرافی و داهێنەرانەیە، چونکە پەیوەسـتە بـە چـەند شـوێنێکی تایبەتـەوە. بێگومـان چیرۆکی ناسنامە تەنها پەیوەسـت نییـە بـە ئاسـتی دەوڵـەتی نیشـتمانییەوە، بـەڵکو لەسـەر چـەند ئاستێکی جوگرافییش کار دەکات هەر لە ئاسـتی نیمچـە نیشـتمانییەوە بگـرە تـا دەگاتـە دەرەوەی ناوچەیی و لە کۆتاییشدا ئاستی جیهانیی. ئەو نموونانەی لەم بەشەدا باس دەکرێن، یـەکێتی ئـەوروپا و رێکخراوە هەرێمایەتییەکانی تریش دەگرنەوە. هەروەها نموونەکان باس لەو شێوازە دەکـەن کـە گروپـە کلتوری و سیاسییەکانی تری وەکو گروپە نیمچە نیشتمانییەکان و بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان و گروپـە پەرتەوازەکان بەکاری دێنن بۆ تەحەدا کردنی چەند بانگەشەیەکی تایبـەت بـە ناسـنامەی نیشـتمانی. لەبەر ئەوەی توانـای ولاتـانیش بـۆ کـۆنترۆڵکردنی دۆخـی ئـابووری و سیاسـی و کولتـووری خۆیـان رووبەڕووی بەربەرەکانێی کاراکتەرە غەیرە حکومییەکان دەبێتەوە، ئەو بانگەشـانە گرنگیـی زیاتریـان وەرگرتووە و هاوکات بوونەتە بانگەشەی زۆر ترسناکیش.

## جیۆپۆلیتیك و ناسنامەی نەتەوەیی

یەکەم دروستبوونی سیستمی مۆدێرنی سیاسیی نێودەوڵەتی کە لەسەر دەوڵەتی نەتەوەیی بونیـات نرابێت بە دەسەلاتی هەرێمایەتی تایبەتمەندەوە، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ١٧ لە ئەوروپادا. بـە درێـژایی سەدەکانی دواتریش، حکومەتە نەتەوەییەکان دەرکەوتن و توانییان لە رێگای دیبلۆماسییەت و یاسـای نێودەوڵەتییەوە مۆزاییکێك لە ولاتان دروست بکەن کە ئێستا سەر رووی زەوی گرتۆتەوە، بێجگـە لـە کیشوەری بەستەڵەکی باشوور و بەشێك لە زەریاکان. لەبـەر ئـەوەی کـە ئەرکـەکانی حکومـەت وردە وردە کاروباری رۆژانەی هاوولاتیانیشی هاتـە سـەر،حکومەتە نەتەوەییـەکان هەوڵـەکانیان زیـاتر لـە بابەتی دروستکردن و پارێزگاری کردن لە ناسنامەی نەتەوەیی لە رێگای کۆنترۆڵکردن و یـان چـاودێری کردنی میدیای نیشتمانی و کەرتی پەروەردە و فێربوونەوە چڕ دەکردەوە. بۆ نموونە لە حاڵـەتی ولاتـی ئەرجەنتین کە لە ساڵی ١٨١٠ دا سەربەخۆیی لە ئیمپراتۆرییەتی ئیسپانیا راگەیانـد، ئـەم پرسـە بـە خاڵێکی بنەڕەتی دادەنرا لە مانەوەی دەوڵەتی نەتەوەییدا. ئـیتر پرۆسـەی دروسـتکردنی "کۆمـەڵگای

خەو- بۆ- بینراو"، بە قسەی بینیدکت ئەندیرسون، چەند شێوازێکی بەخۆوە بینی، یەکێکیان بریتی بوو لە داهێنانی "پەروەردەی نیشتمانپەروەرانە" لە کۆتایی سەدەی ۱۹، بە مەبەستی چەسپاندن و بەهێزکردنی هۆشیاریی نیشتمانی. ئەڵبەتە دانانی کاتی ئەو ریفۆرمە پەروەردەییانە بە رێکەوت نەبوو. حکومەتی بۆینس ئایرس تەنها دەسەلاتی سەروەریی خۆی بەسەر چەند ناوچەیەکی جوگرافی تازەدا بلاو نەکردبووەوە بە ناوچەی باشووریی "پاتاگۆنیا"شەوە، بەڵکو پێویست بوو هەوڵ لەگەڵ چەند شەپۆلێکی تازەی کۆچبەراندا بدات بە تایبەتییش لە ئیتاڵیا و ئیسپانیاوە بە مەبەستی ئاشناکردنیان بە چەمکی "هاوولاتی بوونی ئەرجەنتینی".

لە چوارچێوەی ناوچەی ئەمریکای باشووریشدا، بابەتی سنوورە هەرێمایەتییەکان وەکو پرسێکی هەستیار هەر مانەوە، چونکە ولاتانی وەکو ئەرجەنتین و چیلی و بۆلیڤیا و پاراگوای و بەرازیل هەمیشە لە گفتوگۆدا بوون دەربارەی هەرێمە نیشتمانییەکان و سنووری ناوچەکانیان. بۆ ئەم مەبەستەش، جار بەجار پەنایان وەبەر هێزە سەربازییە تازە پێگەیشتووەکانیان دەبرد. ئەم پرۆسەیە سوودێکی زۆرتری بۆ ئەرجەنتین هەبوو، چونکە لە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیانەدا، ئەو ولاتە لە لایەکانی باشوورو باشووری رۆژئاواو باکووریشەوە فراوانتر بوو. ولاتانی تر، وەکو پاراگوای، کەمتر سوودمەند بوون و ئەوەی پێی دەوترێت "شەڕی سێ هاوپەیمانەکە" دەرەنجامی وێرانکارانەی بەدواوە هات. ( ئەو شەڕە لە ١٨٦٤ تا ١٨٧٠ لە نێوان ولاتی پاراگوای لە لایەك و ولاتانی ئەرجەنتین و بەرازیل و ئۆروگوای لە لایەکی ترەوە لەسەر داڕشتنی سنوور روویدا- وەرگێڕ). لە ئەنجامدا پاراگوای بەشێك لە خاکەکەی و نزیکەی ٥٠٪ی لە دانیشتوانەکەی لە ئەنجامی زنجیرەیەك شەڕ لەگەڵ ئەو سێ ولاتەدا لە دەست دا.

سەبارەت بە بۆلیڤیا کە ولاتێکی داخراوە، لە ئەنجامی "شەڕی زەریای هێمن" کە ولاتانی چیلی و (پیرۆ) ش تێیدا بەشدار بوون، بۆلیڤیا ناوچەیەکی رێڕەوی بەرەو زەریای هێمن دۆڕاند. هەرچەندە بە بەراورد لە گەڵ بۆلیڤیا و پاراگوای، ئەرجەنتین بە براوە لە ناوچەکە هەژمار دەکرا، بەلام رووداوێکی سەدەی ۱۹ کاریگەریی دراماتیکی کردە سەر شێوازەکانی دەربڕینی ئامانج و ناسنامەی نیشتمانی ئەو ولاتە. ئەو رووداوەش بریتی بوو لە لەدەستدانی دوورگەکانی فۆکلاند بۆ بەرژەوەندی ئینگلتەرا لە ساڵی ۱۸۳۳. ( لە سالانی هەشتاکانی سەدەی رابردووشدا ئەو کێشەیە سەری هەڵدایەوەو شەڕ لە نێوان ئەو دوو ولاتە دروست بووەوە، بەلام بە زوویی بە کۆتا هات، وەکو لە درێژەی ئەم بەشەدا باس دەکرێت. ناوی ئیسپانی دوورگەکان "ئیسلاس مالڤیناس" ە - وەرگێڕ).

یەکێك لە خاڵە زۆر گرنگەکانی پرۆسەی پەروەردەی نیشتمانی لە وڵاتی ئەرجەنتین ئەو وانە جوگرافییە بوو کە ئەرجەنتین وڵاتێکی ناتەواوە. لکاندنی ئەو دوورگانەی باشووری ڕۆژئاوای زەریای ئەتڵەسی کە دواتر بە "خوشکە بچووکە ونبووەکان" ناسران بە وڵاتی ئینگلتەرا، نیگەرانی بەردەامی بۆ ئەرجەنتینییەکان دروست کردووە، و وەکو توخمێکی تەواوکەر لە پرۆسەی دەربڕینی ناسنامەی نیشتمانیی ئەرجەنتیندا دەمێنێتەوە. ئەم بابەتە لە پرۆسەی خوێندنی قوتابخانەکاندا بەردەوامەو تێیدا داوا لە هەموو قوتابییەك دەکرێت کە نەخشەی دوو دوورگە سەرەکییەکە بکێشن، واتا (فۆکلاندی ڕۆژهەڵات و فۆکلاندی ڕۆژئاوا، بە پێی ناوزەد کردنی ئینگلیزی زمانەکان). هەروەکو زاراوەی " خوشکە بچووکە ونبووەکان" دەری دەخات، بە شێوەی جەندەر ئاماژە بە ناوچەکە دەکرێت و وەکو خوشکێکی لکێنراو بە لاشە سیاسیەکەی ئەو وڵاتە باسی لێوە دەکرێت. هەر بۆیە مایەی سەرسوڕمان نەبوو کاتێ هێزە سەربازییەکانی ئەرجەنتین دوورگەکانی فۆکلاندیان "داگیر" کرد لە ساڵی ١٩٨٢، پاساوی وڵاتی ئەرجەنتین ئەوە بوو کە ئەو کارە رزگارکردنێکی جوگرافی بووە بۆ ناوچەیەك کە پێشتر "رفێنرابوو" لە لایەن "ئەلبیۆن"ی ناپاکەوە. (ئەلبیۆن کۆنترین ناوی دوورگەکانی بەریتانیای گەورەیە و ئێستا تەنها جار بەجار لە چوارچێوەیەکی شعریدا وەکو ئاماژە کردن بۆ بەریتانیا بەکار دێت- وەرگێڕ). دیارە جەماوەری ئەرجەنتینی بەو کردە سەربازییە زۆر خۆشحاڵ بوون و ژمارەیەکی زۆریان لە گۆڕەپانی سەرەکی لە تەنیشت گالەری "پینك هاوز" کۆبوونەوە بۆ ئاهەنگ گێڕان و دەربڕینی خۆشحاڵی بەرامبەر ئەو هەنگاوەی ڕژێمی سەربازی وڵاتەکەیان. بێگومان ئەم دیمەنە بە لای خەڵکی غەیرە ئەرجەنتینییەوە کە باکگراوندی کێشەکەیان نەدەزانی، زۆر دڵخۆشکەرو سەرنج ڕاکێش بوو. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو ڕژێمە و ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی وڵاتی ئەرجەنتین لە ڕابردوودا هاووڵاتیانی خۆیانیان دەچەوساندەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، پەروەردە جوگرافییەکە ئەوەندە کاریگەر بوو کە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی ئەرجەنتین لەو کاتەدا ئارەزوویان دەکرد بەشداری لەو ئاهەنگەدا بکەن.



١٤. سەربازێکی مارینز لە کاتی پشکنینی دیلێکی ئەرجەنتینیدا لە رۆژئاوای دوورگەکانی فۆکلاند لە دوای خۆبەدەستەوەدانی هێزە سەربازییەکانی ئەرجەنتین لە شەڕی فۆکلاند. ١٩٨٢/٦/١٧

به گشتی، سەرکەوتنی بەریتانیا لە شەڕەکەی ساڵی ١٩٨٢ بە تەواوەتی ئەم قەیرانــە ناوچــەییەی چارەسەر نەکرد. بەڵکو بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئــەو کاتــەی حکومـەتەکــەی مارگرێـت تاتچــەر، ئێستاش هاووڵاتیانی ئەرجەنتین لەسەر ئەوە رادەهێنرێن کە ئەو زوڵمــە لەســەر ناوچــەکەیان هــەر بــە زیندوویی لە هزری هەمـوواندا دەمێنێتەوە. ئێستاش سەردانەکەی خۆم بۆ ئەرجــەنتین لــە ســەروبەندی یادی دەیەمین ساڵی شەڕەکەدا لەبیرە، تێیدا بە روونی هەســتە جوگرافییەکــەی خــەڵکی ئــەو وڵاتــەم دەبینی. هەرچەندە بەریتانییەکان بەوە خۆشحاڵ بوون کە یــادی رووداوەکــە وەکــو رابردوویــەکی نزیــك بکەنەوەو بیبەستنەوە بە سەرکەوتنەکانی پێشووی حکومـەتەکەیان لە شەڕی دووەمی جیهانیی، بــەڵام حکومەت و میدیاکانی ئەرجەنتین هەوڵیان بۆ ئەوە دەدا هاووڵاتیــان و تەنانــەت گەشــتیارانیش لــەوە دڵنیا بکەنەوە کە ململانێی نێوان ئەرجەنتین و بــەریتانیا بەردەوامــە. ئەگــەر خوێنــەر ســەیری هــەر گۆڤارێکی ئەرجەنتینی بکردایە و چاوێکی بە دۆخی کــەش و هــەوای ئــەو وڵاتــەدا بخشــاندایە، بــۆی دەردەکەوت کە دوورگەکانی فۆکلاند بە "مالڤیناس" ناوبراوە، ئەمەش بە بێ دوودڵی ئاماژە بــوو بــۆ ئەوەی ئەرجەنتین ئەو دوورگانە بە خاکی خۆی دەزانێــت. لە کۆتایی چــلەکانی ســەدەی رابردوویشــەوە هەر نەخشەیەکی کۆماری ئەرجەنتین بە بێ دەرخستنی ئەو دوورگانە بە بێ حورمــەتی بەرامبــەر ئــەو وڵاتە هەژمار دەکرێت. نەخشەو دیواربەندییەکانیش هەمیشە ئەوە بە بــیر هاووڵاتیــان و گەشــتیاراندا دەهێننەوە کە ئــەو دوورگانــە لــە رووی جوگرافییــەوە نــزیکن لــە ناوچــەی پاتاگۆنیــاوە. (پاتاگۆنیــا ناوچەیەکە لە بەشی باشووری ئەمریکای باشوورو هاوبەشە لە نێوان ئەرجــەنتین و چــیلیدا - وەرگێــڕ). بۆیە هەمیشە رەخنە لە سەروەریی بەریتانیا بەســەر ئــەو دوورگانــەوە دەگیرێــت و نــەك تــەنها وەکــو بیرخەرەوەی هەوڵە ئیمپریالییەکانی پێشووی ئەو وڵاتە دەژمێردرێت، بەڵکو وەکــو ئاماژەیــەکیش بــۆ شێوازێکی ناشیرین لە فراوانخوازیی جوگرافی بەریتانیا ســەیر دەکرێــت. لــە ســاڵی "١٩٨٢"یشــەوە، چەندین مۆنومێنتی گشتیی شەڕەکە کە لە بۆینس ئایرس و شوێنەکانی تر دانــراون، دەرفــەتی زیــاتر دەخوڵقێنن بۆ زیندوو راگرتنی هەستی کولتووری و جوگرافی ســەبارەت بــە ســنوورە نیشــتمانییەکانی ئەرجەنتین.

**دوورگەکان و ناسنامەی نیشتمانی: چین و تایوان**

دیارە ئەرجەنتین تەنها ولآت نییە کە سەرقاڵی وەدەستهێنانەوەی چەند دوورگەیەك بێت کە لە رووی جوگرافییەوە لە سنوورەکانیەوە نزیکن. نموونەی دووەم بریتیە لە حاڵەتی چین و تایوان. لە ساڵی ١٨٩٥دا ژاپۆن ئەو دوورگانەی داگیر کرد و لەوێ مایەوە هەتاکو کاتی خۆبەدەستەوەدانی لە کۆتایی شەڕی دووەمی جیهاندا. کاتێ سەرکردەی نیشتمانی "چیانگ کای شیك" لە ساڵی ١٩٤٩ شەڕی ناوخۆی بە پارتی کۆمۆنیستی چینی دۆڕاند، بەرەو ئەو دوورگانە هەڵهات. لەولاشەوە، پارتی کۆمۆنیستی چین " کۆماری چین"ی تایوانی بە ناشەرعی لەقەڵەم دەدا،سەرەڕای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ولآتانی رۆژئاوا ئەو کۆمارەیان بە فەرمی ناسیوە. لە بەشی زۆری ماوەی شەڕی ساردیشدا و سەرەڕای گەشەی ئابووری زۆر لەو ولآتەدا، چەندین حکومەتی فاشیستی و تاك حزبی لە تایواندا فەرمانڕەواییان کرد. تایوان وەکو هاوپەیمانێکی رۆژئاوا هەمیشە لە ژێر سێبەری پاراستنی ئەمریکادا بووە. لە هەشتاکان و نەوەتەکانیشدا، گۆڕانکارییەکی دیموکراتی لەو ولآتەدا بەدی هات. بەلآم لەلایەکی ترەوە کۆماری چین لە ساڵی ٢٠٠٥دا،یاسای دژە جیابوونەوەی دەرکرد و بە پێی ئەو یاسایە، ئەگەر تایوان هەوڵی جیابوونەوە لە چین بدات، ئەوا چین داگیری دەکات. ئێستاش لە ولآتی چیندا هەمیشە ئەوە بە بیری هاوولآتیاندا دەهێنرێتەوە کە تایوان بەشێکی دانەبڕاوەی (کۆماری چین) ە و بابەتی جوگرافیا لە قوتابخانەکاندا رۆڵی خۆی دەبینێت لە چەسپاندنی ئەو راستییە، بۆ ئەوەی چینییەکان زانیاری دروستیان لەو بارەیەوە پێ بگات. ئێستاش بەردەوام تایوان وەکو بریسکەی ئاگری شەڕی داهاتوو لە نێوان چین و ئەمریکا سەیر دەکرێت.

بێگومان خولیای وەدەس هێنانەوەی دوورگەکانی فۆکلاند ماناو ئاماژەی فراوانتر بۆ ناسنامەی نەتەوەیی ئەرجەنتین بەخۆوە دەگرێت. لە لایەکەوە وێنەیەکی بۆ ولآتەکە دەخاتە پێش چاو کە لە رووی جوگرافییەوە ولآتێکی ماف خوراوە. ئەمەش هەمیشە وەکو خاڵێکی هەستیار لە پرسی سنوورەکانیدا دەمێنێتەوە، وەکو ئەو کێشەی کە لە گەڵ ولآتی چیلی لە ئارادا بوو. ئەو دوو ولآتە سەردەمانێکی زۆر لە مێژووی خۆیاندا ململانێیان لەسەر سنووری جوگرافی ناوچەی "ئەندیان" لە نێوانیاندا دەکرد. زۆر جاریش ئەو دیمەنە بە گاڵتەجاڕانە دەهاتە بەرچاو، چونکە دوو ولآت دەکەوتنە ململانێ لەسەر چەند پارچە زەوییەکی دوورە دەست و بێ دانیشتووان.

لە لایەکی تریشەوە، لکاندنی دوورگەکانی فۆکلاند بە بەریتانیاوە لە سەدەی ١٩، دەرفەتی بۆ سەرکردە حکومییەکانی دواتری ئەرجەنتین خولقاند وەکو سەرۆك "پیرۆن" لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی رابردوو کە وێنایەکی نەتەوەیی بۆ ئەرجەنتین بکەن وەکو ولآتێك کە بە پەرۆشە بۆ رزگاربوون لە دەست بەریتانیا و کاراکتەرە ئیمپریالییەکانی تر. هەروەها وەکو ئەندامێك لە بزوتنەوەی ولآتانی بێ لایەن، حکومەتە سیڤیلەکانی ئەرجەنتین بە پەرۆش بوون بۆ خۆپاراستن لە کاریگەرە دەرەکییەکانی

ئەمریکا و یەکێتی سۆڤێت. بەڵام لە ساڵانی شەستەکان و حەفتاکانـدا، رژێمـە دژە کۆمۆنیسـتەکانی ئەو وڵاتە دەستیان دایە هەوڵدان بۆ زیندوو کردنەوەی ئـەو سـتەمە هەرێمایەتییانـەی لـە وڵاتەکـەیان کرابوو، وەکو بابەتی دوورگەکانی فۆکلاند. کاتێکیش لە ساڵی ١٩٨٢دا دەسـتیان دایـە هەڵمـەتێکی سەربازی بۆ وەرگرتنەوەی ئەو دوورگانە، پێشبینییان کرد کە ئەمریکا پشتیوانی لەو هەوڵەیان بکـات. بەڵام دواتر ئەو پێشبینی کردنە پێچەوانە بووەوە، چونکە ئەمریکا پشتیوانییەکی تـەواوی لـە بڕیـاری بەریتانیا بۆ داگیرکردنەوەی دوورگەکان بە هێزی سەربازی کرد.

ئەڵبەتە ئەم خولیا هەرێمایەتییەی ئەرجەنتین تەنیا نموونە نییە، بەڵکو دەکرێ نموونەی هاوشێوە لـە وڵاتی تر باس بکرێت، وەکو هند و پاکستان کە بە هۆی دابەش بوونەوە تووشی ململانێ بوون لەسـەر چەند ناوچەیەکی باکووری ئەو دوو وڵاتە. نەخشەش زۆر هەستیارە لە دیـاری کردنـی بۆچـوونی هـەر یەك لەو وسێ لاتە سەبارەت بـە ناوچـە جـێ ناکۆکـەکانیان. ئـەم نیگەرانییـە لەسـەر خاوەنـدارێتی ناوچەکان کاریگەریی لەسەر پرۆگرامەکانی خوێندن لە قوتابخانـەکان و تێگەیشـتنی هـەر لایـەك بـۆ سنوورەکانی خۆی دروست کردووە. لەم رووەوە میدیای نیشتمانی رۆڵی گرنگ دەبینێت، نەك تەنها لـە وێنا کردنی جۆری کۆمەڵگاکە، بەڵکو لـە پتـەوکردنی تێگەیشـتنەکانیش. لـەم بارەیـەوە تیۆرسـازی سیاسی "ولیام کۆنۆلی" دەڵێت: " ناسنامە پێویستی بە بوونی جیاوازیی هەیـە بـۆ ئـەوەی دروسـت ببێت، و هەر لایـەکیش ئـەو جیاوازییـە لـە لایـەنی بەرامبـەردا دەبینێـت و لەسـەر ئـەو بنەمایـە ناسنامەکەی خۆی مسۆگەر دەکات".

لە وڵاتـی ئەرجـەنتین، بابـەتی خـوێنراو یـان بیسـراو ویـان بینـراو دەربـارەی ململانـێ لەسـەر خاوەندارێتی دوورگەکانی فۆکلاند و هەرێمەکانی وڵاتی بـەریتانیا لـەم بارەیـەوە بـە ئاسـانی دەسـت دەکەوێت. هەروەها چەندین نموونەی بچووکیش بـەدی دەکـرێن کـە ئـەو ململانێیـە بـەبیری خەڵکـدا دێننەوە وەکو پوول و خاولی و باج و نیشانەکانی سـەر رێگـاو بانـەکان، لـە سـەر هـەموو ئەوانـەش نووسراوە: مالڤیناس خـاکی ئەرجەنتینـە. دیـارە لـەم جـۆرە کولتـووری ناوچـەگەرییانەدا، تارمـایی ئیمپریالیزمی بەریتانی و هەژموون و هێزی ئەمریکا دەبنە هۆی دروستبوونی جـۆرێکی تایبـەتی لـە ناسنامەی نەتەوەیی و هەوڵدان بۆ مسۆگەر کردنی ئەو ناسنامەیە.

هەرچەندە ناکرێت وا بزانین خولیای وەدەست هێنانەوەی دوورگەکانی فۆکلاند لـە هـزری سـەرجەم هاووڵاتیانی ئەرجەنتیندا زیندووە،بەڵام هێشتا هەستێکی فراوان لە ناو ئەرجەنتینییەکانـدا هەیـە کـە ئەو ستەمە هەرێمایەتییە کاریگەری کردووە تە سـەر هەڵوێسـەکانی ئەرجـەنتین لـە جیهانـدا. هـەر کەسێکیش هەوڵ بدات دژایەتی ئەو هەڵوێستە بکات، ئەوا بە لای ژمارەیـەکی زۆر لـە هاووڵاتیـانی

ئەرجەنتینەوە نەك تەنها بە گومانلێکراو لە رووی ئایدۆلۆجییەوە دەژمێردرێت، بەڵکو بە شایستەی تەنگ پێ هەڵچنین و ترساندنیشی دەزانن. ئێستاش ئەو نانی نیوەڕۆیەم بە بیر دێت کە لەگەڵ زانای سیاسی "کارلۆس ئیسکودی" و خێزانەکەی لە ئەپارتمانتەکەیان لە بۆینس ئایرس خواردمان. کاتێ ئاراستەی گفتوگۆکەمان گەیشتە پرسی دوورگەکانی فۆکلاند، ئەو دەفتەرێکی پیشانم دا کە سەرجەم ئەو هەڕەشانەی تێدا بوو کە لە رێگای پۆستەوە لێی کرابوون. دیارە کارە ئەکادیمییەکەی زۆر کاریگەر بووە لە رووی شیکردنەوەی رەخنەییەوە بۆ نیشتمانپەروەری لە لای ئەرجەنتینییەکان. ئەو بۆچوونانەشی لە لایەن سیاسەتمەدارە راستڕەوەکانەوە کە گەڕاندنەوەی دوورگەکانی فۆکلاند بە کاری زۆر لە پێشینە دادەنێن، مایەی خۆشحاڵی و رەزامەندی نەبوون. بە پێچەوانەشەوە، ئیسکودی نیشانی داوە کە چۆن ئەو هەست و خولیایە ئەوەندەش نەگۆڕ و سەقامگیر نەبووە کە هەندێك کەس لە چوارچێوەی سیاسەتی نیشتمانیی ئەرجەنتیندا پێشبینییان دەکرد. ناوبراو وەکو راوێژکارێکی نافەرمیی وەزارەتی دەرەوەی ئەرجەنتین، تەنانەت گەیشتە ئەوەی رۆژانێك باج بەسەر سنگی خۆیدا هەڵواسێت کە ئاماژە بەوە بکات کە دوورگەکانی فۆکلاند بەریتانیین.

دیارە جیۆپۆلیتیکی ناسنامەی نەتەوەیی لە وڵاتانی وەکو ئەرجەنتین زیاتر باس دەکرێن، چونکە ستەمی هەرێمایەتی و دڵەڕاوکێ دەربارەی سنوورە نیشتمانییەکان بە مەترسی بۆ سەر ئەو ناسنامەیە هەژمار دەکرێن. بەڵام لە وڵاتانی وەکو ئەمریکا، کە سەرکەوتووانە فراوان بووە بە بێ ئەوەی زیانێکی بەرچاوی لە رووی سنوورەوە پێ گەیشتبێت، دروستبوونی ناسنامەی نەتەوەیی ئاراستەیەکی جیاوازی بەخۆوە بینیوە. لە کاتێکدا ئەرجەنتینییەکان سەبارەت بە پرسی سنوور نیگەران بوون، ئەمریکا سەرقاڵی لایەنی کۆمەڵایەتی و نەژادپەرستی ناو کۆمەڵگاکەی خۆی بوو. ئەوەتا ئەزموونی ئەمریکیە رەسەنەکان و ئەمریکیە ژاپۆنیەکان و ئەمریکیە ئەفریقیەکان دروست پێچەوانەی ئەزموونی ئەمریکیە سپی پێستە پرۆتستانتەکانە کە تا ئێستاش بالا دەستن بەسەر کلتوری سیاسی ئەو وڵاتەدا. جوگرافیای سیاسی ئەمریکاش بە تەواوی لە رێگای ئەو هەولانەی کەمینەکانی ترەوە دروست بووە کە لە پێناو بە فەرمی ناسینیان لە چوارچێوەی سیاسەتی نیشتمانیدا ئەنجامیان داوە. دیارە بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان لە پەنجاکان و شەستەکان و خەباتکردن لە پێناو مسۆگەر کردنی ئازادی بۆ کۆمەڵگا ئەفریقیە ئەمریکییەکان لە دژی ئەو پەروەردە جیۆپۆلیتیکییە بوو کە شەڕی سارد بەسەر جیهاندا سەپاندبووی. ئەوەتا لە کاتێکدا رۆزا پارك و هاوڕێکانی لە مۆنتگومری و ئەلاباما خەباتیان لە پێناو مافی دانیشتن دەکرد لە ناو پاسدا وەکو هەر ئەمریکییەکی سپی پێست، ئیدارەی سەرۆك ئایزنهاوەر سەرقاڵی خەباتێکی زەبەلاح بوو

لە گەڵ رووسیا بۆ کۆنترۆڵکردنی بیر و هۆش و سۆزی خەڵکی جیهان. (کاتی خۆی لە ئەمریکادا رێگا بە رەشپێستەکان نەدەدرا تا لە ریزی پێشەوەی پاس سوار بن. (رۆزا پارك کچێکی رەشپێست بوو کە بۆ یەکەم جار لە دژی ئەو شێوازە مامەڵەیە وەستایەوە، و لەگەڵ ژمارەیەکی تر لە هاووڵاتیانی وەکو خۆی خۆپیشاندانی لە دژی نەژادپەرستییەکە بەرپا کرد. ئەو نارەزاییەش لەناو رەشپێستەکاندا درێژەی کێشا تا ئەو کاتەی بە مافەکانی خۆیان گەیشتن و ئێستا جیاوازی لە نێوان ئەوان و سپی پێستەکاندا لەو وڵاتە نەماوە—وەرگێڕ)

لەو کاتەی ئەمریکا خۆی وەکو پاڵەوانی سەربەستی و ئازادی پێناسە دەکرد، زۆربەی ئەفریقیە ئەمریکیەکان توشی سەرسوڕمان بوون، چونکە کاتێ سەرۆکی ئەمریکا هەوڵی بۆ بەرگری کردن لە ئازادی لە شوێنەکانی تردا دەدا،چەندین گروپی مرۆیی لە ناو وڵاتەکەیدا لە مافەکانیان بێ بەش دەکران و سووکایەتییان پێ دەکرا. هەر بۆیە دەکرێ خوێندنەوەی جیاواز بۆ رەمزە نەتەوەییەکانی وەکو پەیکەری ئازادی، بە پێی ئەزموونی کۆمەڵگا جیاوازەکان لە ناو ئەو وڵاتەدا بکرێت. لە دوای زریانی کاتریناش، کۆمەڵگا ئەفریقیە ئەمریکییەکانی نیشتەجێی ویلایەتەکانی وەکو نیو ئۆرلیان هەمان پەیوەندیی جیۆ-سیاسییان دروست کرد، چونکە ئەوەیان بۆ روون بووەوە کە حکومەتی فیدراڵ زۆر سست بووە لە کاردانەوەی بەرامبەر زیانە گیانی و ماڵییەکانی خەڵکی هەژار و کەم دەرامەت، بە تایبەتییش کە بەشی زۆری زیانەکانی زریانەکە بەر ئەفریقیە ئەمریکییەکان کەوت.

نموونەیەکی تازەتر بریتیە لەو رۆڵە پێچەوانەی کە کۆمەڵگای ئەمریکیە بە رەگەز عەرەبەکان و ئەمریکیە بە رەگەز ئاسیاییەکان دەیانگێرا لە دوای رووداوەکانی ٩/١١. ژمارەیەکی زۆر لە عەرەبە ئەمریکییەکان و خەڵکانی بە رەگەز باشووری ئاسیایی نارەزاییان لەوە دەردەبڕی کە تەنها بە هۆی رواڵەت و رەنگی پێستیانەوە تووشی بێزار کردن و ترساندن و دوورخستنەوە لە گەشتی فرۆکەکان دەبوونەوە، چونکە گەشتیارانی تر رەخنەیان لە هەڵس و کەوت و جۆری زمانەکەیان دەگرت- بۆ نموونە قسە کردن بە عەرەبی یان زمانی ئوردو لە جیاتی ئینگلیزی. لە ئەنجامدا، ئەنجومەنی پەیوەندییەکانی عەرەبە ئەمریکییەکان رایگەیاند کۆمەڵگاکەیان هەست دەکات کە بووەتە قوربانی کردەوەی( ١٩ ) کەسی سعودی و ژمارەیەکی تری فرۆکە رفێنی عەرەبی زمان لە رووداوەکەی رۆژی ١١ی سیپتەمبەری ٢٠٠١. دەرهاویشتەی ئەم دۆخەش بووە هۆی ئەوەی لە ئەنجامی شەڕی ئەمریکا لە دژی تیرۆر، شێوازی تازە بۆ پێناسەی ناسنامە بێتە ئاراوە. شێوازەکەش بایەخی زیاتر بە چەند گروپێك دەدات لە سەر بنەمای جەندەر، نەژاد، یان رەگەز لە سەر حسابی کەمینە ئەتنییەکان کە بە

ترس و رق لیَ بوونەوەوە سەیر دەکرێن، بە تایبەتییش کاتێك کـە لـە شـوێنە گشـتی و داخراوەکـانی وەکو فڕۆکەخانە و کەشتی و وێستەگەکانی شەمەندەفەر دەبینرێن.

بێگومان هەمیشە هەرێم و ناسنامە لە چوارچێوەی حکومەتی نەتەوەییـدا یـەکتریان دەوڵەمەنـد کردووە. ئیتر هەرێمە نەتەوەییەکان وەکو پلاتفۆرمی بە روالّەت جێگیر، رۆڵیان گێڕاوە لە دروسـتکردن و بـەدی هێنـانی ناسـنامەی نەتەوەییـدا. دامـەزراوەکانی وەکـو میـدیای نیشـتمانی و سیسـتمی پەروەردەییش بەردەوام توانای باسکردنی جـۆرە تایبەتـەکانی نـاو کۆمـەڵگا نەتەوەییـەکان فەراهـەم دەکەن، بۆ نموونە: کۆمـەڵگای خـاوەن هـەرێمی ناتـەواو (ئەرجـەنتین)، کۆمـەڵگای خـاوەن هـەرێمی پێشێلکراو (فەلەستین)، کۆمەڵگای خاوەن هەرێمی چاو لێکراو (فەلەسـتین و کوردسـتان)، و نموونـەی کۆمەڵگای جیهانی (ئەمریکا). ئەڵبەتە ئـەم خۆهەڵسـەنگاندنانە لـە رووی ناسـنامەی نەتەوەییـەوە بەدەر نین لە رەخنەو توانج. بۆ نموونە لە بەریتانیای دوای سالیَ ١٩٤٥، چـەندین چـەمك و پێناسـەی جوگرافی بۆ ئەو ولاّتە و رۆڵی لە جیهاندا هاتنە ئاراوە وەکو : هێزێکی جیهانی کە بریتیـە لـە هێـزی ناووکیی و سەرکردەی ولاّتانی کۆمۆنوێلس، پـردی نێـوان ئـەمریکا و ئـەورووپا، هاوبەشـی تایبـەتیی ئەمریکا، و هێزێکی ناوچەیی کە دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای کیشوەری ئـەورووپاوە. هـەتاکو دەکـریَ ئەم پێناسانەش وەکو تەقلیدی جوگرافیایی رکابـەر سـەیر دەکـرێن کـە لـە چـەندین کـات و شـوێنی جیاوازدا لە شەست سالّی رابردوودا گرنگیی خۆیان هەبووە. لەبـەر ئـەوەی بـەریتانیا شـان بـە شـانی ئـەمریکا و رووسـیا لـە کۆتاییـەکانی سـالاّنی چلەکانیشـدا سـەرکەوتووی شـەڕ بـوو، زۆرێـك لـە سیاسەتمەداران و جەماوەری ئەو ولاّتە بڕوایان وابوو کە ولاّتەکەیان مافی خۆیەتی ببێتـە یـەکێك لـەو ولاّتانەی کە بە "سیَ گەورەکە" ناوزەد کرابوون. بـەلاّم لـە شەسـتەکاندا و سـەرەڕای بـوونی چـەکی ناووکی و پەیوەندیی باش لە گـەلّ ئـەمریکادا، "دیـن ئاچیسـۆن" ی وەزیـری دەرەوەی ئـەو کاتـەی ئەمریکا لە لێدوانێکی بەناوبانگدا رایگەیاند کە بەریتانیا رۆڵی خۆی وەکـو ئیمپراتۆرییـەت لەدەسـت داوە وتا ئێستا رۆڵێکی تازەیشی بۆ خۆی پەیدا نەکردووە. تەنانەت بە ئەنـدام بـوونیش لـە کۆمەڵـەی ئابووری ئـەورووپا لـە سـالّی ١٩٧٣دا چارەسـەری قـەیرانی ناسـنامەی نەتـەوەیی بـەریتانیا و رۆڵـە جیهانییەکەی نەکرد.

من وەکو منداڵێك لە حەفتاکان و مێرد منداڵیش لە هەشتاکاندا، لەبیرم دێـت بـەریتانیا تووشـی دۆخێکی زۆر ئالّۆز ببو بە هۆی پەیوەندیی تاکە کەسیی نێـوان مارگرێـت تاتچـەر و رۆناڵـد رێگـان و بایەخ نـەدان بـە کۆمەڵـەی ئـابووری ئـەورووپا، و هـەروەها پشـتگویَ خسـتنی کۆمۆنـوێڵس کـە وا دەردەکەوت تەنها بۆ میوانداری کردنی کۆبوونەوەکانی لووتکـە و گەشـتی پاشـاکان سـوود بەخشـە.

دیاره بە هۆی فیلمەکانی جەیمس بۆند و جۆرەکانی تر لـە کلتـوری میللیـەوە کـە سـەرقاڵی شـکۆدار کردنی سەرکەوتنەکانی بەریتانیا بوون بەسەر ئەڵمانیا لە چلەکاندا، زۆر ئاسان بـوو بـۆ کەسـێکی وەك من وا هەست بکەم رۆڵی بەریتانیا گەورەتر و کاریگەر ترە لە تەنها لایەنی ئابووری و سـەربازی. بـەم شێوەیەش، هەرچەندە شەڕی فۆکلاند لە ساڵی ١٩٨٢ لە رووی دەستپێکردنەوە جێگـای سەرسـوڕمان بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا هەماهەنگ بوو لـە گـەڵ بیرەوەرییـەکانم دەربـارەی وێنـای بـەریتانیا لـە فیلمەکانی جەیمس بۆنددا.

ئێستا هیچ کەسێك نییە شەڕو ململانێکانی فۆکلاند بە بیر بێنێت و وەکو هاوتەریبی "ئـارەزووی نیشتمانی" بەریتانیا سەیری نەکات،بە تایبەتییش کە ئەو کاتە گرتنـەوەی فۆکلانـد وەکـو بابـەتێکی نیشتمانی سەیر دەکرا لە جیاتی ئەوەی تەنها وەکو باسی گروپێکی بچووك لە خەڵك بخرێتە بەرچاو کـە لە باشووری رۆژئاوای زەریای ئەتڵەسی دەژین. بەڵام چەندین هەڵوێسـتی پێچـەوانەش دەربـارەی ئـەو پرسە سەریان هەڵدا،وەکو هەڵوێستی بەشێك لە پارتی کرێکاران و چەند رۆژنامـەیەکی نـاوداری وەکـو گاردیان کە لەگەڵ ئەو بۆچوونە باوەدا نەبوون. لەم رووەوە مارگرێت تاتچەر لـە سـاڵی ١٩٨٢دا وتـی: خاکە گەورەکە گەڕایەوە بۆ باوەشی بەریتانیای گەورە. لە راستیدا گرنگیی فۆکلانـد بـۆ بـەریتانیا لـە قەبارە جوگرافی و ژێرخانی ئابووری و هەروەها بەهای سەرچاوە سروشتییەکانیشی زۆر زیاتر بوو. بـەڵام لە کاتێکدا کە بەریتانییە سپی پێستەکان بە گرتنـەوەی فۆکلانـد هەناسـەی ئۆخـەییان هەڵدەکێشـا، چەند گروپێکی تر لەناو ئەو وڵاتەدا سەرنجی خەڵکیان بۆ لای کردەوە بەردەوامەکانی نەژاد پەرسـتی و بە پاشکۆ کردنی ئابووری و بارودۆخی نەخوازراوی ئێرلەندای باکوور رادەکێشا. بە هەر حاڵ، شکسـتە سەربازییەکە بۆ ئەرجەنتین شکستی هێزی سەربازی ئەو وڵاتەو دواتریش گۆڕینی سیستمی حوکمـداری لە ساڵی دواتردا بۆ دیموکراتییەت بەدوای خۆیدا هێنا.

## جیۆپۆلیتیك و ناسنامەی سەروو- هەرێمایەتی

تا ئێستاش بابەتی ناسنامەی نەتەوەیی گرنگترین بابەتە لە جیهاندا بە هۆی زاڵبـوونی سیسـتمی سیاسیی نێودەوڵەتی کە لەسەر حکومەتە نەتەوەییەکان و سـنوورە هەرێمایەتییـەکان بونیـات نـراوە. جار بەجاریش پرسی ناسنامە بەرەو ئەودیوی سنوورە هەرێمایەتییە تایبەتەکان دزە دەکـات و یـان بـە ئەنقەسـت بـەکار دێـت بـۆ ئـەوەی زاڵ ببێـت بەسـەر وێنـەی ئێسـتای حکومەتـەکان و سـنوورە نیشتمانییەکانیاندا. کیشوەری ئەوروپا نموونەیەکی بەرچاوە لەو بارەیەوە و پەیماننامەی رۆمـای ١٩٥٧ و ئەوانەی پێشتر لەم رووەوە گرنگ و بایەخدارن. کەسایەتیە سیاسیەکانی ئەوروپاش بـە تایبـەتی لـە

فەرەنسا و ئەڵمانیا، وەکو جان مۆنیت و کۆنراد ئەدینیۆر کە جەنگە جیهانییە وێرانکەرەکان بێزاری کردبوون، رۆڵی گەورەیان بینی لە دەستپێکردنی پرۆسەیەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری بە مەبەستی دروستکردنی هەماهەنگی لە نێوان وڵاتانی ئەوروپا و دواتریش یەکگرتنی ئەو وڵاتانە بە شێوەیەك لە شێوەکان. سەبارەت بە ئەڵمانیا کە تازە لە دەرەنجامی دوو ململانێی جیهانی و دابەشبوونی هەرێمایەتی هۆشی کردبووەوە، پەیماننامەی رۆما نەك تەنها بۆ پێشخستن و یەکگرتنی ئەوروپا نەبوو، بەڵکو دەرفەتێك بوو بۆ ئەوەی ئەڵمانیا دووبارە خۆی وەکو بەشێکی سەرەکی لە دیموکراتییەتی ئەوروپا و هاوپەیمانێکی جیۆستراتیجی بۆ ئەمریکا ببینێتەوە.

هەرچەندە ئەزموونەکانی جەنگی دووەمی جیهانیی بنەمایەکی لۆجیکییان بۆ پرۆژەی یەکگرتنی ئەوروپا دەستەبەر دەکرد، بەڵام پێناسەی جوگرافی ئەندامێتی لە یەکگرتنەکەدا ئاڵۆز و تەم و مژاوی بوو، چونکە چەند پرسیارێك دەهاتنە ئاراوە وەکو: کێ دەتوانێ ببێتە ئەندام لەم یانە ئابوورییەدا؟ ئایا پێویستە زۆرینەی دانیشتووانی وڵاتانی ئەندام بە نەتەوەو رۆحی میللەت و بۆچوونەکانیشیەوە مەسیحی بن؟ لە ساڵی **١٩٦٣**دا، وڵاتی تورکیا کە هەمیشە بە پردی نێوان ئەوروپا و ئاسیا ناوزەد دەکرێت، بۆ یەکەم جار داوای کرد ببێتە ئەندام لە بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا و لەو کاتەوە تا ئێستاش پەیوەندی پڕ لە گرفتی لەگەڵ ئەندامەکانی ئەو رێکخراوەدا لەسەر ئەو پرسە هەیە.



١٥. ئەستێرەکانی سەر ئاڵای یەکێتی ئەوروپا

له دوای چل ساڵیش، هێشتا پرسی بوون به ئەندامی تورکیا له یەکێتی ئەوروپادا لەناو مشت و مڕی ئەندامانی ئەو ڕێکخراوەدا چەقیوه، چونکه چەند ئەندامێکی تازەی وەکو نەمسا لەوه دەترسن تورکیای خاوەن ژمارەیەکی گەورەی دانیشتوان، گرفتی ئابووری و سیاسی و کولتووری بۆ وڵاتانی ئەندام دروست بکات. چەند ئەندامێکی تریش سەرنج بۆ ئەو ڕاستییه ڕادەکێشن که تۆماری تورکیا له ڕووی مافەکانی مرۆڤ و پاراستنی کەمینە ئەتنی و کولتوورییەکانەوه نادروست و لەکەداره. چاودێران لەناو تورکیا و له دەرەوەش بڕوایان وایه که ئەگەر تورکیا وەکو ئەندام وەربگیرێت، ئەوا نیگەرانییەکی کولتووری قووڵ سەبارەت به زیادبوونی ڕێژەی موسڵمانان له ئەوروپا دروست دەبێت به تایبەتییش که ژمارەیەکی زۆر موسڵمان له فەرەنسا و ئەڵمانیا و بەریتانیا دەژین.

**تورکیا: پردی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا**

ئەو بۆچوونەی دەڵێت که تورکیا ئەوروپا و ئاسیا به یەك دەبەستێتەوه، هەم له بۆچوونی جیۆپۆلیتیکی گشتیی وڵاتان و هەم به لای هاووڵاتیانی ئەوروپاوه زۆر ئاشنایه. بەڵام هاوکات تەم و مژاوییشه،چونکه ئەو بەیەکەوه گرێدانه یارمەتی چارەسەر کردنی گرفته نێوخۆییەکانی خودی ئەو وڵاته نادات، لەبەر ئەوەی له کاتی دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرنی تورکیاوه، سیستمی کەمالییەت به سیستمێکی علمانی و به ڕەچەڵەك ڕۆژئاوایی و دواتریش دژه کۆمۆنیستی پێناسه کراوه. بەڵام کۆتایی هاتنی شەڕی سارد بەشێك لەو ناسنامه نەتەوەییەی لەکار خست و بووه هۆی تووڕه بوونێکی زۆری تورکەکانیش، به هۆی ئەوەی ژمارەیەك له وڵاتانی بلۆکی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپای پێشوو به پێچەوانەی تورکیای هاوپەیمانی ناتۆ به خێرایی له یەکێتی ئەوروپا وەرگیران. به هەر حاڵ، هۆکارەکان له شوێنی ترەوه سەرچاوەیان گرتووه، چونکه پرنسیپەکانی کەمالییەت بەرپرسن له سیستمی حوکمڕانی ئەو وڵاته که تێیدا سوپا دەست له کاروباری سیاسی و ژیانی دەستووریی وڵات وەردەدات و بووەته هۆی سەرکوتکردنی بەردەوامی کەمینه نەتەوەییەکانی وەکو کورد له وڵاتدا. له مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٢دا، پارتی داد و گەشەپێدانی ئیسلامی سەرکەوتنی له هەڵبژاردنەکاندا وەدەست هێنا،و بەمەش کەمالیسته تەقلیدییەکان ترسی ئەوەیان لێ نیشت که پابەند بوونی وڵات به سیستمی علمانی و ڕۆژئاوایی بەرەو لاوازبوون بچێت. بەڵام پارتی ناوبراو له جێگای ئەوەی گۆڕانکارییەکه بۆ لاواز کردنی پرنسیپه تەقلیدییەکانی تورکیا بەکار بێنێت، دەستی دایه هەوڵدان بۆ بەدی هێنانی دیموکراتییەتێکی ئیسلامی بەو هیوایەی - به پێچەوانەی نموونەکەی عێراق- ببێته سەرمەشق بۆ وڵاتانی تری ئیسلامی که هەمان ڕێڕەو بگرنه بەر له ڕووی پابەند بوون به مافی تاکەکان و پرنسیپی دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤەوه.

له ڕووی مێژووییەوه نەخشەی جوگرافی ئەوروپا گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووه، و دروستیش نییه وا بزانین تێگەیشتنێکی ڕوون و بێ پێچ و پەنا بۆ ئەو گۆڕانکارییانه بەدی دەکرێت. له لایەکی

ترەوە، مشت و مڕەکانی ئەم دواییـە دەربـارەی ئاینـدەی یـەکێتی ئـەورووپا هەمیشـە پـڕ بـوون لـە نیگەرانیی لە رووی بابەتەکانی وەکو ناوچە و ناسنامەو سەروەریی ولاّتەکانی یەکێتییەکـە. بـۆ نموونـە لە گەرمەی شەڕی بۆسنە لە سەرەتای نەوەتەکاندا، رەخنە لـە ولاّتـانی یـەکێتی ئـەورووپا دەگـیرا کـە نەیانتوانی دەست تێوەردان لەو ناوچەیەدا بکەن کە ئەگەری بوونی بـە ئەنـدامی یەکێتییەکـە نزیکـە. هەر لەم چوارچێوەیەدا، رۆشنبیرانی بۆسنی و ولاّتانی تـری ئـەورووپا جـامی تـووڕەیی خۆیـان بەسـەر هاوتا ئەورووپییەکانی تردا رشت، بـە هـۆی ئامـادە نـەبوونیان بـۆ هاوکـاریی کردنـی ولاّتێکـی فـرە کولتووری و فرە ئـەتنی کـە تـەنها دوو کاتـژمێر بـە فڕۆکـە لـە لەندەنـەوە دوورە و کـەمتر لـە دوو کاتژمێریش لە پاریس و بۆن و رۆماوە. دیارە بە لای زۆربـەی چـاودێرانەوە، وێـران کردنـی شـارەکانی بۆسنە وەکو مۆستار و سەراییڤۆ لە ساڵی ۱۹۹۲ و رەشەکوژیی ۷۰۰۰ پیاو ومنداڵ لـە سربرینیسـکا لە ساڵی ۱۹۹٥ بە شکستی ئەم پرۆژە ئەورووپییە لـە داڕشـتنی بـەهاکانی یـەکگرتن و میهرەبـانی و ئاشتی و دیموکراتی هەژمار دەکرا.

لە میانەی گفتوگۆکانی تایبەت بە دەستووری ئەورووپاش، پارتە سیاسییەکان و دەزگاکانی میـدیا مشت و مڕێکی زۆریان کرد دەربارەی سرووشت و ئامانجەکانی یەکێتی ئەورووپا کە ئێسـتا ۲۷ ئەنـدام بەخۆوە دەگرێت. لەم رووەوە ژمارەیەك لە کەسایەتییە سیاسییە راستڕەوەکان ئارەزووی ئەوەیان دەکـرد کە دەستووری ئەورووپی گوزارشت لە ناخی ئەورووپای مەسیحی بکات. هەر بۆیـە گرنگییـەکی زۆریـان بە ناسنامە جوگرافییەکەی وەکو شارستانییەتێکی جیاواز دەدا. بـەلاّم دواتـر دەنگـدەرە فەرەنسـی و هۆڵەندییەکان دەستوورەکەیان رەت کردەوە و بەمەش بە شێوەیەکی کاریگەر رێگایـان لـە دەرچـوونی ئەو دەقە تایبەتییە گرت. بە هەر حاڵ، بە لای چاودێرە غـەیرە مەسـیحییەکانەوە و بـە هـۆی بـوونی بەرچاوی کۆمەڵگا موسڵمان و یەهوودییەکان لە سەرانسەری کیشوەرەکەدا و هەروەها لـەو ولاّتانـەش کە پاڵێوراو بوون بۆ ئەندامێتی وەکـو ولاّتـی تورکیـا، بابـەتی ناسـاندنی ئـەورووپا وەکـو فەزایـەکی مەسیحی مایەی نیگەرانی و نارەزایی بوو. بەلاّم نابێت ئەم پرسە کولتووری- ئاینییە بەگونجاو لەگـەڵ ئامانجەکانی رۆشنفکریی علمانیدا دابنرێت، چونکە مافەکانی مرۆڤ و ئـازادی تاکـە کەسـی جێگـای سەرنجی هەموو ئەورووپییەکانە بە تورکەکانیشەوە کە کۆمەڵگایەکی موسڵمانن.



١٦. شاری ئەستەمبوڵ . پردی نێوان ئەوروپا و ئاسیا

دیارە گەورەترین تەحەدا کە رووبەڕووی زۆرێك لــە حکومەتــە ئەوروپییــەکانی وەکــو بــەریتانیا و فەرەنسا و هەڵەندا دەبێتەوە، بریتییە لە گۆشەگیر کردنی دانیشتووانە موسڵمانەکانیان کە لە ئاکامــدا کاردانەوەی جۆراوجۆر بەدوای خۆیدا دێنێت. بۆ نموونە، محەمەد عەتا کە یــەکێك بــوو لــە رفێنــەرانی فڕۆکەکان لە هێرشەکانی ١١ی سیپتەمبەردا، لە کــاتی خوێنــدنی لــە زانکــۆی هــامبۆرگی ئــەڵمانیا تووشی نائومێــدی ببــوو لــە کۆمــەڵگای ئــەڵمانیا (دەکــرێ کردەوەکــەی وەکــو دەرەنجــامێکی ئــەو نائومیدییە بێتە هەژمار کردن- وەرگێڕ). لە فەرەنساش، رەخنە لە ئاژاوەگێڕییەکانی هــاوینی ٢٠٠٥ ی دەوروبەری پاریس دەگیرا کە وەکو نارەزایی لە دژی جیاوازی و نەژاد پەرستیی بەرامبەر موســڵمانان ئەنجام درابوو. بێگومان ئەم جۆرە گۆشەگیر کردنە نێوخۆییانە هاوکات لە گەڵ تەنگــژە بەردەوامــەکان لە ئەفغانستان و فەلەستین و عێراق و چیچان، بوونە هۆی ئەوەی هەستێکی گشتیی بە زوڵم لێکــراوی لە ناو جیهانی ئیسلامیدا دروست ببێت. دیــارە ئــەم فاکتــەرە ئــاینی و جیۆپۆلیتیکییــە نێوخــۆیی و

هەرێمایەتی و جیهانییانەش ڕۆڵی گرنگیان گێڕا لە هاندان و وادار کردنی ئەو چوار پیاوە کە سیستمی هاتوچۆی لەندەنیان کردە ئامانجی تەقینەوەکانیان لە ڕۆژی ٧ی تەمووزی ساڵی ٢٠٠٥دا.

ئەم جۆرە مشت و مڕانە دەربارەی پێکهاتەی جوگرافی ئەوروپا وەکو مۆتەکە بەرۆکی حاڵەتی ناسنامە نەتەوەییەکانی تر و شێوازەکانی سەروو- هەرێمایەتی دەگرێت. سەرقاڵبوونی درێژمەودای تورکیاش لە گەڵ یەکێتی ئەوروپا و ئەو شەڕانەی کە یوگوسلافیای پێشووی لە سەرەتای نەوەتەکاندا گرتەوە، تەنها دوو نموونەی ئەو تەنگژانەیە. لە لایەکی ترەوە بەشەکانی تری ژیانی کولتووری و سیاسیی سەروو-ئەوروپی وەکو هات و چۆی خەڵك بەرەو ناو یەکێتی ئەوروپا و بە پێچەوانەوە، هەمیشە دوودڵی دەربارەی ناسنامەی ئەوروپیی ڕاستەقینە دروست کردووە. کاتێکیش بەم دواییە پۆڵەندا و سلۆڤاکیا بوون بە ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا، هەندێك لە ڕۆژنامە بەریتانییەکان هوشیارییان دا لەوەی بەریتانیا نوقمی کۆچبەران دەبێت، بە هۆی کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ڕۆژهەلاتی ئەوروپا بەرەو بەریتانیا بەدوای دەرفەتی کاردا. هەر وەکو ئەوەی لە ئەنجامی کۆچکردن لە کۆمۆنویێلسی تازەوە لە پەنجاکان و شەستەکان ڕوویدا، لێرەشدا ژمارەیەك لە چاودێران مەترسی ئەوەیان نیشاندا کە بەریتانیا پڕ ببێت لە خەڵکێك، کە بە وتەی ئەو چاودێرانە، "وەکو ئێمە نین". بەلاّم بۆ ئەوانەی بایەخ بە مێژوو و جوگرافیا دەدەن، ئەم بابەتە بۆ وڵاتانی وەکو بەریتانیا تازە نییە، چونکە ئەو وڵاتانە هەمیشە کەوتوونەتە بەر لێشاوی کۆچ و کۆچبەران.

وادیارە ئەندامێتی لە یەکێتی ئەوروپا ڕوو لە زیاد بوونە بە تایبەتییش کە لە کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٧دا هەردوو وڵاتی بولگاریا و ڕۆمانیا چوونە ڕیزی یەکێتییەکەوە. هەرچەندە ڕەخنەی زۆریش لە دام و دەزگاکانی ئەو یەکێتییە دەگیرێت، گوایا نەیتوانیوە هەستێکی کاریگەر سەبارەت بە ئامانجەکان و ناسنامەی سەروو- ئەورویی دروست بکات، بەلاّم گرنگە ڕەچاوی ئەو ڕاستییە بکرێت کە چۆن یەکێتییەکە ڕێگای بۆ شێوازێکی تازە لە ناسنامەی نەتەوەیی خۆش کردووە. بۆ نموونە، لە مانگی مایسی ساڵی ٢٠٠٥دا، کۆماری مۆنتینیگرۆ ڕیفراندۆمێکی بە مەبەستی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەنجام دا کە تێیدا ٥٥٪ی دەنگدەران بە بەڵێ بۆ سەربەخۆیی وڵاتەکەیان دەنگیان دا. لێرەدا ڕۆڵی یەکێتی ئەوروپا بە تایبەتی گرنگ بوو، چونکە ئەو پێوەرانەی داڕشت کە پێویست بوون مۆنتینیگرۆ پیادەیان بکات بۆ ئەوەی سەربەخۆییەکەی بە فەرمی بناسرێت. بە ڕاستی ئامانجی سەرەکی لە پرسی سەربەخۆیی بوونی مۆنتینیگرۆ، بریتی بوو لە بوونی ئەو وڵاتە بە ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا نەك تەنها سەربەخۆیی نەتەوەیی. زۆرێك لە خەڵکی ئەو وڵاتەش لەوە نیگەران بوون کە ئارەزووی بوونیان بە بەشێك لە یەکێتی ئەوروپا گرفتی بۆ دروست ببوو، بە هۆی ئەوەی حکومەتی

سربیا ئامادە نەبوو تاوانبارانی جەنگی کۆسۆڤۆ و شـوێنەکانی تـری یوگوسـلافیای پێشـوو رادەسـتی دادگا بکات. بەشداری کردنی یەکێتی ئەوروپاش لەو کێشەیەدا کارێکی بیّ هاوتا بـوو، بـە روونیـیش دەری خست کە چۆن رێکخراوێکی سەروو-ئەوروپی دەتـوانیّ رۆڵـی کاریگـەر ببینێـت لـە دارِشـتنی شێوازی ناسنامەی ئەوروپیدا.

بە گشتی، ئەندامێتی لە یەکێتی ئەوروپا وەکو بەشێکی گـرنگ لـە پرۆسـەی گۆڕانکـاری سـەیر دەکرێت، کە دەرفەت بە ولاٚتانی وەکو ئیستۆنیا و لیتوانیا و لاتڤیا دەدات تا جارێکی تر خۆیان وەکـو "ئەوروپی" ببینن و هاوکات کەمتر پابەنـد بـبن بـە کێشـە و بەرژەوەندییـەکانی یـەکێتی سـۆڤێتی پێشـووەوە. بەمـەش ولاٚتـانی ئـەوروپای رۆژئـاوا کـەمتر یەکێتییەکـە بـە پێناسـەی جوگرافییـەوە دەبەستنەوە.

وا دیارە مێژووی ناسنامە و پراکتیزە کردنـە سیاسـییەکانی پەیوەندیـدار بـە یـەکێتی ئـەوروپاوە بوونەتە تەحەدا بۆ پراکتیزە و ناسنامەکانی تایبەت بە ولاٚتەکان،و لە هەمان کاتـدا دەبنـە تـەواوکاری ئەو ناسنامە و پراکتیزانەش. ئەوەتا بە لای هەندێکەوە یەکێتی ئـەوروپا بـە "ئـەوروپای نەتـەوەکان" پێناسە دەکرێت، لە کاتێکـدا کـە گروپێکـی تـر بـە ئاراسـتەی "ولاٚتـە یـەکگرتووەکانی ئـەوروپا" بانگەشەی بۆ دەکەن. یەکێك لە شێوازەکانی مامەڵە کردنیش لە گەڵ ئەم بۆچوونە جیۆپۆلیتیکییـە دژ بە یەکانە ئەوەیە کە لەسـەر بنـەمای جـوگرافی چارەسـەر بکـرێن. لـەم رووەشـەوە ناوچـەی یـۆرۆ و رێککەوتننامەی سکینجن دوو نموونەی بەرچاون کە هەندیّ لـە ولاٚتـانی ئـەوروپا ئەنـدامن تێیانـدا و بەشـێکی تریشـیان ئەنـدامێتییان لـەو دوو نموونەیـەدا نییـە. (رێککـەوتنی سـکینجن: ئـەو رێککەوتننامەیە کە ٢٦ ولاٚتی ئەوروپی لە شاری سکینجنی ولاٚتی لۆکسـومبورگ واژۆیـان کـرد بـە مەبەستی هەڵگرتنی پاسپۆرت و هەموو رێگرییەکانی تری هاتوچۆ لـە نێوانیانـدا- وەرگێـڕ) . بـەلاٚم ئەو مشت ومڕانەش کە دەربارەی بەربلاٚو بوونی جوگرافیی ئەوروپا دێنە ئاراوە، گرنگی خۆیـان هەیـە چونکە رێکخراوەکە هەمیشە ئارەزووی خـۆی بـۆ پەرەپێـدانی چـالاکییەکانی بـۆ دەرەوەی سـنووری ئەندامەکانی ئێستای نیشان داوە. بۆ نموونە لە ساڵی ٢٠٠٦دا رێکخراوەکـە رەزامەنـدی نیشـاندا بـۆ بلاٚوە پێکردنی زیاتر لە ٧٠٠٠ سەربازی ئـەوروپی بـە رابەرایـەتی ئیتاڵیـا و فەرەنسـا لـە باشـووری لوبنان. ئەو هێزەش کە بە یونیفیل ناسراوە، هەوڵێکی بـیّ وێنـە بـوو لـە دوو رووەوە: هـەم لـە رووی مەودای کارەکانیەوە و هەم ئەوەی بووە یەکەم نموونەی هێزی ئاشتی پارێزی هاوبەشـی نێـوان یـەکێتی ئەوروپا و نەتەوە یەکگرتووەکان. بەلاٚم ئێستا یەکێتی ئەوروپا لە چەندین ئـەرکی مرۆیـی لـە شـوێنە جیاجیاکانی جیهاندا بەشدارە وەکو کۆنگۆ و تەیموری رۆژهـەلاٚت و مۆڵـدۆڤیا. هـەروەها چـاودێرانی

لوبنانی و ئیسرائیلی داوای دەست تێـوەردانی زیـاتری یـەکێتی ئـەوروپایان کـردووە لـە ناوچـەیەکی نێوانیان کە بە لای ئیسرائیلییەکانەوە گۆڕەپانی چالاکی ئەو ڕێکخراوەیە. یەکێتی ئـەوروپاش لـە لای خۆیەوە دانی بەوەدا ناوە کە حزبولاّی لوبنان ڕێکخراوێکی گرنگـی غـەیرە حکومییـە و پێویسـتە لـە دانوستانەکانی تایبەت بەو پرسە بەشدار بکرێت.

## جیۆپۆلیتیك و ناسنامەی نیمچە نەتەوەیی

ئەگەر سنوری هەرێمایەتی بۆ ناسنامە و ئامانجـەکان ئـالۆزی بخاتـە نێـو پەیوەندییـەکانی نێـوان بونیاتی سیاسی و ناسنامەی نەتەوەییـەوە، ئـەوا ئـەو گروپـە نیمچـە نەتەوەییانـەش کـە هـەوڵ بـۆ سەربەخۆیی یان ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوانتر لە دەسەلآتی حکومەتی ناوەند دەدەن، لە لای خۆیانەوە بـە هەمان شێوە گومان دەخەنە سەر ناسنامەی بونیاتنراو لەسەر سنووری هەرێمایەتییەکان. بەلاّم ولاّتـانی وەکو ژاپۆن و ئایسلەندا کە لە رووی ئەتنییەوە یەك رەنگـن، ئـەزموونی کـەمتریان دەربـارەی گروپـە نیمچە نەتەوەییەکان هەیە کە تەحەدای شەرعییەتی هەرێمایەتی و داواکاری بۆ ناسـنامەی نەتـەوەیی دەکەن. لە ناو ئەوروپاشدا، کۆمەڵگاکانی وەکو کەتەلان لە ئیسپانیا و والـوونز لـە بـەلجیکا بەڵگـەی ئەوەن کە ئەو گرووپانەی نەییاری بیرۆکەی ناسنامەی نەتـەوەیین، هەمیشـە هـەوڵ دەدەن ناسـنامەکە سنووردار بکەن و تەنانەت جار بەجاریش لـە ڕێگـای بـەکار هێنـانی تونـد وتیژییـەوە بەربـەرەکانێی دەکەن. دیـارە بونیاتنـانی نەتـەوە پرۆسـەیەکی دینامیکییـە و ولاّتـانی وەکـو ئیسـپانیا هـەوڵ بـۆ گرتنەبـەری ڕێگایـەکی مامناوەنـدی دەدەن لـە نێـوان سـەرکوت کـردن و یـان خۆگونجانـدن لەگـەڵ داواکارییەکان بۆ دروستبوونی یەکەی هەرێمایەتی تایبەت (وەکو هـەرێمی کەتـەلۆنیا کـە ماوەیـەکی زۆرە هەوڵی بۆ دەدرێت) لە لایەك، و داوای دان پێدانانی ناسنامەی تایبەت بە خەڵکی ئەو هەرێمە لـە لایەکی ترەوە. بە درێژایی ٤٠ ساڵی رابردووش، حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی ئیسپانیا ئۆتۆنـۆمی زیاتریان بۆ گرووپەکانی کەتەلان و باسك لەو ولاّتەدا دابـین کـردووە. بـەلاّم لـە بەرامبـەردا بەرپرسـە سەربازییەکانی ئیسپانیا هەمیشە هوشیاری دەدەن کە ڕێگا بە جیابوونەوەی یەکجاریی ئەو هەرێمانـە لە ئیسپانیا نادەن.

بێگومان ئەم سووربوونەی ولاّتی ئیسپانیا لەسەر دەست گرتن بەو ناوچـە و هەرێمانـەوە،پاڵی بـە گرووپەکانی وەکو ئیتا (ئازادی و نیشتمانی باسك) وە ناوە تا چەندین هێرشی تیرۆریستی ئـەنجام بـدەن لە تەقاندنەوەی بۆمب و هێرش کردنە سـەر خـەڵك و مـاڵ و موڵکیـان لـە هـەرێمی باسـك و شـارە سەرەکییەکانی وەکو مەدریدی پایتەخت. ئەو گرووپـە کـە لـە تـەمووزی سـاڵی ١٩٥٩ دامـەزراوە،

هەمیشە هەوڵی بۆ جولاندنی هەستی نەتەوەیی لە هەرێمی باسك داوە،هاوكات لە گەڵ ناردنی پەیامێكی دژە كۆلۆنیالی كە داوای كۆتایی هێنان بە داگیركاریی ئیسپانیا بۆ هەرێمەكە دەكات. لە بەرامبەریشدا، سەركردەی بەناوبانگی ئیسپانی "جەنەراڵ فرانكۆ" یەكێك بوو لە نەیارە سەرسەختەكانی ئەو هەولانە و تەنانەت لە هەوڵەكانیدا بۆ لەناو بردنی رێكخراوی "ئیتا" سوپای میللی بەكار دەهێنا. بەلام هەوڵەكانی سەركەوتوو نەبوون و لە دوای مردنی فرانكۆش لە ساڵی ١٩٧٥ و سەرەرای چەندین هەوڵی سەرنەكەوتوو بۆ راگەیاندنی ئاگربەست لە نەوەتەكانی سەدەی رابردوودا، رێكخراوەكە درێژەی بە چالاكییەكانی داوە( و تا ئێستاش بەردەوامە- وەرگێر). لەوانەش گرنگتر، تەقینەوەكەی شاری مەدرید لە ١١ی ئاداری ساڵی ٢٠٠٤ كە بووە هۆی گیان لەدەستدانی زیاتر لە ٢٠٠ كەس، خرایە ئەستۆی ئەو رێكخراوە. دواتریش حكومەتی پارتی گەلی ئیسپانی بە سەرۆكایەتی سەرۆك وەزیران "خۆسێ ئەزنار" كە رەزامەندیی نیشان دابوو بۆ ناردنی سەرباز بۆ بەشداری كردن لە شەری عێراق،تووشی شكستێكی گەورە هات لەو هەڵبژاردنە گشتییەی كە دوای سێ رۆژ لە تەقینەوەكە لەو ولاتە ئەنجام درا. بەلام لە راستیدا گروپە چەكدارە ئیسلامییەكان تەقینەوەكەی مەدریدیان ئەنجام دابوو نەك رێكخراوی ئیتا. ئەوەی لەم بارەیەوە جێگای سەرنجە، حكومەتی ئەو كاتەی ئیسپانیا كە ناوبانگی بە رادەدیەكی زۆر لە دابەزیندا بوو، هەوڵی دەدا رێكخراوێك بە هێرشەكەی مەدرید تۆمەتبار بكات كە تەنها لە ناو ئیسپانیا چالاكی ئەنجام دەدا، لە كاتێكدا زۆربەی چاودێران ئەو هێرشەیان بە كاردانەوەیەكی راستەوخۆی پشتیوانی كردنی ئیسپانیا لە شەری دژە تیرۆر هەژمار دەكرد، ئەمەش مانای وایە كە ئەنجامدەرانی تەقینەوەكە خەڵكی دەرەوەی ئەو ولاتە بوون.

هەرچەندە تەحەدا كردنی هەوڵە نیمچە هەرێمایەتییەكان بۆ حكومەتی ئیسپانیا درێژەی هەیە، بەلام لە دوای هێرشەكەی سەر شاری مەدرید لە ئاداری ٢٠٠٤، ئەنجامدانی كردەوەی تیرۆریستی لەو ولاتەدا رووی لە كەم بوونەوە كردووە. دیارە گرووپەكانی وەكو "ئیتا" رۆڵی گرنگ دەگێرن لە پروپاگەندە كردن بۆ جۆرێكی جیاواز لە ناسنامە بە جۆرێك كە پێچەوانەی ناسنامەی نەتەوەیی ئیسپانیا بێت. بە گشتییش، جوداخوازان هەوڵ دەدەن سیمبولەكانی دەوڵەتی ئیسپانیا و "داگیركارییە كۆلۆنیالییەكەی" بكەنە ئامانج و یان كار بۆ پەرەدان بە نیشانەكانی جیاوازی لە گەڵ حكومەت دەكەن وەكو جیاوازیی زمان و نەخشەو ئالای هەرێمەكان و( لە حالەتی" ئیتا" دا ) ناوچەیەكی جوگرافی كە بە نیشتمانی باسك پێناسەی دەكەن. بەلام پێویستە تێبینی ئەوە بكرێت كە

لــە رابــردوودا ســەرجەم جوداخــوازانی باســك یــەك دەنــگ نــەبوون لــە رووی پشــتیوانی كــردن لــە چالاكییەكانی ڕێكخراوی ئیتا.

**ململانێ نەتەوەییەكان: ئیسپانیا و یاری تۆپی پێ**

وادیارە یاری تۆپی پێ وێنەیەكی باشی بارودۆخی ناهەمواری نەتەوەیی لــە ئیســپانیا نیشــان دەدات. ئــەوەتا پاڵەوانێتی تۆپی پێی ئەو وڵاتە كە بە "لا لیگــا" ناســراوە، دەرفــەتی زێــڕین دەخولقێنێــت بــۆ هــەوادارانی ئــەو یارییە،و هەروەها سەركردە سیاسییەكانیش كە ناڕەزایی و ئارەزووی سیاسی خۆیان لە ڕێگای پشتیوانی كــردن لــە تیپە ركابەرەكانەوە دەربڕن. تیمەكانی باسك و كەتەلان وەكو ئەتلەتیك بلباو و بەرشەلۆنە هۆكــاری ســەرەكیین بــۆ نمایش كردنی گرنگترین جۆرەكانی ناسنامە وكەسایەتی نەتەوەیی ئەو هەرێمانە. هــەر بۆیــە یــاری ئــەو دوو تیپــە بەرامبەر یانەی ریاڵ مەدرید كە لە لایەن فرانكۆی دیكتاتۆرەوە بە تونــدی پشــتیوانی دەكــرا، زۆر تونــد و ســەرنج ڕاكێشەو دەربڕێكی ڕاستەقینەی جیۆپۆلیتیكی گشــتییە. فرانكــۆ هــەوڵی دەدا ســەركەوتنە وەرزشــییەكانی ریــاڵ مەدرید لە جامی ئەوروپا بۆ سەركوتكردنی جیاوازییــە زمانــەوانی و هەرێمایەتییــەكان لــەناو ئیســپانیادا بــەكار بێنێت. تەنانەت لە سەردەمی حوكمی فرانكۆدا لە (١٩٣٩) هەتاكو (١٩٧٥) زمانی كەتەلۆنی یاساغ كرا.

بە گشتی، ئەو تەحەدا روون و ئاشكرایەی گروپە نیمچــە نەتەوەییــەكان دروســتی دەكــەن، تــەنها تایبەت نییە بە ئەوروپاوە. بۆ نموونــە لــە وڵاتــی چــین، دەســەڵاتی ناوەنــدی لــە بــەیجینگ هەمیشــە بزووتنەوە جوداخوازەكانی رۆژئاوای وڵاتی وەكو هەڕەشــەی ئاسایشــیی جیــددی پێناســە كــردووە بــە تایبەتییش لە دوای ١١ی سیپتەمبەر. پارتی كۆمۆنیستی چینیش هەر لە كاتی هاتنی بۆ دەســەڵات لە ساڵی ( ١٩٤٩ ) وە، هەمیشــە نیگــەرانی ئــەوە بــووە كــە چــۆن یــەكێتی خــاكی وڵات لــە دژی جیابوونەوەی دیفاكتۆی تایوان و داگیركردنی هەرێمی تبت بپارێزێــت. لــە تــازەترین گۆڕانكارییشــدا، جوداییخوازە موسڵمانەكان لە رۆژئاوای چین بوونەتە سەرچاوەی هەڕەشە بۆ سەر یەكێتی ئــەو وڵاتــە و ناسنامە نەتەوەییەكەی. لە پێنج ساڵی دواییشدا،حكومەتی ناوەنــدیی چــین ســتراتیجییەتێكی چــوار لایەنەی پەیڕەو كردووە بۆ بەهێز كردنی ناسنامەی نەتەوەیی لەو هەرێمە كە بریتیە لە:

١. ئەنجامدانی پرۆژەی وەبەرهێنانی ئابووری لەو شوێنانەی جوداخــوازان چــالاكی تێــدا دەكــەن بەهیوای نەهێشتنی هەست بە غەدر لێكراوی و نادادپەروەری.
٢. گواستنەوەی دانیشتووان لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوای وڵات.
٣. بەهێزكردنی ئاسایشی نێوخۆیی.
٤. درێژەدان بە هەماهەنگی كردن لە گەڵ رووسیا و وڵاتانی ئاسیا.

وەکو تێبینییش دەکرا، چین سوودی لە شەڕی ئەمریکا دژ بە تیرۆر وەرگرت، بە مەبەستی هەرچی زیاتر سەرکوت کردنی ئەو گرووپانەی کە بە هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی ئەو وڵاتە هەژمار دەکران.

بە لای حکومەتە نەتەوەییەکان و جوداخوازە هەرێمایەتییەکانیشەوە، هەوڵدان بۆ دیاری کردنی خاوەندارێتی هەرێمەکان بە خاڵێکی بنەڕەتی دادەنرێت لە بەدی هێنان و پاراستنی ناسنامەدا. ئەوەتا لە لایەکەوە ئەو هەولانە لە شوێنە جیاجیاکانی وەکو ئیسپانیا و چین و سریلانکا و ئەندەنوسیا نەك تەنها یارمەتی حکومەتە نەتەوەییەکان دەدەن بۆ شەرعییەت دان بە ئۆپەراسیۆنە سەربازیی و ئاسایشییەکان، بەڵکو هەمیشە وەبەرهێنانی دارایی و سۆزداری لە بواری ناسنامەی نەتەوەییدا دەکەن لە رێگای هۆیەکانی رۆشنبیریی میللی وەکو تەلەفزیۆن و قوتابخانە و رۆژنامە. وەکو ئەوەی "باری بۆزان" و پسپۆرانی تری بواری جیۆپۆلیتیك و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان ئاماژەی پێ دەکەن، دەستنیشانکردنی هەر بابەتێك وەکو هەڕەشە بۆ سەر ئاسایش، دەبێتە دەرفەتی گونجاو بۆ پاساودان بە کاردانەوەی توند دژ بە سەرچاوەی هەڕەشەکە، چونکە لەو حاڵەتەدا وا نیشان دەدرێت کە ئاسایشی وڵات لە مەترسیدایە.

لە لایەکی تریشەوە، هەوڵی جوداخوازان ئەوە دەسەلمێنێت کە ناسنامەی نەتەوەیی دابین نەبووە، بۆیە خەڵکێك خەبات لە پێناو دەستەبەر کردنیدا دەکەن. بارودۆخی ئێستای عێراقیش نموونەیەکی ئاشکرایە کە چۆن ناسنامە جۆراوجۆرەکان بە نائاسوودەیی پێکەوە دەژین و سەپاندنی ژێرخان و رەمزی نەتەوەیی تازە وەکو ئالایەکی تازەی عێراقی تەنها بە بێ بەش کردنی گروپە جیاجیاکان لە شەرعییەت و بە فەرمی ناسین سوودبەخش دەبێت . بەڵام زیاتر لە نەتەوەیەك لەو وڵاتەدا دەژین و لەوانەیە ئەو ئالایە بە ئالای راستەقینەی خۆیان نەزانن (نەتەوەی کورد زەقترین نموونەی ئەو گروپانەیە لە ناو عێراقدا ــــ وەرگێڕ).

گۆڕانکاری گەورەی دوای هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر و بڕیاری ئەمریکا بۆ دەستپێکردنی شەڕی دژە تیرۆر، بریتی بوو لەوەی چۆن هاوپەیمانەکانی وەکو روسیا و چین و ئیسرائیل هەوڵیان دەدا دژایەتی کردنی جوداخوازە نێوخۆییەکان و هەوڵەکانی تایبەت بە مافی چارەی خۆنوسین بە بەشێك لە شەڕی دژە تیرۆر پێناسە بکەن. هەرچەندە ئەم جۆرە هەنگاوانە کە لە رووی جیۆپۆلیتیکییەوە تا ئەوپەڕی هەلپەرستانەن، بەڵام سەرنجیش بۆ گرنگیی پێوەری جوگرافی لە ژیانی سیاسی و کولتووریدا رادەکێشن. هەندێ جاریش هەر سێ تەوەری نیمچە نەتەوەیی و نەتەوەیی و جیهانیی تێکەڵ بە یەك دەبن. بۆ نموونە، سەرۆکی روسیا "ڤلادیمیر بوتین" وەکو بەشێك لە شەڕی دژە تیرۆر، نوێنەرایەتی

دەست تێوەردانی توندی روسیای لە چیچاندا دەکرد تەنانەت پێش لە هێرشەکانی ٩/١١ یش، بە مەبەستی رووبەرووبوونەوەی ئەو هەڕەشەیەی کە بۆ سەر یەکێتی خاکی روسیا دروست ببوو. بەلاّم بە هۆی رێژەی بەرزی زیانەکان لە ریزی خەڵکی سیڤیلدا، چەکدارە ئیسلامییەکان هەڵس و کەوتی سەربازانی رووسیایان قۆستەوە بۆ پاساو هێنانەوە نەك تەنها بۆ کردەوە تیرۆریستییەکان لە ناوچەکەدا وەکو هێرش کردنە سەر قوتابخانەیەك لە ناوچەی "ئۆسیتیای باکوور"، بەڵکو بۆ شەرعییەت بەخشین بە کردەوەی تیرۆریستی لە شوێنەکانی تریش وەکو عێراق و ئیسرائیل.

## جیۆپۆلیتیك و شارستانییەت

لە ساڵی ١٩٩٣ زانای ئەمریکی "سامۆئیل هەنتینگتون" بە بلاّو کردنەوەی وتارێگ بە ناونیشانی " پێکدادانی شارستانییەتەکان" لە گۆڤاری "فۆرەن ئەفەیەرز"دا، جموجولێکی رۆشنبیریی گەورەی هێنایە کایەوە. هەروەکو وتارەکەی "فرانسیس فۆکۆیاما" کە لە ژێر ناوی "کۆتایی مێژوو" بوو، ئەم وتارەش بە ناونیشانە سەرنج راکێشەکەی و کاتە گونجاوەکەیەوە ناوبانگێکی زۆری نەك تەنها لە ناو ئەمریکا پەیدا کرد، بەڵکو شوێنەکانی تری وەکو رۆژهەلاّتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامییش هەمان بایەخیان پێ دەدا. وتارەکە بەم سەرەتا سەرنجڕاکێشە دەست پێدەکات:

سیاسەتی جیهانی خەریکە دەچێتە چوارچێوەیەکی تازەوە و رۆشنبیرانیش هیچ دوودڵییان نەکردووە لە پێشبینی کردنی جۆراوجۆر بۆ بابەتەکانی وەکو: مانای "کۆتایی مێژوو"، گەڕانەوەی ململانێی تەقلیدی نێوان ولاّتان، و هەروەها دارِمانی ولاّتە نەتەوەییەکان لە ئەنجامی جەمسەرکێریی هۆزەکی و جیهانگەراییەوە. بەلاّم سەرجەم رۆشنبیران لایەنێکی گرنگ و بنەڕەتییان دەربارەی ئەگەرەکانی سیاسەتی جیهانی لە سالاّنی داهاتوودا لەبیر چووە، ئەویش پێکدادانی شارستانییەتەکانە کە باڵ بەسەر سیاسەتی جیهانیدا دەکێشێت،و خاڵی جیاوازی نێوان شارستانییەتەکانیش لە ئایندەدا دەبێتە خاڵی جەنگ و ململانێی نێوانیان.

لە بەشەکانی تری بابەتەکەیدا، هەنتینگتون بۆچوونە رۆشنبیرییەکانی خۆی بە هەڵسەنگاندنێکی قەشەنگ و زیرەکانەوە دەربارەی جوگرافیای سیاسەتی جیهانی دەخاتە روو لە جیاتی ئەوەی تەنها هەڵسەنگاندنی نوسەرانی پێشووی جیۆپۆلیتیکی کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا پێشکەشیان کردووە، دووبارە بکاتەوە.

خاڵی سەرەکیی بۆچوونەکەشی بریتییە لە کێشانی نەخشەی جیهانێکی نوێ کە حەوت یان هەشت شارستانییەت بەخۆوە دەگرێت،لە جیاتی باس کردن لە تەنها یەك شارستانییەت کە لە

ناوچەیەکی جوگرافیی دیاریکراودا بالاٚ دەست بێت. لە جیهانی جیۆپـۆلیتیکی هەنتینگتونـدا، ئـاینی ئیسلام و بالاٚدەستیی ئەو ئاینە لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاٚتی ناوەڕاست و بـاکووری ئـەفریقا و ناوەڕاسـتی ئاسیا بە هەڕەشەی سەرەکی بۆ سەر شارستانییەتی ڕۆژئاوا هاتووەتە ژماردن. هەرچەندە تێگەیشـتنی هەنتینگتون بۆ شارستانییەت تەم و مژاوییە، بەلاٚم ئەو مەزەندە کردنەی بـۆ شارسـتانییەتی ئیسـلام وەکو هەڕەشـە، لـە نوسـینەکانی زانـای ئیسـلامی و ڕۆژهـەلاٚتی ناوەڕاسـت "بێرنـارد لـویس" ەوە سەرچاوەی گرتووە. لویس زۆر کاریگەر بووە لە دروستکردنی بۆچوونێکی تازە- محافـەزەکاری لـە نـاو ئەمریکا و هەروەها زۆرترین ڕاوێژی بە ئیدارەی سـەرۆکی ئـەمریکا جـۆرج بـوش کـردووە دەربـارەی ئەگەرەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەو ولاٚتە لە ڕۆژهەلاٚتی ناوەڕاستدا. بۆیە مایەی سەرسوڕمان نییە کـە زانای فەلەستینی- ئەمریکی "ئیدوارد سـەعید" بـە نوسـینەکانی هـەنتینگتون و لـویس خۆشـحالٚ نەبێت.

ئەلٚبەتە ناساندنی شارستانییەتی ئیسلامی وەکو مەترسیی سەرەکی بۆ سـەر ئـەمریکا و ڕۆژئـاوا دەبێتە بیرخەرەوەی سیاسەتی سـەردەمی شـەڕی سـارد لـە ژێـر پەردەیـەکی کولتـووری و جـوگرافی جیاوازدا. هەرچەندە بۆ ماوەی ٦٠ سالٚ کۆمۆنیزم و یەکێتی سـۆڤێت بـە هەڕەشـەی جیهـانی دژ بـە ڕۆژئاوا هەژمار دەکران، بە پێی قسەی ئیدوارد سەعید، ئێستا نۆبـەتی ئـاینی ئیسـلام و ڕۆژهـەلاٚتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقایە کە وەکـو هەڕەشـە بـۆ سـەر بەرژەوەندییـەکانی ڕۆژئـاوا بـژمێردرێن. هەتاکو ئەگەر ئەم بۆچوونەش بە ساویلکانە لە قەلٚەم بدرێت، هێشتا نەخشەی تازەی جیهان لـە هـزری هەنتینگتوندا چەندین خالٚی پشتگوێ خستن و لادانی نائاسایی بەخۆوە دەگرێت. بۆ نموونـە، چـەمکی ناساندنی ڕۆژئاوا وەکو کۆمەلٚگایەکی مەسیحی دەبێتە هۆی سڕینەوەی بوونی دەیان سالٚەی کۆمـەلٚگا بڕوادارەکانی تر لـە ئـەوروپا و ئـەمریکای بـاکوور. هـەروەها، هـیچ شارسـتانییەتێکیش نییـە کـە نەکەوتبێتە ژێر چەندین کاریگەرییەوە هەر لە هاتنی خەلٚك و بیرو بڕوای ئاینیی تازەوە بگـرە هـەتاکو دەگاتە فاکتەرە کولتووری و کۆمەلاٚیەتییەکانی تری وەکو زمان و جۆری خواردن و بیناسازی و هتـد. هەر گەشتیارێکیش سەردانی ئیسپانیا و پورتوگال بکات، نـاتوانێ تێبینـی کاریگـەریی بـەردەوامی بیناسازی ئیسلامی و ڕۆلٚی زمانی عەرەبی نەکات لە سەر ناوی شارو شارۆچکەو جێگا گشـتییەکانی تری ئەو دوو ولاٚتانە.

بۆ زیاتر نیگەران کردنی ئیدوارد سەعیدیش، لە بابەتێکدا بە ناونیشـانی "پێکـدادانی نـەفامی" کە لـە سـالٚی ٢٠٠١دا بـلاٚو کرایـەوە، بیرۆکـەی "پێکـدادانی شارسـتانییەتەکان" بـە بۆچـوونێکی ئەمریکی بۆ جیهان وێنا کـراوە کـە هێرشـەکانی ١١ی سـیپتەمبەر لـە چوارچێوەیەکی کولتـووری

جیاوازدا هەڵدەسەنگێنێت. هەرچەندە لەوانەیە بەشێك لە گرووپە چەكدارە ئیسلامییەكان پەنا بۆ ئـەو جۆرە كولتوورە ببەن، بەڵام مەترسی گـەورەی ئـەو ناولێنانـە سـاویلكانەی شـوێنەكان لەوەدایـە كـە سەربەخۆیی و فرە رەهەندی دەكاتە قوربـانی سـاویلكەیی و تـاك رەهەنـدی. بێگومـان تەنانـەت لـە ئەمریكای ژێرسایەی "بوش" یشدا، هێشتا رەخنەگری راسترەوی زۆر لە وێنەی "ئان كۆتلـەر" بـەدی دەكـرێن كـە بـە پەرۆشـەوە باڵادەسـتیی رۆژئـاوای مەسـیحی بـە سیاسـەتی دەرەوەی ئـەمریكاوە دەبەستنەوە،كە پشتیوانییەكی بێ بنەما لە ئیسرائیل و وێرانكردنی جیهـانی ئیسـلامی دەكـات. بـە لای ئەندامە توندڕەوەكانی كۆمەڵگا پرۆتستانتییەكانیشەوە، گەڕانەوەی مەسیح بۆ سەر زەوی كاتێـك روو دەدات كە جیهان شەڕی نێوان خێر و شەڕ بەخۆوە ببینێت، تەنانەت ئەگەر ئەو شـەڕە لـە شـێوەی پێكدادان لە گەڵ چەكدارە ئیسلامییەكانیشدا بێت.

دیارە دوور لە رەچاو كردنی هۆكارەكـانی دارمـانی جیهـان، مشـت و مـڕ دەربارەی"پێكـدادانی شارستانییەتەكان" تیشكی زیاتر دەخاتە سەر چۆنێتی دەربڕینی پرسی ناسنامە لەسەر ئاستی جیهـان بە گشتی. بەڵام ئەو جۆرە مشت و مڕانە هەمیشە خاڵە سەرەكییەكانی وەكـو جوگرافیـای مێـژوویی كۆلۆنیالیزم پشت گوێ دەخەن. بۆ ئەوەی مرۆڤیش لەو شێوازانە تێ بگات كـە بـە هۆیانـەوە شـوێنە جوگرافییـەكان و بیروبـاوەڕە كـان كارلێكیـان لەگـەڵ یـەكتردا دروسـت كـردووە، ئـەوا پێویسـتە هەڵسەنگاندنی تەواو بۆ میراتە كولتووری و سیاسی و ئابوورییە باڵادەستەكان و دژەكانیشیان بكـات. جارێكی تریش مەترسی بنەڕەتی لە تیۆرەكەی هەنتینگتون بریتییـە لـەوەی كـە شـوێنە جـوگرافی و بیروباوەڕەكانی تر وەكو مەترسـیدار و تۆقێنـەر بـاس كـراون. بـەڵام تەنانـەت ئەگـەر ئـەو شـوێن و بیروباوەڕانەش بە راستی مەترسیدار بن، مایەی سەرنجە بۆچی چاودێرانی وەكـو هـەنتینگتون و لـویس ئارەزوو ناكەن بە تێروتەسەلی باس لەوە بكەن كە چۆن ئەزموونی كۆلۆنیالیزمی بەریتانیی و فەرەنسـی بووەتە هۆی دروستبوونی شێوازی تایبەتی لـە پەیوەنـدیی جیۆپـۆلیتیكیی هاوچـەرخ لـە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاستدا كە تا ئێستاش ئەو شێوازە هەر بەردەوامە؟ ئەڵبەتە هەر كاتێ ئەو وڵاتانە دەستیان دەدایـە بۆمباران و غاز بارانی گەلانی ژێر دەستیان، ئیتر راستەخۆ باس لە باڵادەسـتیی ئـەخلاقی فەرەنسـا و بەریتانیا دەهاتە ئاراوە، وەكو پەردەپۆش كردنێك بۆ كردەوە دڕنـدەكانیان. لـە سـەرەتای بیسـتەكان و سییەكانی سەدەی رابردووشدا، وڵاتی میسر پڕ ببوو لە سەربازی بیانی و چەندین ناوچە بە تایبەت بـۆ ئەوروپییەكان قورغ كرابوو. ئەم باڵادەستییەش دواتر لە شێوەی ئەپارتایدی باشووری ئـەفریقا دووبـارە بووەوە. ولە ئەنجامی هەستكردن بە سەرشۆڕی و بوونی نایەكسانی لەو وڵاتـەدا "ئیخـوان موسـلمین" دروست بوو . دوای ئەوەش هەڵمەتێكی گەورەی دژە كۆلۆنیالی لە دژی بوونی بـەریتانیا لـەو وڵاتـەدا

دەستی پێکرد. لەو سەروبەندەشدا کەسایەتی رادیکاڵی میسری "سەید قوتب" لە ساڵی ١٩٤٨دا سەردانی ئەمریکای کرد و نارەزایی خۆی بەرامبەر کولتووری ماددی و جیاوازیی نەژادی لەو ولاتەدا دەربڕی،بە تایبەتییش لە بەرامبەر گرووپە ئەفریقییە ئەمریکییەکان. هەرچەندە چەندین هۆکار و سەرچاوە رۆڵیان هەبووە لە دروستبوونی گرووپە چەکدارە ئیسلامییەکانی ئێستادا، بەلام هاوکات بیرەوەری لە یاد نەچووی داگیرکاریی کۆلۆنیالی و رق و نارەزایی کۆمەڵگای ئیسلامی بەرامبەر سروشتی نەژادپەرستیی ولاتانی رۆژئاوای خاوەن سیستمی دیموکراتی- لیبراڵی، بەشێکی گرنگی ئەو هۆکارانە پێك دێنن. لە بەرامبەریشدا ولاتانی رۆژئاوا و بە پاڵپشتی و یارمەتی رژێمە داردەستەکانی وەکو میسر و سعودیە و ئوردن، بەردەوام بوون لە دەست تێوەردان لە کاروباری ئەو ولاتانە، هەتاکو دوای ئەوەی ولاتەکان سەربەخۆیی فەرمییشیان وەدەست هێنا. بۆ نموونە، ئێرانییەکان هەتاکو ئێستاش باس لە رۆڵی کاریگەری ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکا دەکەن لە کودەتا کردن بەسەر حکومەتە ریفۆرمخوازەکەی دکتۆر موسەدەق لەو ولاتە لە ساڵی ١٩٥٣دا.

بە گشتی، پێکدادانی شارستانییەتەکان سادەییەکی جوگرافی و کولتووری بەرهەم دەهێنێت کە بە هیچ شێوازێك ناگونجێت لەگەڵ جیهانی ئالۆزی سەردەم و کۆمەڵگا مرۆییەکانی ناو ئەو جیهانە کە پێکەوە بەستراون. بەلام لە سەردەمێکدا کە خەسڵەتی توندڕەوی باڵی بەسەردا کێشاوە،لەوانەیە ئەو جۆرە سادەییە لە دەربڕین سەرنجی بەشێك لە خوێنەران لە ئەمریکا و جیهانی ئیسلامی رابکێشێت. بۆ نموونە لە ناوچە دوورە دەستەکانی ئەمریکا، ئەو بۆچوونە دەبێتە جێگای رەزامەندی ئەو هاوولاتیانەی کە بە سروشتی خۆیان گەشتی دەرەکی ناکەن و لە هەمان کاتدا بە پەرۆشن بۆ تێگەیشتن لە رووداوەکانی پەیوەست بە هێرشەکانی ١١ی سیپتەمبەر لە ساڵی ٢٠٠١دا. هەروەها دەکرێ ئەو خوێندنەوەیە تێگەیشتنێکی تازەی جیۆپۆلیتیکی بخاتە سەر خەرمانی بۆچوونە جیهانییەکە، کە هۆکاری رکابەری کردنی ئەمریکا لە لایەن زۆربەی ولاتانەوە بۆ سەرکەوتوویی سیاسەتی ئەمریکا لە جیهاندا دەگەڕێنێتەوە. لەوانەیە لە شوێنەکانی تری جیهانیش بە هەمان شێوە پێشوازی لە چەمکی "پێکدادان" بکرێت، چونکە رۆشنایی زیاتر دەخاتە سەر ئەو جیهانەی کە بە لای زۆرێك لە موسڵمانانەوە بە جیهانی ترس و دڵەڕاوکێ و سەرشۆڕیی دەناسرێت. بۆ نموونە بە لای فەلەستینییەکانەوە، رۆتینی رۆژانە لە داخستنی رێگاکان و دانانی خاڵی پشکنین ئەوە بە بیر دێنێتەوە کە گرووپێکی ئاینی و نەتەوەیی وابەستە بە رۆژئاواوە بڕیار لە سەر ژیانی ملیۆنەها کەس دەدات.

دیاره لە بەرامبەر ئەم شانۆ جیۆپۆلیتیکییەدا، بن لادن و هاوکارەکانی خەباتی خۆیـان ئاراسـتەی "جو و خاچپەرستەکان" دەکرد کە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و شوێنەکانی تـردا سـەرقاڵی ئەنجامـدانی چالاکیین. ئەوەتا لە وتارە بەناوبانگەکەیدا، بن لادن چەمکی "پێکدادانی شارستانییەتەکان" ی بـەکار هێناوە بۆ روونکردنەوەو شەرعییەتدان بـە هەڵمەتـەکانی رێکخراوەکـەی بـۆ سـەر بەرژەوەندییـەکانی ئـەمریکا و هاوپەیمانـەکانی بـە رژێمـە داردەسـتەکانی میسـر و ئـوردن و سعودیەشـەوە. بنـەمای ئارەزووەکانی ناوبراویش بـۆ دروسـتکردنی کۆمەڵگایـەکی ئیسـلامی تـازە (ئومـمـە) بریتـی بـوو لـە پاکژکردنەوەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامی لە هەردوو رووی کولتووری و ئاینییەوە.




١٧. شاری قـاهیرە لـە سـەردەمی داگیرکاریـدا پێگـەو شـانۆی سیاسـی و پـەروەردەیی ژیـان و بەرهەمەکانی سەید قوتب بوو

گرنگترین خاڵیش بۆ بەدی هێنانی ئەو ئامانجە،بریتی بوو لە رەتکردنـەوەی هێزەکـانی ئـەمریکاو ئیسرائیل و ولاتـە داردەسـتەکانیان. ئـەو ئامانجـەش بـە روونـی لـە "راگەیانـدنی جیهـاد لـە دژی داگیرکـاریی ئـەمریکا بـۆ هـەردوو شـوێنە پیرۆزەکـە" دەردەکـەوێت و لـە دوای هێرشـەکانی ١١ی سیپتەمبەریش بۆ سەر نیویۆرك و واشنتون، جارێکە تر ئەو پەیامە دووپات کرایەوە. لەبەر ئەوە هـیچ مایەی سەرسەڕمان نییە کە "عەبدلا عەززام" ی فەلەستینی و هەروەها بـرای چـالاکوانی میسـری و دامەزرێنەری ئیخوان موسلمین "سەید قوتب" گەورەترین کاریگەرییان لەسەر بۆچـوونەکانی بـن لادن دروست کردبێت.

ئەمەی خوارەوەش ئەو دەرەنجامەیە کە جوگرافیناسی سیاسی "جۆن ئەگنو" دەربارەی بۆچوونی جیۆپۆلیتیکی بن لادن و ڕێکخراوی ئەلقاعیدە پێی گەیشتووە:

ئەمریکا پارچەیەکی جیابووەوەی جیۆپۆلیتیکییە کە بە شەیتانی سەر زەوی دەناسرێت. ئیلهامی ئاینییش خاڵی بنەڕەتییە لە شێواز و ئامانجەکانی ئەو ڕێکخراوە. ئەم بۆچوونانەش وێنەی پێچەوانەی چەمکی "پێکدادانی شارستانییەتەکان"ە کە زانای سیاسیی ئەمریکی "ساموئیل هەنتینگتون" لە ساڵی ١٩٩٣دا پێشکەشی کرد. لەم حاڵەتەدا، جیهانی ئیسلامی لە خەباتێکی چارەنووسسازدایە لەگەڵ شارستانییەتێکی یاخیدا کە ئەمریکا وەکو سەردەستەی ماددیەتی ڕۆژئاوا نوێنەرایەتی دەکات... تەنها بە لەناو بردنی ڕۆژئاواش، ئەو پیس بوونەی سەر زەوی پاك دەبێتەوە.

## ئەنجامگیری

ئەم بەشە تەرخان کرابوو بۆ باس کردن لە ڕۆڵی ناسنامە لە وێناکردنی پەیوەندییە جیۆپۆلیتیکییەکاندا. ئەم بایەخدانەش بە پرسی ناسنامە بە ئامانجی گۆڕینی چەقی بایەخدانە بە بابەتی جیۆپۆلیتیکی دوور لە بارودۆخە جوگرافییە چەقبەستووەکان، و هەروەها چالاکیی زلهێزەکانی وەکو ئەمریکا و چین. دیارە زانستی تازە سەرنجی زیاتر دەداتە چۆنێتی دروستبوونی پێگە و جوگرافیای وڵاتان و ماناو گرنگیی ستراتیجی ئەو پێگە جوگرافییانە لە سەر گۆڕەپانی سیاسی جیهاندا. ئەمەش مانای وایە کە ناوچەکان بۆ خۆیان ستراتیجی نین، بەڵکو پێویستە بایەخی زۆریان پێ بدرێت بۆ ئەوەی ببنە پێگەی ستراتیجی. لەم چوارچێوەیەدا، لێکدانەوەی جیۆپۆلیتیکی ڕۆڵی گرنگ دەبینێت لە بەهادار کردنی چەند گرووپ و ناوچەیەك لە سەر حسابی گرووپ و ناوچەی دیکە. ئەم جۆرە چالاکییانەش کاتێ کاریگەرتر دەبن کە وڵاتی ئەنجامدەریان هەوڵ بۆ جۆرێك لە رزگاربوونی هەرێمایەتی بدات و یان ڕووبە ڕووی هەڕەشەی ڕێکخراوە حکومی و ناحکومییەکانی دیکە ببێتەوە. بۆ نموونە لە وڵاتان و ناوچەکانی وەکو : ئیسرائیل/ فەلەستین، ئەرجەنتین/ چیلی، و پاکستان/ هند، بەڵگەی زۆر بەدی دەکرێن لەسەر ئەوەی کە چۆن لێکدانەوەی جیۆپۆلیتیکی بەکار دێت بۆ دەستەبەر کردنی ناسنامە یان چەند هەرێمێکی دیاریکراو، و ناساندنیان وەکو بەشێك لە وڵاتە پێك ناکۆکەکان. ئەمەش لە لای خۆیەوە دەبێتە مایەی پاساوی بەردەوام بۆ بەکار هێنانی هێزی سەربازی و پرنسیپە سیاسی و سەربازییەکانی وەکو مافی لە پێشینە بوون و کردەی تاکلایەنانە بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکان. ئەڵبەتە ئەم پرنسیپانە تەنها لەناو بازنەی حکومیدا دروست نابن، بەڵکو هۆیەکانی

دروستکردنی کولتووری گشتی وەکو رۆژنامە و گۆڤار و تەنانەت فیلمە کارتۆنییەکانیش بەشدار دەبن لە گەلالّە کردن و پەرەپێدانیاندا.

لە چەند حالّەتێکی دیکەدا، حکومەتە تازەکانی وەکو ئیستۆنیا و رێکخراوە غەیرە حکومییەکانیش بەردەوامن لە هەولّدان بۆ مسۆگەر کردنی ناسنامەی تایبەت بە خۆیان. بۆ نموونە لە حالّەتی ولاّتی ئیستۆنیادا، ئەندامێتی ئەو ولاّتە لە یەکێتی ئەوروپا و رێکخراوی پەیمانی باکووری ئەتلّەسی ناسراو بە "ناتۆ" زۆر کاریگەر بوون لە دوورخستنەوەی ئیستۆنیا لە وابەستەگی بە یەکێتی سۆڤێتی پێشوو و بلۆکی رۆژهەلاّتەوە. بە لای لایەنگرانی ئەم گۆڕانکارییە جیۆپۆلیتیکییەوە، کولتووری ئیستۆنیا کولتوورێکی ئەوروپییەو هەمیشە وەکو پێچەوانەی کولتووری روسیای غەیرە ئەوروپی پێناسە کراوە. هاوکات چاودێران بڕوایان وایە کە بوون بە ئەندامی یەکێتی ئەوروپا لە دوو لایەنەوە سوودبەخش بووە بۆ ئیستۆنیا: لە لایەکەوە دەرفەتێك بوو بۆ پتەو کردنی پێگەی ئەو ولاّتە وەکو ولاّتێکی ئەوروپی و لە لایەکی ترەوە دبێتە پارێزەری لە دژی ئەگەری هەر دەست تێوەردانێکی روسیا لە ئایندەدا. یەکگرتنی نێوخۆیی ئەو ولاّتەش وا لێك دەدرایەوە کە،وەکو حالّەتەکەی ئەلّمانیای رۆژئاوا لە پەنجاکاندا، دەبێتە مایەی بەهێزبوونی سەروەریی نیشتمانی نەك لاواز کردنی ئەو سەروەرییە. لەوانەیە دانیشتووانی روسی زمانی ئیستۆنیا کە لەو ولاّتەدا کەمینەن، زیاتر ترسیان لەو گۆڕانکارییە هەبێت. بەلاّم خودی ئەو ئەوروپایەی کە مەترسییان لیّ هەبوو بە هانایانەوە هات ( وەکو ئەوەی بە نیاز بوو بۆ کەمینەکانی ناو تورکیا ئەنجامی بدات). هۆکارەکەش روون و ئاشکرایە: هەر یاسایەکی ولاّتانی ئەندامی یەکێتی ئەوروپا کە جیاوازی لە نێوان هاوولاّتیاندا بکات، پێویستە هەلّبوەشێتەوە یان هەموار بکرێت بۆ ئەوەی مافی کەمینەکان بەپێی یاسا نیشتمانییەکان و هەروەها یاسا ئەوروپییەکانیش بە فەرمی بناسرێت و بپارێزرێت. بەمەش یاساکانی ولاّتی ئیستۆنیا ناچارن کە کەمینەکان بپارێزن بۆ ئەوەی ئەو ولاّتە لە ریزی یەکێتی ئەوروپادا جێگیر بێت.

بە گشتی، ئەم گفتوگۆیانە دووپاتی گرنگیی سنوورەکان و پەیوەندییە جوگرافییەکانیش لە چوارچێوەی جیۆپۆلیتیکی جیهانیدا دەکەنەوە. لە لایەکەوە سنووری حکومەتەکان گرنگیی زۆریان بۆ دەمێنێتەوە لە ناساندنی ناسنامەی نەتەوەییدا و زێدەڕۆییە ئەگەر وا لێك بدرێتەوە کە جیهانگەرایی ئەم پەیوەندییەی لەبەر یەك هەلّوەشاندووەتەوە. لە لایەکی ترەوە، حکومەتەکان و سنوورە نیشتمانییە وابەستەکانیان پەیوەستن بە ژمارەیەك پەیوەندیی جوگرافییەوە کە دەکریّ بە نیمچە نیشتمانی یان هەرێمایەتی ناوزەدیان بکەین. و لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکارییانەشدا، تاکەکان و گرووپەکانیش دەتوانن

پێناسەی فرە لایەنیان هەبێت کە ناسنامە و سنوورە نیشتمانییەکانیش تێپەڕ بکات و جۆرێک لە جیهانگەراییان پێ ببەخشێت.

# بەشی پێنجەم
# نەخشە و جیۆپۆلیتیك

هیچ جیگای سەرسوڕمان نییە کە لە کاتی شەڕو ململانێ نێودەوڵەتییەکاندا، زۆرترین بایـەخ بـە نەخشەو ئەو شوێنانەی نەخشە دەریـان دەخـات بـدرێت. کـاتێکیش رزگـاربوونی نەتـەوەیی بابـەتی نەخشەکان بێت، ئەوا نەخشە یارمەتی حکومـەت دەدات تـا پاسـاو بـۆ شـەڕەکانی بێنێتـەوەو ئـەو هەڕەشانەش روون بکاتەوە کە تووشی هاووڵاتیان دەبن. بۆ نموونە لە دوای هێرشەکەی ژاپـۆن بـۆ سـەر بەندەری پیرڵ هاربەر، "رۆزفلت" ی سەرۆکی ئەمریکا داوای لە سەرجەم هاووڵاتیانی وڵاتەکـەی کـرد نەخشە بکڕن بۆ ئەوەی باشتر لە تەحەداکان بۆ سەر ئاسایشـی نەتـەوەیی ئـەمریکا و هاوپەیمانـەکانی وەکو بەریتانیا تێ بگەن کـە لـە ئـەنجامی هەڕەشـەکانی ئـەڵمانیا و ژاپـۆن و ئیتاڵیـا روو بـەڕوویان دەبنەوە.

**وتاری رادیۆیی سەرۆك رۆزفلت لە ٢٣ی شوباتی ١٩٤٢**

پێویستە هەمووومان راستییەکی تاڵ بزانین و رووبەڕوویشی ببینەوە: ئەرکی ئێمە ئەوەیە شەڕێك بکەین کـە لـە وڵاتـەوە دوورەو بە سەرانسەری جیهانیشدا بڵاوەی کردووە. سەیری نەخشەکانتان بکەن. سەیری رووبەری بەرفراوانی وڵاتـی چـین بکـەن کە ملیۆنەها شەڕکەر بەخۆوە دەگرێت. سەیری رووبەری بەرفراوانی وڵاتـی روسـیا بکـەن بـە سـوپا بـەهێز و گەورەکەیـەوە. سەیری دوورگەکانی بەریتانیا، ئوستراليا، نیوزیلەندا، دوورگەکانی هنـدی هۆڵەنـدی، هنـد، رۆژهـەڵاتی نزیـك، و کیشـوەری ئەفریقا بکەن کە خاوەن سەرچاوەی زۆری کەرەستەی خاو و چەندین گەل و نەتەوەن کـە سـوورن لەسـەر بەربـەرەکانێ کردنـی داگیرکاری. هەروەها سەیری ئەمریکای باکوور، ئـەمریکای ناوەڕاسـت، و ئـەمریکای باشـوور بکـەن... داواتـان لێ دەکـەم جارێکی تریش سەیری نەخشەکانتان بکەن، بە تایبەتییش ئەو بەشەی زەریـای ئـارام کـە دەکەوێتـە رۆژئـاوای دوورگـەکانی هاوای. تەنانەت بەر لەوەی شەڕیش دەست پێ بکات، دوورگەکانی فیلیپین لە سێ لاوە بە هێزەکانی ژاپۆن دەورە درابوون. لـە لای رۆژئاواوە واتا لە لای وڵاتی (چین)ەوە ژاپۆنییەکان دەستیان بەسەر کەنارەکانی چین و چینی هندیدا گرتبوو،کە حکومـەتی فەرەنسا رادەستی کردوون. لە لای باکووریشەوە دوورگەکانی ژاپـۆن بـەدی دەکـرێن کـە هـەتاکو نزیکـەی دوورگـەی لـوزۆن (گەورەترین دوورگە لە فلیپین) درێژ دەبنەوە. لە لای رۆژهەڵاتیشەوە دوورگە داگیرکراوەکانن کە ژاپـۆن داگـیری کـردوون. بـە پێچەوانەی بەڵێنەکانی پێشوویش، هێزی زیاتری تێیاندا داناوە. ئـەو دوورگانـەی دەکەونـە نێـوان هـاوای و فیلیـپین... ئـەم دوورگانە.. بە سەدان دوورگە لەسەر نەخشەکان وەکو خاڵی بچووك دەردەکـەون. بـەڵام لـە راسـتیدا بـریتین لـە رووبـەرێکی گەورەی ستراتیجی. دوورگەی "گوام" یش دەکەوێتە ناوەندیانەوە... خاڵێکی چاودێریی دابـڕاو کـە ئێمـە هـەرگیز پتـەومان نەکردووە.

جەماوەری ئەمریکاش وەڵامی داواکارییەکەی سەرۆکیان دایەوەو بە شـەوقەوە نەخشـەیان کـڕی. هاوکات "ئەنجومەنی جوگرافیای نیشتمانی" و گۆڤـارە بەناوبانگەکـەیان، "جوگرافیـای نیشـتمانی" خوێنەری زیاتریان بۆ پەیدا بوو. کاتێکیش سەربازانی ئەمریکا دەستیان دایـە کـردە سـەربازییەکانیان لە ئەوروپا و ئاسیا و ناوچەی زەریای هێمن، هاووڵاتیـانی ئـەمریکا ئارەزوویـان دەکـرد هەڵکەوتـەی جوگرافیی شوێنەکانی وەکو گوادال کەناڵ (گەورەترین دوورگە لە ناو دوورگەکانی سۆلۆمۆن- وەرگێـڕ) و نۆرماندی لەسەر نەخشەی جیهان بزانن. بەڵام ئەم ئارەزوو کردنـە بـۆ دڵنیـا بـوون لـە جوگرافیـای گۆڕەپانەکانی شەڕ کلتێ بایەخی زیـاتری وەدەسـت هێنـا کـە ئاگـاداری زۆرێـك لـە کـەس و کـاری سەربازەکان دەکرایەوە کە لەوانەیە سەربازەکانیان لەناو بچن و بە زیندویی لەو شـانۆ بـەرش و بـڵاوەی شەڕ نەگەڕێنەوە.




١٨. سەرۆك فرانكلین دیرنۆ رۆزڤێلت

بێگومان شەڕ و نەخشە و جوگرافیا پێکەوە سێ گۆشەیەك دروست دەکـەن و زانیـاریی جـوگرافی ورد و دروسـتیش زۆر گـرنگ و کاریگـەرە، چـونکە لەسـەر بنـەمای ئـەو زانیارییانـە فەرمانـدە سەربازییەکان و سەرکردە سیاسییەکان بڕیار لەسـەر چـەندین خـاڵی گـرنگ دەدەن وەکـو: هێڵـەکانی پشتیوانی، بایەخی تۆپۆگرافی، شێوازەکانی پێشڕەوی کردن،و هەڕەشـە مەزەنـدە کراوەکـان بـۆ سـەر

یەکــە ســەربازییەکانیان. ئــەو نەخشــانەی کــە لــە ســاڵانی چــلەکاندا دەرکــەوتن، ئاســتی کــردە سەربازییەکانیان لە ناو سێ کیشوەردا بۆ هاوولاتیانی ئەمریکا روون دەکردەوە، بێجگە لــە نیشــاندانی جەمسەرەکانی تازەی هێز لە جیهاندا. لە ئەنجامیشدا،بابەتی گــرنگ بــە بــیری بینــەران و خوێنرانــدا دەهاتەوە: بۆ نموونە، ئەمریکا بە دوو رووبەری ئاوی دەورە دراوە (زەریای ئەتڵەسی و زەریــای هــێمن)، بەڵام هاوکات لە لای باکووریشەوە لە یەکێتی سۆڤێت و باکووری ئــەوروپاوە نزیــك بــووە. هەرچــەندە هــەتاکو دەســت پێکردنــی شــەڕی ســارد و ســەرهەڵدانی یــەکێتی سۆڤێــت وەکــو هەرەشــەیەکی جیۆپۆلیتیکی، بە تەواوی هەست بە رادەی ئەو گۆڕانکارییە بەرەو جەمسەری باکوور نەدەکرا، بــەڵام هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی هوشیارانە پێگەی ئەمریکا لە جیهاندا دیاری بکات. بە هەر حاڵ، ئــەم جــۆرە گۆڕانکارییە نەخشەییانە جۆرێکی تازەیان لە هۆشیاریی جوگرافی هێنایە کایەوە کە ولاتێکــی خــاوەن ئاراستەی نێودەوڵەتی و بە پەرۆش بۆ دروستکردنەوەی سیستمی جیهانی دوای شەڕی زیندوو کردەوە.

ئەم بەشە باس لە پێنج نموونەی نەخشەیی دەکات بە مەبەستی روونکردنەوەی زیــاتری پەیوەنــدیی نێوان نەخشە و جیۆپۆلیتیك:

یەکــەم: پێداچــوونەوە بــە نەخشــەکانی "هــالفۆرد ماکنــدەر"، چــونکە بــە بەشــێك لــە هەوڵــە سەرنجراکێشــەکان دادەنــرێن بــۆ هەڵســەنگاندنی سیســتمی تــازەی جیهــانی لــە ســەرەتای ســەدەی بیستەمدا.نەخشە و نوسینەکانی دواتریش لە لایەن جوگرافیناســانی وەکــو "ئیســیا باومــان" رۆڵــی سەرەکییان گێڕا لە داڕشتنەوەی سنووورە نێودەوڵەتییەکانی ئــەوروپا لــە دوای کۆتــایی هــاتنی شــەڕی یەکەم ی جیهانیی. بێگومان ئەم نەخشانە کاریگەریی درێژخایەنیان هەیە، چــونکە هــەتاکو ئێســتاش ئەمریکییەکان و رووسەکان و چاودێرانی دیکەی سیاسی و رۆژنامەنووسان لە ئەمریکای لاتین و ئێــران و چین گفتوگۆ دەربارەیان دەکەن. هۆکارەکانی ئەم بایەخدانــەش جۆراوجــۆرن و بــە پێــی هەڵکەوتــەی شوێنی خوێنەرەکە دەگۆڕێن. بۆ نموونە، پسپۆرانی ئاسایشی ئۆزبەکستان بایــەخیان پــێ دەدا، چــونکە ماکندەر ئاسیای ناوەڕاستی بە "تەوەری جوگرافیایی مێژوو" ناوزەد کردووە. لــەو لاشــەوە پســپۆرانی بواری ستراتیجی و مێژوو نوسانی وەکو "پۆڵ کەنەدی" زۆر بە پەرۆشەوە دەگەڕانەوە بۆ ئــەو نەخشــانە بۆ ئەوەی بە باشی لە ئامانجەکانی ئەمریکا لە بایەخدان بە ئاسیای ناوەڕاست و رۆژهــەلاتی ناوەڕاســت تێ بگەن.

دووەم: رۆڵی "ئیسیا باومان" لە لیژنەی لێکۆڵینەوە و بەشداری کردنی لە کۆنفرانسی ئاشــتی لــە ساڵی ١٩١٩ بە گرنگ و چارەنووسساز دادەنرێت. لە ماوەی نێوان شەڕەکانیشدا لە ئەوروپا، چــەندین سنووری سیاسی و ئەتنی تازە سەپێنران بەسەر نەخشــەی گــۆڕاوی کیشــوەرەکەدا. هــەروەها باومــان

ڕۆڵی سەرەکیی دەگێڕا لە دڵنیا بوون لەوەی گۆڕانکارییە سیاسی و نەخشەییەکان کە تا ئێستاش بەردەوامن، کاریگەریی بنچینەییان هەبێت لە سەر ئەوروپا و ناوچە نزیکەکانی وەکو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەوەبوو هەردوو ئیمپراتۆرییەتی نەمسا و هەنگاریا لە لایەك و عوسمانییەکان لە لایەکی ترەوە لەبەر یەك هەڵوەشانەوە و لە ئەنجامیشدا لایەنە ئاشتیخوازەکان کە پێگەیان لە پاریس بوو، ڕووبەڕووی ئەگەری دابەشبوونی زیاتر و سەرهەڵدانی شۆڕش بوونەوە لە شوێنەکانی وەکو بولگاریا و ڕۆمانیا. هەموو لایەکیش بڕوای وابوو کە ناوچە و هەرێمەکان دەبنە کەرەستەی ئاشتی و لە ئەنجامیشدا سنووره تازەکان ڕۆڵی گرنگ دەگێڕن لە پێشخستنی ئاشتی و سەقامگیریدا. بەڵام دارشتنەوەی نەخشەی ئەوروپا بە ڕەچاو کردنی پرنسیپەکانی وەکو مافی چارەی خۆنوسین (واتا مافی گەلەکان لە دەستنیشان کردنی ئەو وڵاتەی کە ئارەزوو دەکەن تێیدا بژین)، سەلماندی کە بابەتەکە زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە تەنها چەند هێڵێك لەسەر نەخشەکان بگۆڕدرێن. بۆ نموونە، دروست کردنی عێراق لە لایەن بەریتانیاوە لە ساڵانی بیستەکانی سەدەی رابردوو، وێنەیەکی ئەو دروستکردنە نەخشەییە نیشان دەدات کە تا ئێستاش وەکو مۆتەکە بەرۆکی هەوڵەکانی ئەمریکای بۆ دامەزراندنی دیموکراتییەتێکی سەقامگیرو کردەیی لەو وڵاتەدا گرتووە.

سێیەم: لێکۆڵینەوەی ورد دەربارەی زنجیرە فیلمی "بۆچی شەڕ دەکەین" ئەنجام دراوە، لەگەڵ بایەخی تایبەتی بە ئەڵقەی "هێرشی نازی"، چونکە نەخشەو زاراوە جوگرافییەکانی "هالفۆرد ماکندەر"ی گەیاندووەتە ئاستێکی گشتی و ترسناك. ("بۆچی شەڕ دەکەین" زنجیرە فیلمێکی حەوت ئەڵقەییە کە فرانك کاپرا دەری هێناوە و لەسەر داواکاری حکومەتی ئەمریکا بۆ سەربازە ئەمریکییەکان بەرهەم هێنراوە بە مەبەستی ڕازی کردنیان سەبارەت بە هۆکاری بەشداری کردنی ئەمریکا لە شەڕی جیهانیی دووەمدا. دواتر زنجیرە فیلمەکە نیشانی گەلی ئەمریکا بە گشتی درا بۆ ئەوەی پاڵپشتی لە بڕیاری بەشداری کردنی حکومەتەکەیان لەو شەڕەدا بکەن. هێرشی نازی" ئەڵقەی دووەمی زنجیرە فیلمەکەیە و باس لەوە دەکات کە ئەڵمانیا هەر لە سەردەمی "ئۆتۆ ڤۆن بسمارك"ەوە لە ساڵی ١٨٦٣ ئارەزووی دەستدرێژی کردن و پاوانخوازی هەبووەو نازییەکانیش بەشێکن لەو ئارەزووە--- وەرگێڕ)

ئەو زنجیرەیە کە بۆ وەزارەتی بەرگری و بەشی زانیاری سوپا بەرهەم هێنرابوو، زۆر گرنگ بوو بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو هۆکارە جوگرافی و سیاسییانەی کە بوونە هۆی ڕاگەیاندنی شەڕ لە دژی ئەڵمانیا و ژاپۆن. زنجیرە فیلمەکە ناوبانگێکی زۆری لە ناو ئەمریکا پەیدا کرد، چونکە زانیاری ڕاستەوخۆی دەربارەی دانیشتوان و سەرچاوەکان و شوێنە جوگرافییەکان نیشان دەدا کە چەقی هێزی ئەو دوو

ولاتەیان پێك دەهێنا. ئەم زنجیرەیە لەگەڵ چەندین نەخشەدا کە لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاو کرانەوە، رۆڵی سەرەکییان بینی لە دروستبوونی رامانێکی رادیکاڵی شەرخوازانە لە لای هاوولاتیانی ئەمریکا. ئەمەش زۆر گرنگ بوو بۆ ئامادەکردنی گۆڕەپانێکی خەیاڵی بۆ رووبەروو بوونەوەیەکی تازەی جیهانیی لە ئایندەدا کە خۆی لە شەڕی ساردا بینییەوە.

چوارەم: دەرکەوتنی نەخشەی بونیاتنراو لەسەر جەمسەرەکان پێویستی بە پێداچوونەوەو هەموار کردن نەبوو، چونکە دووپاتی ئەوەی دەکردەوە کە لە سەردەمی شەڕی ساردا دوورییەکی ئەوتۆی جوگرافی لە نێوان هەردوو زلهێزەکەدا بەدی ناکرێت. لەولاشەوە، داهێنانی بۆمبی ستراتیجیی دوور مەودا و مووشەکی بالیستی کیشوەربڕ (عابر للقارات) لەم رووەوە رۆڵی کاریگەریان بینی. ئیتر لە باس کردنی دووری نێوان ولاتەکاندا،خەڵك ئاماژە بە کاتژمێر و چرکە دەکەن نەك حەفتە و رۆژ. هەر یەك لە لایەنەکانی شەڕی ساردیش دەستیان دایە هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەو هەڵسەنگاندن و بلاو کردنەوەی نەخشەو وێنەی شوێن و پێگەکانی لایەنەکەی دیکە. لەم چوارچێوەیەشدا سوودیان لە کەرەستەکانی وەکو سیخوڕیی ئاسمانی و لێکۆڵینەوەی ژێر دەریایی و هەروەها وێنەی مانگی دەستکرد وەردەگرت. لە گرنگترین بەرهەمەکانی ئەو شێوازە سیخوڕییەشدا، ئەو وێنانەی کە فڕۆکەی سیخوڕی U2 ی ئەمریکی لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٢ کرتبوی، رۆڵی سەرەکیی بینی لە هاندانی ئیدارەی سەرۆك جۆن کەنەدی بۆ رووبەڕوو بوونەوەی بڕیاری یەکێتی سۆڤێت لە دانانی پێگەی موشەکی لە کوبا. بەلام رازی بوونی سۆڤێت بە لابردنی ئەو پێگە مووشەکییانە لە لایەك و بەرەنگاری کردنی توندی سەرۆك کەنەدی بۆ بەرپرسە سەربازییەکانی ولاتەکەی کە داوای ئەنجامدانی هێرشی ناووکییان بۆ سەر سۆڤێت دەکرد لە لایەکی ترەوە، ئاگری شەڕی سێیەمی جیهانی کوژاندەوە.

پێنجەم: ئێستاش هەوڵێکی تازەی پسپۆری ستراتیجی ئەمریکی "تۆماس بارنیت" بۆ دروستکردنی نەخشەیەکی تازەی جیهانی لە دوای ١١ی سیپتەمبەر و دواتریش شەڕی دژە تیرۆر هەڵدەسەنگێنین. ئەو نەخشەیە کە لە سەروبەندی داگیرکردنی عێراق لە لایەن ئەمریکا و بەریتانیاوە لە ئاداری ٢٠٠٣ لە گۆڤاری "ئیسکوایەر" بلاو کرایەوە، جیهانی دابەش کردووە بەسەر دوو بەشدا کە بریتین لە "کرۆك " و" بۆشایی" و لە ئەنجامدا بووەتە جێی سەرنجی میدیاکاران و پسپۆڕانی بواری ئەکادیمییش. بەلام بەلای نەیارەکانییەوە، نەخشەکە تەنها دووبارە کردنەوەی نەخشەسازییە سیاسییە ساکارەکەی ئیدارەی بوش بووە. لایەنگرەکانیشی بە پێچەوانەوە، بڕوایان وابوو نەخشەکەو کۆمێنتەکانی هاوپێچی دەربڕی شکستی زۆرێك لە ولاتان و هەرێمەکانە کە بە تەواوی هەماهەنگ

نین لە گەڵ ئابووری جیهاندا. لە ئەنجامی ئەو ناهەماهەنگییەشدا، دەكرێ ئەو وڵاتانە ببنە پێگەی چەكی یاساغ و تۆڕی تیرۆریستی و چالاكیی تاوانكارانە.

بە گشتی نەخشە وەكو وێنەی رووبەرە سیاسییەكان، هیچ كاتێك بێ لایەن و یان دەربڕی راستەقینەی راستییەكان نییە. وێنەگری سیاسیی فەرەنسی "ڤیس لاكۆست" لە گەرمەی بۆمباران كردنی ئاسمانی ڤێتنام لە لایەن ئەمریكاوە كە پشتی بە زانیاری نەخشە سازی دەبەست، بەم شێوەیە وەسفی رۆڵی نەخشە دەكات:

نەخشە وەكو سەرچاوەیەكی سەرەكیی جوگرافیا، هەمیشە كەرەستەیەكی گەورەی هێز بووە و دەربڕی بەرجەستەی ئەو راستییانەیە كە بە هۆی بایەخە سیاسی و سەربازییەكانەوە داڕێژراون و گەشەیان كردووە. هاوكات شێوازێكیشە بۆ دەربڕین و دیاری كردنی رووبەرە جوگرافییەكان و خزمەت كردن بە گرنگیی وڵاتان.

هەر وەكو ئەوەی لێكۆڵینەوە نەخشەییەكانی نوسەرانی وەكو بریان هارلی و دێنس وود روونی دەكەنەوە، نەخشە رەنگدانەوەی هێز و زانیارییە، هەرچەندە لەوانەیە بە رواڵەت تەنها جوان و سەرنج راكێش بێت. ئاژانسە حكومییەكانیش بە زۆری سوود لە جوگرافیناس و نەخشەسازەكان دەبینن بۆ ئەوەی نەخشە بۆ سەركردە سیاسییەكان ئامادە بكەن. ئەو جوگرافیناس و نەخشە سازانەش لە چوارچێوەی رێكخراو وپێكهاتەی دیاریكراودا كار دەكەن وەكو: رێكخراوی نیشتمانی رووپێوی هند، رووپێویی سەربەخۆی دوورگەكانی فۆكلاند، تیمی ئەندازیارانی سوپای ئەمریكا، و خزمەتگوزاریی تۆپۆگرافی سەربازیی سۆڤێت. هەروەها نەخشە رۆڵی سەرەكیی لە مێژووی چەند وڵاتێكی دیاریكراودا گێڕاوە، وەكو ئەڵمانیای سەردەمی شەڕ كە تێیدا نەخشەسازان رۆڵی گەورەیان گێڕا لە هوشیار كردنەوەی خەڵك دەربارەی " ئەڵمانیای گەورەتر" و ئەو نادادپەروەرییانەی كە بە هۆی كۆنفرانسی ئاشتی لەساڵی ١٩١٩ بەرامبەر ئەو وڵاتە ئەنجام دران.

## تەوەری جوگرافیایی مێژوو: هالفۆرد ماكندەر و سەردەمی پاش كۆڵۆمبی

هالفۆرد ماكندەر یەكێكە لە جوگرافیناسە گرنگەكانی بەریتانیا و تا ئێستاش زانكۆی بەناوبانگی ئۆكسفۆرد بە بەردەوامی كورسییەك لە بواری جوگرافیادا بەناوی ئەو جوگرافیناسەوە تەرخان دەكات. ناوبراو كە لە سەرەتای بیستەكانی تەمەنیدا بە ئەندامی كۆمەڵەی جوگرافی مەلەكی هەڵبژێردرا،وەكو خوێنەرێكی بواری جوگرافیا لە ئۆكسفۆرد وەرگیرا و دواتریش بووە بەڕێوەبەری "سكوڵی ئابووری لەندەن". ئینجا بە ئەندامی پەرلەمان هەڵبژێردرا و بوو بە پشتیوانێكی گەورە بۆ

"جۆزیف چامبەرلەین" و بزوتنەوەی ریفۆرمخوازی پادشاهی. ماکنـدەر بـە هـەمان شـێوەی هـاوڕێ و هاوچەرخەکانی لە بواری سیاسی و ئەکادیمیدا، بـە دەرکـەوتنی بـەردەوامی ئـەڵمانیا و ئـەمریکا لـە ئابووری جیهان و پرسە سیاسییەکاندا سەرقاڵ بـوو. هەمیشـە دووپاتیشـی دەکـردەوە کـە جوگرافیـا تومخێکی بنەڕەتییە لە هوشیارکردنەوەی هاوولاتیانی بەریتانیا چونکە، وەکو ئەوەی لە سـاڵی١٩٠٧دا تێبینی کردبوو:

پێویستە ئامانجمان ئەوە بێت وا لە سەرجەم خەڵکی ولاتەکەمان بکەین کە بە شێوەی ئیمپراتـۆری بیر بکەنەوە- واتا لە ئاسـتی جیهانیـدا بـیر بکەنـەوە- و پێویسـتە فێرکردنـە جوگرافییـەکانمان بـەم ئاراستەیە بێت.

دواتر ماکندەر بوو بە ئەندامی لیژنەی ڕێنمایی بینایی لە دەزگای کۆلۆنیالێ ولاتەکەیـدا و ڕۆڵـی سەرەکییشی بینی لە داڕشتنی بابەتی پـەروەردەیی بـۆ قوتابخانـەکان و هـەروەها بابـەتی تـریش بـۆ سەرجەم خوێنەرانی بەریتانیا بە گشتی.

لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٠٤دا، ماکندەر لێکۆڵینەوەکەی بـە ناونیشـانی " تـەوەری جوگرافیایی مێژوو" پێشکەش بە کۆمەڵەی جوگرافیایی پادشاهی لە لەندەن کرد. لێکۆڵینەوەکـە بـە پشتیوانی چەندین نەخشەی روونکردنەوە، هەڵسەنگاندنێکی گشتگیری جوگرافیا و مێژووی جیهـانیی بەخۆوە دەگرت. ئەو کارەش هاوکات بوو لە گەڵ سەردەمێك کە بـە سـەردەمی پاڵەپسـتۆی شـوێن و کات لە جیهاندا ناسرابوو. لەم بارەیەوە مێژونووسی ناودار "ستیفن کێرن" ئاماژەی بـۆ ئـەوە کـردووە کە لە ماوەی نێوان ١٨٨٠ و ١٩١٤دا گۆڕانکاری بنچینەیی بەسەر جیهاندا هـاتووە، لەبـەر چـەندین هۆکاری وەکو: سەپاندنی کاتی ستاندارد (واتا گرینج)، داهێنانی رادیۆ، بەهێزکردنی هێڵـی ئاسـنین، و داهێنانی گەشتی ئاسمانی . هاوکات پرۆژەی کۆلۆنیـاڵی ئـەوروپاش کـە ئیسـپانیا لـە سـەدەی ١٥دا دەستی پێکردبوو، گەیشتە لووتکە. بە بۆچـوونی ماکنـدەر، جیهـان خەریکـە بـەرەو قۆنـاغی پـاش کۆلۆمبی هەنگاو دەنێت، کە تێیدا دەرفەتی ئەوتۆ بۆ ولاتە ئیمپریالییەکانی وەکو بەریتانیا نامێنێـت تا شوێنی زیاتر داگیر بکەن.

ئەگەر ناوچەکانی جەمسەر وەلاوە بنێین، ئەوا دەکـرێ بڵـێین لێکۆڵینەوەکـەی ماکنـدەر مێـژوو و جوگرافیا و سیاسەتی پێکەوە گرێ داوە، بۆ ئەوەی رێگایەك بدۆزێتەوە بۆ وێنـا کردنـی جیهـان وەکـو یەك پارچەی لەیەك دانەبڕاو. دیارە کاتی لێکۆڵینەوەکەش رەنگدانـەوەی ئـەو بیرکردنـەوە جوگرافییـە پان-ئەوروپییە بوو کە تازە سەری هەڵدەدا.

له لایەکی ترەوە سیاسەتوان و رۆژنامەنووسانی فەرەنساش هەمان بایەخیان بە بابەتەکە دەدا و رۆژنامەی فەرەنسی "لولەسترەیشن" له ساڵی ۱۹۰۰دا بابەتێکی دەربارەی گۆڕانکاری لە دیمەنی جیۆپۆلیتیکی جیهاندا بلاو کردەوە. هەر لەگەڵ بابەتەکەشدا چەندین نەخشەی بلاو کردەوە دەربارەی حەتمییەتی دروستبوونی چەندین ولاتی تازە لە سەرجەم کیشوەرەکاندا. لەو بەری زەریای ئەتلەسیشەوە، بڕیاری ئیدارەی سەرۆکی ئەوکاتەی ئەمریکا "تیۆدۆر رۆزفلت" بە فراوانکردنی پێگەی ئەمریکا لە کوبا و پۆرتۆریکۆ و گوام و فیلیپین، ئاماژە بوو بۆ قۆناغێکی تازە لە داگیرکاریی ئیمپریالی لە لایەن ئەمریکاوە. لەبەر ئەوەی هاوولاتیانی ئەمریکاش ئارەزوویان دەکرد ئەو شوێنانە لەسەر نەخشە و خشتەو تۆپی جوگرافی تازە ببینن، بایەخدانی جەماوەر بە نەخشەو دیمەنی وێنەیی تایبەت بە کوبا و فیلیپین رووی له زیاد بوون دەکرد. کۆمەڵەی جوگرافیناسانی ئەمریکا کە لە ساڵی ۱۸٥٤دا دامەزرا، و هەروەها کۆمەڵەی نیشتمانی جوگرافیناسان کە لە ساڵی ۱۸۸۸ دروست کرا، رۆڵی خۆیان هەبوو لە هاندان و برەودان بە هزری جوگرافیی ئەندامان و بەشداربووانی گۆڤاری "ناشنال جوگرافیك". ئیتر کاتێ ماکندەر هوشیاری ئەوەی دەدا کە پێویستە هاوولاتیانی ولاتەکەی زیاتر لە هەر کاتێکی تر نرخی جیهانگەرایی بزانن، هاوولاتیانی ئەمریکاش لە لای خۆیانەوە هەوڵیان دەدا ئاسۆی جوگرافی خۆیان فراوانتر بکەن.

ماکندەر بڕوای وابوو کە لە سەردەمی پاش کۆلۆمبیدا، پێویستە ولاتانی وەکو بەریتانیا کاریگەریی زیاتر دروست بکەن لە جێگای ئەوەی تەنها چاویان لە کۆنترۆڵکردنی ناوچەی جوگرافی تازە بێت. بەلام لەبەر ئەوەی تەرازووی هێز کە پێشتر لە لای ولاتانی خاوەن هێزی دەریایی وەکو بەریتانیا بوو، بە کۆتا هات و بەرەو لای هێزی زەمینیی وەکو ئەلمانیا و رووسیا لارەسەنگ ببوو، ئیتر داهێنانی هێڵی شەمەندەفەر بووە خاڵی وەرچەرخان نەك فراوانبوونی هێزی دەریایی کە پێشتر پشتی پێ دەبەسترا. ماکندەر بڕوای وابوو  کە ئەو ناوچەی خۆی بە "دڵی زەوی" ناوزەدی کردبوو، لە ئایندەدا دەبێتە سەرچاوەی هێز و کەرەستە خاوەکان. ئەمەش رووبەرێکی زۆری ئەوروپا و ئاسیای بەخۆوە دەگرت کە رێژەیەکی زۆری لە سەرچاوەی سروشتی و گرنگی دیمۆگرافی تێدا بەدی دەکرا. لەم رووەوە ماکندەر دەڵێت:

لارەسەنگ کردنی هاوکێشەی هێز بۆ بەرژەوەندی ولاتێکی میحوەری... دەبێتە هۆی بەکارهێنانی رێژەیەکی زۆر لە سەرچاوەی سرووشتیی کیشوەرەکان بۆ دروست کردنی کەشتی گەلی جەنگی و لە ئەنجامیشدا ئەو ولاتە وەکو ئیمپراتۆرییەت دەردەکەوێت. ئەگەر ئەلمانیا هاوپەیمانێتی لەگەڵ رووسیادا هەڵبژاردایە، لەوانەیە ئەو ولاتە ئیمپراتۆرییە دروست ببوایە.

به بڕوای ماکندەر، هەر ولاتێك كۆنترۆڵی "دڵی زەوی" بكات، دەتوانێت لە ئایندەدا دەست بەسـەر جیهاندا بگرێت. ئەگەر هوشیاری بەریتانیاش نەبوایە، دەكـرا یـەكگرتنی دارایـی روسـیا و ئـەڵمانیا هەژموونێكی جیهانی وەدەست بێنێت، چونكە دەبوونە خاوەن سەرچاوەی پێویسـت بـۆ دروسـتكردن و بەكارهێنانی هێزی زەبەلاحی زەمینی و دەریاییش.

بەمەبەستی وەدەستهێنانی ئەو بالاًدەستییەش، "ناوچەی میحوەری" وەكو خـاڵی هـاتن و چـوون بۆ "دڵی زەوی" هەژمار دەكرا. ماكندەریش لە چوارچێوەی هەڵسەنگاندنە گشتگیرەكەیدا بۆ مێـژووی جیهان، تێبینی دووبارە بوونـەوەی شـێوازێكی جـوگرافی كـردووە كەسـەردەمی ئێسـتا بـە سـربیا و ناوەڕاستی ئاسیای سەردەمی مۆدێرنیزم دەشـوبهێنێت. هـەر لـە سـاڵی ( ١٩٠٤ ) یشـەوە،ماكندەر تێبینی ئەوەی كردبوو كە بەریتانیا لە سیناریۆیەك بەناو "یاری گەورەكان" لەگـەڵ رووسـیادا دەسـتەو یەخە بووەتەوە بۆ كۆنتترۆڵكردنی ئەو " ناوچەی میحوەری " ە، چونكە ئەو ناوچە نزیكـە لـە هنـدی بەریتانییەوە. دیارە نەخشەو رووپێوەكان رۆڵی خۆیان لەم رووبەڕووبوونەوەی نێوان بەریتانیا و رووسـیادا بینی لەبەر ئەوەی هەردوولا بە پەرۆش بوون بۆ پەرەدان بە زانیـاری جـوگرافی بەمەبەسـتی پاراسـتن و برەودان بە بەرژەوەندییەكانیان لـە رووی فراوانكردنـی ناوچـەیی و دابینكردنـی سەرچـاوەی سروشـتی زیاترەوە. ئەڵبەتە لەگـەڵ هەڵسـەنگاندنەكەیدا بـۆ ئـەو "میحـوەرە جـوگرافی"ە و ململانێـی نێـوان زلهێزەكان، ماكندەر نەخشەیەكی پێشكەش كردووە كە بە گرنگترین نەخشـە هـەژمار دەكرێـت كـەتا ئێستا پسپۆرێكی بواری جوگرافیا دایڕشتبێت.




١٩. تەوەری جوگرافیایی مێژوو

نەخشـەکە بـە بـەکارهێنانی پرۆجێکتـەری میرکـاتۆر، روسـیا و دوورگـەی گرینلانـدی گـەورە کردووەتەوە و لە بەرامبەریشدا بە رادەیەکی زۆر ئەفریقا و ئـەمریکای لاتینـی بچـووك نیشـان داوە. بۆیە سەرنجی بینەران یەکسەر بۆ لای چەقی نەخشەکە دەچێت،کە لەم حاڵەتەدا بریتیە لەو ناوچەی کـە پێی دەوترێت ناوچەی میحوەر. پارچەکانی تـری رووی زەویـیش بـە سـێ شـێواز لەسـەر نەخشـەکە دەردەکەون: ناوچەی ناوەوە یان پەراوێز، ناوچەی دەرەکی یان دابـڕاو، و ناوچـەی بیابـان کـە بـاکووری ئەفریقا و نیمچە دوورگەی عەرەب دەگرێتەوە. بەڵام کیشوەری بەستەڵەکی باشوور بە هـیچ شـێوەیەك لەسەر نەخشەکە دەرناکەوێت.

هەرچەندە مشت و مڕی زۆر دەربارەی کاریگەریی رۆشنبیرانەو نەخشەسازییانەی ماکندەر لەسـەر بڕیار بەدەستانی سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیا ئەنجام دەدرا، بەڵام نەوەی دواتر لـە زانایـانی ئـەڵمانیاش کە لە لای خۆیانەوە بە پەرۆش بوون بـۆ تێگەیشـتن لـە سەرچـاوەکانی هێـزی جیهـانی، ئـەم خەونـە جیهانییەی "ماکندەر"یان بە پڕ بایەخ هەڵدەسەنگاند. بـەڵام نـاوبراو زێـدەڕۆیی لـە هەڵسـەنگاندنی کاریگەریی ستراتیجی ناوچەکانی ناوەڕاستی رووسیا کردووە، و لەبەرامبەریشدا بایەخێکی ئەوتۆی بـە دەسەڵاتی روو لە زیادبوونی ئەمریکا لە جیهانـدا نـەداوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا نەخشـە و نووسـینەکانی کاریگەر بوون لە دروستکردنی کولتووری جـوگرافی باڵادەسـتی وڵات و ئیمپراتۆرییـەتێك کـە بـەرەو

سەردەمێکی ناجێگیر هەنگاوی دەنا. بەلاّم یەکێك لە خەسڵەتە نەخوازراوەکان لـە نووسـینەکانیدا بـە تایبەتییش بۆ سەدەی (٢١ )، بریتی بوو لە ئاماژەکردنی بـەردەوامی بـە بابـەتی نـەژاد و "خـوێنی ئینگلیزی" لە چوارچێوەی هەوڵەکانی بۆ روونکردنەوەی ئەوەی کە بۆچـی چـەند گرووپێکـی نـەژادیی دیاریکراو باشتر لە گرووپ و میللەتەکانی تر دەتوانن جیهان بەڕێوە ببەن. هەروەها لە بابەتەکەیدا کـە لە سـاڵی ١٩٠٤ پێشکەشـی کۆمەڵـەی جوگرافیناسـانی پادشـاهیی کـرد، "رۆژهـەڵات" ی وەکـو هەرەشـەیەکی بـەردەوام و ناوچـەیەکی نـاجێگیر نـاوزەد کـردووە کـە لـە رووی نەژادییـەوە توانـای ئیدارەکردنی حکومەتێکی ئاشیخوازی نییە. بەلاّم کۆکردنـەوەی نـەژاد لەگـەڵ شارسـتانییەتدا تـەنها تایبەت نەبووە بە ماکندەر، چونکە سەرۆکەکانی ئەمریکا وەکـو" تیـۆدۆر رۆزفلـت" یـش هەمیشـە باسیان لە رۆڵی ئەو ولاّتە دەکرد لە بەشارستانی کردنی نەتەوەکانی تر لە ئـەمریکای لاتـین و ناوچـەی زەریای هێمن.

## ئیسیا باومان"و کۆنفرانسی ئاشتی لە ساڵی ١٩١٩

دوای ماوەیەکی کەم لە بەشداری کردنی ئەمریکا لە جـەنگی یەکـەمی جیهـانی، سـەرۆکی ئـەو ولاّتە "وودرۆ وڵسون" لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی پێکهێنـا. لـە ئەنجامـدا کۆلۆنیـڵ "هـاوس" و ١٥٠ ئەندامی دیکـەی لیژنەکـە( ٢٠٠٠ ) راپـۆرت و( ١٢٠٠ ) نەخشـەیان دەربـارەی سـنوورە ئـەتنی و سیاسی و مێژوویەکانی ئەوروپا پێشکەش کرد. جوگرافیناس "ئیسیا باومان" یش کە دواتر بـوو بـە سەرۆکی زانکۆی هۆپکن، وەکو یەکێك لە ئەندامــە سـەرەکییەکانی لیژنەکـە، رۆڵـی چـالاکانەی لـە دروستکردنی بەشێك لە نەخشـەکان بینـی . هـەروەها بەشـدارێکی کاریگـەریش بـوو لـە دارشـتنی شێوازێکی تازەی جیۆپـۆلیتیکی، بـە ئامـانجی هوشـیار کردنـەوەی گـەلی ئـەمریکا سـەبارەت بـە وردەکارییەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیی و مانا و وانەکانی ئەو جەنگە بۆ ئـەوروپا و جیهـانیش بـە گشتی. لە ساڵی ١٩١٥دا باومان وەکو بەڕێوەبەری کۆمەڵەی جوگرافیناسـانی ئـەمریکا دەستنیشـان کرا و بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ لەو پۆستەدا مایەوە. وەکـو ئەنـدامی لیژنـەی لێکۆڵینەوەکـەش، هەمیشـە کاری بۆ ئەوە دەکرد کە کۆمەڵەکەی لە پێشەنگی هەوڵەکان بێت بۆ ئاگـادار کردنـەوەی ئیـدارە یـەك لەدوای یەکەکانی ئەمریکا دەربارەی پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی ئەوروپا لە دوای جەنگە گەورەکە.

**ئەڵمانیای نازی و نەخشە**

لە دوای کۆنفرانسی ئاشتی لە ساڵی ١٩١٩، جوگرافیناسان و نەخشە کێشەرانی ئەڵمانیا دەستیان دایە دروستکردنی نەخشەی تازە، تێیاندا ئەو هەڕەشەو مەترسییانەیان روون دەکردەوە کە سنووره تازەکان، ئەوانەی لە کۆنفرانسی ڤێرسای بڕیاریان لەسەر درابوو، بۆ ئەڵمانیا دروستی دەکەن.نەخشەکان بە هۆی نیشانەو رەنگ و پێوەرەکانیانەوە سەرنجی ئەڵمانی زمانەکانی دەرەوەی سنووری دەوڵەتی ئەڵمانیای کاتی شەڕیان بۆ لای ئەو "سنووره خوێناویانە" رادەکێشا کە ببونە هەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندیە ئابوورییەکانی ئەڵمانیا. جوگرافیناسی ئەڵمانی "ئەلبریخت پینك" یش لە لای خۆیەوە چەمکی "ڤۆلکس و کولتوربۆدین" ی داهێنا کە ناسنامەی نەتەوەیی ئەڵمانیا لەسەر بنەمای رووبەری کولتووری پێناسە دەکات. دیارە لە سایەی کاریگەریی ئیدارەی ئەڵمانیادا و بە پێچەوانەی دراوسێ سلاڤیکییەکانی، سەرجەم پارچەکانی ئەو ولاتە بە باشی رێکخرابوون و ئیدارە دەکران. لە ئەنجامیشدا، ئەڵمانیای تازە سەرجەم خاکی ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانیای بەدەستەوە دەمایەوە، بێجگە لە نەمسا و بەشێك لە چیکۆسلۆڤاکیاش. ئەم نەخشانە کە باسیان لە "ئەڵمانیایەکی گەورەتر" دەکرد، بە زۆری لە رێگای رۆژنامەو گۆڤار و پۆستەر و پۆستکارد وئەتڵەسی قوتابخانەکانەوە پەخش و بڵاو دەکرانەوە. ئەڵبەتە لە رووی دروستکردنی نەخشەوە، کۆماری وەیمەر زۆر کاریگەرتر بوو لە دروستکردنی کولتووری نەخشەیی ئەڵمانیای نێوانشەڕەکان.

((کۆماری وەیمەر ئەو ناوە بوو کە مێژوونوسان لە ساڵی ١٩١٩ بۆ کۆماری فیدراڵی و دیموکراتی ئەڵمانیا بەکاریان هێنا بۆ ئەوەی جێگای ئەڵمانیای ئیمپراتۆری بگرێتەوە و بە ناوی شاری (وەیمەر) ەوە ناونراوە کە بۆ یەکەم جار ئەنجومەنی دەستووری تێدا کۆبووەوە- وەرگێڕ))

بە هاتنی سەرەتای سالأنی چلەکان کە تێیدا هەڵمەتی داگیرکاری ئەڵمانیا بۆ دەرەوەی ئەو ناوچانەی کە بە "ئەڵمانیایەکی گەورەتر" ناوزەد کرابوون پەرەی سەند، ئیتر ئەو نەخشانەی کە پێشتر "پینك" بیرۆکەکانی دانابوون، لە ئەڵمانیا قەدەغە کران.

باومان بۆ ماوەی یەك ساڵ بەرپرسی لیژنەی لێکۆڵینەوەکە بوو، دوای ئەوەش رۆڵی کاریگەری دەبینی لە دڵنیا بوون لە پەیوەندی نێوان دروستکەرانی نەخشەو بەرپرسە بالأکانیان لە کۆنفرانسی ئاشتی. دواتر بە فەرمی وەکو "پسپۆری سەرەکی هەرێمایەتی" دامەزرا و بڕیاریش بوو لیژنەکەی خشتە و نەخشەگەلێك دروست بکات کە یارمەتی شاندی ئەمریکا بدات تا بتوانن لە چوارچێوەی گفتوگۆکانیاندا، هاوتا ئەوروپییەکانیان دەربارەی چەند چارەسەرێکی تایبەتی هەرێمایەتی و ناوچەیی بۆ رۆژهەلأت و ناوەڕاستی ئەوروپا رازی بکەن. لەم ئەرکەدا چەندین پسپۆری ناوخۆیی هاوکاری باومانیان دەکرد کە بەرپرس بوون لە سنوورەکانی نێوان فەرەنسا و ئەڵمانیا، پۆڵەندا و رووسیا،

نەمسا و هەنگاریا، ناوچەی بەلقان و چەند ناوچەیەکی تری وەکو رۆژهەلاتی دوور. نەخشەکانی ئەو پسپۆرانەش زۆر بە گرنگ هەژمار دەکران لە وێناکردنی سنوورە جیۆپۆلیتیکییەکانی ئەوروپا لە دوای شکستی ئیمپراتۆرییەتی ئەلمانیا و دارمانی هەردوو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و نەمسا - هەنگاریا.




20. Europe in 1914 and 1919

٢٠. ئەوروپا لە سالانی ١٩١٤ و ١٩١٩

بە گشتی، زانیاری جوگرافی وەکو کەرەستەیەکی گرنگی هێز و دەسەلات هەژمار دەکرێت. لەم بارەیەوە باومان بەم شێوەیە باس لە گرنگی ئەو زانیارییە لە کاتی کۆبوونەوەکانی تایبەت بە کۆنفرانسی ئاشتی لە فەرەنسا لە سالی ١٩١٩ بۆ هاورێیەکی خۆی دەکات:

کاتێ پسپۆرانی نەتەوەکانی تر بە بیرۆکەی تیۆروتەسەلەوە هاتن، ئەو زانیارییە پێویستەیان پێ نەبوو کە بە شێوەیەکی زانستی کۆ کرابێتەوە. تەنها شاندی ئەمریکا ئەو جۆرە زانیارییەی لابوو و پێشبینیمان دەکرد کە ئەو خالە لە چوارچێوەی دانوستانەکاندا لە بەرژوەندیمان بێت،تەنانەت بەرامبەر فەرەنسییەکانیش کە لە پایتەختەکەیاندا بڕیار لەسەر چارەنووسی ئەوروپاو رۆژهەلاتی نزیك دەدرا.

بەلای باومان و لیژنەی لێکۆلینەوەوە، دروستکردن و ناردنی نەخشەو داتاکانی تر لە (نیویۆرك) ەوە بۆ پاریس گرنك و ستراتیجی بوون بۆ دلنیا بوون لەوەی کە پرنسیپەکانی مافی چارەی خۆنوسینی نەتەوەیی لە ناو ئەوروپا بە پێی داتای جوگرافی بڕیاریان لێ بدرێت. لە کۆنفرانسەکەدا زیاتر لە ٢٠ گەلی ئەورووپی دەستنیشان کران کە مافی نەتەوە بوونیان تێدایە. بۆیە کاری لیژنەکە پڕ بایەخ بوو لە

گواستنەوەی خاوەنداریێتی ناوچەکان و گـۆڕینی سـنوورە نیشـتمانییەکان لـە دوای جـەنگی یەکـەمی جیهانیی.

لە کاتی گەیشتنی بە پاریس، باومان ئاشکرای کرد کـە شـاندە ئەوروپییـەکان زۆر نـاکۆك بـوون دەربارەی چارەنووسی ئەو شارانەی بەندەریان تێدا یـە وەکـو شـاری "دانـزیگ"، هـەروەها دەربـارەی جوگرافیای ناوچەکانی باشووری رۆژهەلاتی ئەوروپا. دانوستانکارە ئەمریکییەکانیش لە لای خۆیانـەوە لە دیمەنێکدا کە هاوشێوەی ناکۆکی ئەم دواییەی نێوان ئەمریکا و ئەوروپا بوو لەسەر شـەڕی جیهـانی لە دژی تیرۆر، زۆر نائومێد بوون، چونکە خەونەکەیان بـۆ بـەدی هێنـانی لیبرالێزمێکـی نێودەوڵـەتی نەدەگونجا لە گەڵ ئەوروپادا کە لەسەر بنـەمای سـنووری هەرێمایـەتی و خاوەنـداریێتی چـەند پارچـە زەوییەکی دیاریکراو جێگیر بووە. بەلاّم وەکو ئەوەی "نیلّ سمس" ی بەناوبانگترین نوسەری ژیاننامـەی باومان ئاماژەی پیّ دەکـات: چـەمکی پێکـدادانی خەونـە جوگرافییـەکان دروسـت نییـە —چـونکە دانوستانکارە ئەمریکییەکان ئارەزوویان دەکرد کە سنوورە سیاسییەکانی ئەوروپا جێگیر بن بۆ ئـەوەی ئەوانیش بتوانن دەست بە ئەرکی راستەقینەو گرنگی خۆیان بکەن کە بریتییە لە دروستکردنی بـازاڕی بازرگانیی ئازاد. بەلاّم لە هەمان کاتـدا بـە لایانـەوە گـرنگ بـوو کـە ئیمپراتۆرییـەتی هەرێمایـەتی ئەمریکا لە ئەمریکای لاتین و زەریای هێمن تووشی تەحەدای هێزە کۆلۆنیالّییەکانی ئەوروپا نەبن.



٢١. کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس

باومان کتێبێکی بە ناونیشانی "جیهانی تازە" لە سـالّی ١٩٢١ بـلاّو کـردەوەو بەشداریشـی لـە دامەزراندنی کۆمەلّەیەك بە نـاوی "ئەنجومـەنی پەیوەندییـەکانی دەرەوە" کـرد . گۆڤـاری تایبـەتی

کۆمەڵەکەش بە ناوی "فۆریەن ئەفەیەرز"، بوو بە سەرچاوەی سەرەکی بۆ پسپۆڕانی بـواری سیاسـەتی دەرەوە کە تێیدا لێکۆڵینەوە لەسەر پرسەکانی ئەمریکا لـە جیهانـدا بکـەن. باومـان بـە پێچـەوانەی کەسایەتییە دوورەپەرێزەکانەوە، بـڕوای وابـوو کـە پێویسـتە ئـەمریکا ڕۆڵـی سـەرەکی ببینێـت لـە گەشەپێدان و پێشخستنی ئابووری جیهانـدا. وەکـو ئـەوەی لـە نوسـینەکانی دواتریـدا دەردەکـەوت، بۆچوون و نەخشەکانی باومان بۆ ئەمریکا وەکو هێزێکی جیهانی، زیاتر پێداگیری لەسەر ئـەوە دەکـرد کە چۆن هێزی ئەمریکا لە سەر حسابی هێزە کۆلۆنیالییەکانی ئەوروپا بەکار بهێنرێـت. بـە بۆچـوونی باومان، ئەگەر هێز بە شێوەیەکی کاریگەر لە ناوچەکاندا بەکار بهێنرێت، ئـەوا پێویسـتە ئـەو بـەکار بردنە پابەند بێت بە بازاڕی ئازادەوە، هەروەها لە ڕێگای دامـەزراوە نێودەوڵەتییەکانیشـەوە بێـت بـۆ ئەوەی نەبێتە کەرەستەیەك بە دەست ئیمپریالیزمی ئەمریکییەوە. دواتریش باومان ڕێنمـایی زانسـتی زۆر بەسوودی پێشکەش بە ئیدارەی سەرۆکی ئەو کاتـەی ئـەمریکا "فـرانکلین ڕۆزفلـت" دەکـرد لـە سەرەتای سالآنی چلەکاندا کە بووە هۆی پتەو کردنی زیاتری پێگەی ئەو وڵاتە لـە جیهانـدا. بارەگـای کۆمەڵەکەش لە نیویۆرك بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کە چۆن جوگرافیناسانی وەکو باومان توانییان پـەرە بە بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەمریکا بدەن.

## بۆچی شەڕ دەکەین؟ فرانك کاپرا و هێرشی نازی (١٩٤٢)

دەرهێنەری ئیتالّی- ئەمریکی " فرانك کاپرا" گەورەترین هاریکار بوو لە بەرهـەمهێنانی زنجـیرە فیلمی "بۆچی شەڕ دەکەین". زنجیرەکە کـە لەسـەر داوای حکومـەتی ئـەمریکا بەرهـەم هێنرابـوو، ئامانجی ئەوە بـوو کـە هۆکارەکـانی تێـوەگلانی ئـەمریکا لـە بەگـژدا چـوونەوەی دوژمنـەکانی لـە سەرانسەری جیهاندا بۆ خەڵکی ئەو وڵاتە ڕوون بکاتەوە. دواتریش وەکـو بەشـێك لـە پڕوپاگەنـدە بـۆ شەرعییەت دان بە بەشداری کردنی ئەمریکا لە جـەنگی دووەمـی جیهانـدا بـەکار دەهێنـرا. زنجـیرە فیلمەکە حەوت ئەڵقەی یەك کاتژمێریی بەم ناوانەی خوارەوە بەخۆوە دەگرێت: پێشـەکی بـۆ جـەنگ، هێرشی نازی، پەرتکە و سوودمەند بە، جەنگی بەریتانیا، جەنگی رووسیا (بەشـی ١ و ٢ )، جـەنگی چین، و جەنگ دێت بۆ ئەمریکا. دوا ئەڵقەش لە چەند ڕوویەکـەوە بـە گرنگترینیـان هـەژمار دەکـرا، چونکە ئەوەی ڕوون دەکردەوە کە بۆچی ئەمریکا ناتوانێت خۆی لە پرسە جیهانییەکان بەدوور بگرێت.

سەبارەت بە دیمەنە بینراوەکانی زنجیرەکەش، ئەڵقەی "هێرشی نـازی" لـە ڕووی نەخشەسـازییەوە بە بەرچاوترینیان دادەنرێت،و تێیدا پلانەکانی هتلەر بـۆ کـۆنترۆڵکردنی جیهـان لـە ڕێگـای ئامـاژەی

راستەوخۆ بە نەخشـەکانی ماکنـدەر و پرنسـیپە جوگرافییـە باوەکانـەوە بـەم شـێوەی خـوارەوە روون کراونەتەوە:

ئەوەی فەرمانڕەوایی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا بکات، کۆنترۆڵی "دڵی زەوی" دەکات.

ئەوەی فەرمانڕەوایی "دڵی زەوی" بکات، کۆنترۆڵی دوورگەکانی جیهان دەکات.

ئەوەی فەرمانڕەوایی دوورگەکانی جیهان بکات، کۆنترۆڵی جیهان دەکات.

زنجیرەکە بینەر ئاگادار دەکاتـەوە کـە پلانـە سـتراتیجییەکانی هتلـەر لەسـەر بنـەمای زانسـتی جیۆپۆلیتیکی داڕێژراون و رژێمی ئەڵمانیا بە پێچەوانەی نەتەوەکانی تـرەوە، زانیـاریی لەسـەر شـوێنە جوگرافییەکان و سەرچاوە سروشتییەکان کۆکردووەتەوە و هەڵسەنگاندنی پێویسـتی لـە هـەردوو رووی مرۆیی و فیزیکییەوە بۆ ئەنجام داوە. ئەڵبەتە لە روانگەی جیۆپۆلیتیکییـەوە، هتلـەر و هاوسـۆزەکانی بەوە وێنا دەکرێن کە سوورن لەسەر زیاد کردنی ناوچـەی زیـاتر بـۆ سـنووری وڵاتەکـەیان بـۆ ئـەوەی ئەڵمانیا لە کۆتاییدا خۆی بە خاوەنی سەرجەم " بیابانی جیهانی " ئەفریقا و ئاسیا و ئەورووپا بزانێـت. بە رەچاو کردنی سەرچاوە دیمۆگرافی و فیزیکییەکانی ئەو " بیابانی جیهانی " ەش، فیلمەکە دووپـاتی دەکاتەوە کە بابەتی کۆنترۆڵکردنی بەشەکانی تری جیهان بە هەردوو کیشوەری ئەمریکاشەوە لە لایـەن ئەڵمانیاوە، تەنها پێویستی بە کاتەو هیچی تر. دوا دیمەنی ئەو بەشەی فیلمەکەش، جیهـان وا نیشـان دەدات کە ئارمی نازی باڵی بەسەریدا کێشاوە.




٢٢. دڵی زەوی کە لە ئەڵقەی "هێرشی نازی" (١٩٤٢) وەرگیراوە

زنجیرە فیلمی کاپرا تـەنها یـەك نموونەیـە بـۆ چـۆنێتی کاریگـەربوونی بۆچـوونە جوگرافییـەکانی هاووڵاتیانی ئەمریکا بەو ململانێ جیهانییەی کە بە هۆیەوە سەربازە ئەمریکییەکان تێکـەڵی جـەنگ

بوون لە ئەوروپا و ئەفریقا و ئاسیاو ناوچەی زەریای هێمن. هاوکات فیلمساز و ڕۆژنامەنووس و نەخشەکێشی دیکەی وەکو جۆن هەستون، جۆن فۆرد، و چارلس ئەونز لە ڕۆژنامەی "لۆس ئەنجلوس تایمز"، ڕۆڵی خۆیان دەبینی لە هاندان بۆ بەکارهێنانی نەخشەو کەرەستەکانی هاوشێوەی بۆ هەمان مەبەست. لە بەر ئەوەی "ڕۆبەرت شتراوس هیوپ" یش بەردەوام دووپاتی دەکردەوە کە هەموو جۆرەکانی نەخشە هۆکاری گرنگن بۆ بلاوکردنەوەی زانیارییە جیۆپۆلیتیکییەکان، ئەو نەخشە تازانە دروست کران تا هۆکاری شەرکردنی ئەمریکا لە چەند شوێنێکی تایبەتیی وەکو دوورگەی "گوام" بۆ خوێنەران روون بکەنەوە.

لە کاتی خودی شەڕەکەشدا، سوود لە جوگرافیناسە پرۆفیشناڵەکانی ئەمریکا و بەریتانیا وەردەگیرا. بۆ نمونە لە بەریتانیا، جوگرافیناسان بەشدارییان دەکرد لە دروستکردنی نەخشەو شیکردنەوەی وێنەیی، و هەروەها ئامادەکردنی بەرنامەی مەشق و ڕێنمایی بۆ یەکە سەربازییەکان. لەو چوارچێوەیەدا، جوگرافیناس "بریان ڕۆبەرتس" ڕاسپێردرابوو کە ڕێنمایی جوگرافی دەربارەی ئایسلەندا و جەمسەری باکوور بۆ هەواڵگری دەریایی ئامادە بکات. بێگومان ئەو کەسایەتییە ئەکادیمییانە لە رووی دابینکردنی کەرەستەی پێویست بۆ بابەتەکانیان گرفتیان نەبوو، چونکە بە هاتنی ساڵی ١٩٤٢، "یەکەی لێکۆڵینەوەی ناوەندی" ملیۆنەها وێنەی کیشوەری ئەوروپای کۆکردبووەوە کە لە لایەن هێزی ئاسمانی پادشاهی بەریتانیاوە گیرابوون. ئەم وێنە ئاسمانییانەش بناغەیەکی درووستیان دابین دەکرد بۆ دارشتنی وێنەی شوێن و ناوچە ستراتیجییەکانی ئەوروپا کە گرنگ بوون بۆ داڕشتنی پلانی سەربازیی بۆ ئەوەی سوپای ئەو وڵاتە بڕیار بدات کە چی شوێنێك بکاتە ئامانجی بۆمب و هێرشەکانی.

ئەم نەخشانە، چی ئەوانەی بە شێوەی فیلم نیشان دەدران و یان ئەوانەی لەسەر کاغەز دروست کرابوون، کاریگەری دوورمەودایان هەبوو لەسەر بۆچوونی جوگرافی ئینگلیز و ئەمریکییەکان،و هەروەها پاشخانێکی بینراوی بەسوودیش بوون بۆ پسپۆرانی دواتری بواری نەخشە تا لە ڕێگایانەوە ئەو تەحەدایانەی شەڕی سارد شی بکەنەوە کە لە دوای ساڵی ١٩٤٥ ڕووبەڕووی ئەمریکا و ئەوروپای ڕۆژئاوا دەبوونەوە. سەرۆکی ئەمریکا فرانکلین ڕۆزفلت لە پێشەوەی ڕیزی ئەو کەسانە بوو کە گۆڕانکارییە نەخشەییەکانیان پێ ڕادەگەیەنرا کاتێك نەخشەیەکی گەورەی جیهانیان وەکو دیاری جەژنی لەدایك بوونی مەسیح لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٢ پێشکەش کرد. بێگومان دەستپێکردنی شەڕی سارد و تەحەداکانی یەکێتی سۆڤێت، گرنگی زیاتری بەخشیە ناوچەی ئەلئەسکا و بەشی سەرەوەی جەمسەری باکوور، هەر بۆیە نەخشەی تازە هاتە ئاراوە کە پێداگیریی لەسەر

نزیکیی جوگرافی و مەترسی یەکێتی سۆڤیێت دەکردەوە، تا جێگای نەخشە کۆنەکان بگرنەوە کە لەسەر بنەمای هەرەشەکانی ژاپۆن لە دوای هێرشی ئەو ولاتە بۆ سەر بەندەری پیرڵ هاربەر لە کانوونی یەکەمی ١٩٤١ دروست کرابوون.

## زانستی نەخشەسازی، جیۆپۆلیتیك، و شەڕی سارد

مێژوونووسی سیاسی "ئالان هێنریکسون" ئاماژە بەوە دەکات کە ماوەی دوای ساڵی ١٩٤٥ گۆڕانکارییەکی لە بۆچوونی جوگرافی گشتیدا بە خۆوە بینیوە، لە بۆچوونێکی ناوچەیی تەسکەوە بۆ ئاسۆیەکی تازەی جیهانی. بەلاّم سەرکەوتنی ساڵی ١٩٤٥ جەماوەری لەو ئاسۆ تازەیە دڵنیا نەکردەوە. هۆکارەکەش سادەیە: ڕووداوەکانی شەڕ لە ناوچەی زەریای هێمن و سەرانسەری کیشوەری ئەورووپا سەلماندیان کە ئەمریکا ناتوانێت چیتر ئاسوودە بێت تەنها لەبەر ئەوەی کە بە هەزارەها میل لە ئاسیا و ئەورووپاوە دوورە. لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیش، نەخشەساز و جوگرافیناسانی وەکو ئەلکسەندەر دو سیڤیرسکی و ریچارد ئیدز هاریسون بیرۆکەی تازەیان هێنایە ئاراوە بۆ دووپاتکردنەوەی ئەو ڕاستییەی کە ئەمریکا زۆر نزیکە لە نەیارە سەرەکییەکەی شەڕی سارد، واتا یەکێتی سۆڤیێتی جاران. هاریسون کە ڕاوێژی تەکنیکی دەدایە وەزارەتی دەرەوەو دەزگای خزمەتگوزاری ستراتیجی (کە دواتر بوو بە CIA)، کاریگەری زۆری هەبوو لە هێنانەدی ئەو بیرۆکەیەی کە پێویستە ئەمریکییەکان خۆیان لەگەڵ شێوە بیرکردنەوەیەکی جوگرافی جیاواز لەوەی پێشوو بگونجێنن. ئەم کاریگەرییەی (هاریسون) لە کاتێکدا بوو کە ئەمریکا چووبوە ناو جەنگی یەکەمی جیهانییەوەو دواتریش بەشداری لە کۆنفرانسی ئاشتیی ساڵی ١٩١٩دا کردبوو.

بەلاّم ئەم بیرۆکە جەمسەرییە تەنها یەك توخم بوو لە جەنگە جوگرافییەکە. ئامانجی هاریسون، کە بە جوگرافیناسی جیهانیی ناوبانگی دەرکردبوو،بریتی بوو لە هوشیارکردنەوەی جەماوەری ئەمریکی سەبارەت بە بنەما جوگرافییە سادەکان: گۆی زەوی خڕە و بەشەکانی بە تۆکمەیی پێکەوە بەستراون. هەرچەندە ئەو کاتە هێشتا زاراوەی جیهانگەرایی دانەهێنرابوو، بەلاّم دەکرێ ئەو بابەت و کتێبانەی کە ڕاستەوخۆ لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی لە ئەمریکا بلاّو دەکرانەوە، وەکو هەوڵێك بۆ چاندنی ئەو پرنسیپانە لە هزری هاوولاّتیاندا هەژمار بکرێن. و لە ئەنجامی دەرکەوتنی پرۆجیکتەری نەخشەسازی بەرچاو وەکو پرۆجیکتەری میرکاتۆ، نەوەی تازەی نەخشەسازان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە زۆربەی هاوولاّتییە ئەمریکییەکان وا دەزانن زەوی پانە نەك خڕ. لەولاشەوە پێویست بوو هزری ستراتیجی ئەمریکا ڕوو لە باکوور بکات و بایەخی زیاتر بە "دەچ هاربەر" بدات لە

ئەلئەسکا نەك "پیرڵ هاربەر" لە هاوای. بە بۆچوونی هاریسون و لایەنگرەکانی، چارەسەرەکە لەوەدایە کە تۆپی گۆی زەوی لە جیاتی نەخشە بەکار بهێنرێت،چونکە لە ڕێگای ئەو تۆپانەوە دووری و نزیکی نێوان ناوچەو کیشوەرەکان باشتر دەردەکەون.

بێگومان بەکارهێنانی ئەو وێنانەی لە ئاسمانەوە دەگیرێن شێوازێکی تازەی بیرکردنەوەیان لە جیهاندا هێنایە ئاراوە. ئەم شێوازە تەنها پێداگیری لەسەر خەسڵەتی گشتگیری زەوی ناکات،بەڵکو ڕێگا خۆش دەکات بۆ پێوانە کردنی دوورییەکان لە ڕێگای ئاماژەکردن بە ماوەی فڕین بە فڕۆکە لە نێوان ئەو شوێنانەدا. بۆچوونی جەمسەرییش کە نەخشەسازانی وەکو هاریسون بەکاریان دەهێنا، زیاتر ئەم نزیکبوونەوەی کات و شوێنانەیان لە نێوان ناوچەو وڵاتەکاندا دووپات دەکردەوە. گرنگیی گەورەو ستراتیجیی جەمسەری باکوریش خاڵێکی تری جێی ناکۆکی بوو کە ڕۆڵی دەگێڕا لە توندبوونی هەرچی زیاتری ململانێکانی شەڕی سارد. لەم ڕووەوە پرۆجیکتەری تازەی هاودووری (متساوي البعد) بە سوودبەخش دادەنرا، چونکە بە بەردەوامی وێنەی جیهانیان پیشان دەدا و هاوکات دووری نێوان شوێنەکانیان وردتر دەردەخست. بەڵام دواتر پرۆجیکتەری جەمسەریی لە شێوەی ئەوەی هاریسون، لە لایەن دەسەڵاتدارانی سوپاوە بۆ زانینی مەودای مووشەکەکان و فڕۆکە بۆمب هاوێژەکان بەکار دەهێنرا. دوا ئەنجامی دوورکەوتنەوەش لە پرۆجیکتەری میرکاتۆر ئەوە بوو کە کەسایەتییە سیاسییە ئەمریکییەکان و هاوتا سۆڤێتییەکانیان بەوە قایل بکرێن کە کیشوەری بەستەڵەکی باکوور وەکو سنوورێکی جیۆپۆلیتیکی نێوان هەردوو ئەمریکا لە لایەك و ئاسیا و ئەوروپا لە لایەکی ترەوە هەژمار بکەن.

سەرکردەی هێزی ئاسمانی سوپای ئەمریکا جەنەراڵ ئارنۆڵد لە ساڵی ١٩٤٦دا و لە دووتوێی بابەتێکیدا لە گۆڤاری "ناشاڵ جوگرافیك" دەربارەی گرنگی ناوچەی باکوور، دەنوسێت: "لەوانەیە هێرشێکی لە ناکاو لە بنمیچی زەوییەوە دەست پێ بکات، ئەگەر نەبینە خاوەن ژمارەیەك پێگەی ئاسمانی لە چواردەوری ئەو ناوچەیە". دیارە دانانی هێڵی "هوشیارکردنەوەی خێرای دووری" لە ناوچەی بەستەڵەکی باکوور یەکێك بوو لە بەرچاوترین نیشانەکانی گرنگی دان بەو لایەنە،چونکە هێزی سەربازیی ئەمریکا بەو هۆیەوە زنجیرەیەك وێستگەی ڕاداری لە ناوچەکەدا دامەزراند کە لە باکووری ڕۆژئاوای ئەلئەسکاوە درێژ دەبوونەوە هەتاکو دوورترین ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کەنەدا بێجگە لە ئایسلەندا و گرینلاند.

((هوشیارکردنەوەی خێرای دووری: سیستمێکی رادار بوو کە ئەمریکا لەو ناوچانە دایمەزراند بۆ زانینی پێشوەختەی هەر دەستدرێژییەکی یەکێتی سۆڤێت و هوشیار کردنەوەی خێرا لە کاتی روودانی هەر هێرشێکی دەریایی یان زەمینی- وەرگێڕ))

لە سالأنی پەنجاکان بەسەرەوەش، ئەو هێڵە رادارییە بەکار دەهێنرا، بە هەماهەنگی لەگەڵ دوو هێڵی دیکەدا (ناوەڕاستی کەنەدا و پاینتری)، بۆ ئاشکراکردنی هەر مووشەکێك یان هەر فڕۆکەیەکی جەنگیی سۆڤێت کە نیازی هێرش کردنە سەر ئەمریکای هەبێت.




**23. A polar-centred map projection**

٢٣. نەخشەی بونیاتنراو لەسەر جەمسەرەکان

دیارە "هوشیارکردنەوەی خێرای دووری" وەکو بەردی بناغەی فەرمانەدەیی بەرگریی ئاسمانی باکووری ئەمریکا،( ٦٣ ) وێستگەی بەخۆوە دەگرت کە بە درێژایی زیاتر لە( ٦٠٠٠ ) میل درێژ ببوونەوە. ئەم هەنگاوە بەلای کەنەدییەکانەوە کە لە ناوچەکانی باکووری وڵاتەکەیان سەرپەرشتی

وێستگەکانیان دەکرد، سوودبەخش بوو بۆ پتەو کردنی سەربەخۆیی وڵاتەکەیان لە ناوچەی بەستەڵەکی باکوور، چونکە کەرەستەیەکی کاریگەر بوو بۆ پاراستنی سنوورەکانیان.

**شەڕی سارد و شێوەی زەوی**

لە سەردەمی شەڕی سارددا، زانایانی بواری نەخشە و جیۆدیتی (کورتترین هێڵ لە نێوان دوو خاڵ یان دوو ناوچەدا - وەرگێڕ) دووپاتی ئەوەیان دەکردەوە کە گرنگە سیستمێك دابنرێت بۆ دەستنیشانکردنی وردی شوێنەکان و دووریی نێوانیان، چونکە بە ئامانج گرتنی هەر ناوچەیەك لە رێگای مووشەکی بالیستی کیشوەربڕەوە پشت بەو جۆرە زانیارییە دەبەستێت. زاراوەی "شێوەی زەوی" یش بۆ وەسف کردنی پرۆسەی دەستنیشانکردنی وردی جوگرافیای راستەقینەی زەوی بەکار دێت. دیارە هاوکات لەگەڵ گرژیی روو لە زیادبوونی نێوان زلهێزەکاندا، دامەزراوەی سەربازیی ئەمریکا زیاتر بە پەرۆش بوو بۆ وەدەستهێنانی زانیاریی سیخوڕیی وردتر دەربارەی بلۆکی رۆژهەڵات. ئیتر سیستمی سەتەلایتی تازە لە جۆری "کۆرۆنا" کە لە ساڵی ١٩٥٨ هەڵدرا، بە کەرەستەی زۆر گرنگ دادەنران بۆ کۆکردنەوەی زانیاری سیخوڕیی جوگرافیایی. لە سەردەمی شەڕی ڤێتنامیشدا، وێنەکانی سەتەلایت بەکار دەهێنران بۆ دەستخستنی نەخشەی وردتری باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا. ئەو نەخشانەش سوودی زۆریان هەبوو بۆ فڕۆکەکانی ئەمریکا کە بۆمبارانی ئەو وڵاتەیان دەرکرد، هەرچەندە ئەو کردە سەربازییانە دەرەنجامی کارەسات ئامێزیشیان لەسەر خەڵکی سیڤیل بەجێ دەهێشت.

وادیارە ئەم هەستکردنە بە نزیکیی جوگرافی یەکێك بووە لە هۆکارەکانی نیگەران بوونی بەردەوامی ئەمریکا و روسیا بەرامبەر بە یەکتر. بۆ نموونە کاتێك کێشەی مووشەکەکانی کوبا لە سەرەتای ساڵانی شەستەکاندا سەری هەڵدا، ئەمریکا و روسیا توانای پەڕینەوەی ئاسانیان لە زەریای بەستەڵەکی باکوور هەبوو. تەکنەلۆجیای مووشەکییش لە لای خۆیەوە بە رادەیەك پێش کەوتبوو کە سەرۆك و سەرکردەکان و راوێژکارەکانیان باسیان لەوە دەکرد کە بۆ وەڵامدانەوەی هەر هێرشێکی بەرامبەر، پێویستییان بە تەنها چەند خولەکێك دەبێت نەك چەند کاتژمێرێك وەکو ئەوەی پێشتر باو بووە. دیارە ئەم چڕبوونەوە هزری و جوگرافییە کاریگەری لەسەر کولتووری گشتی تایبەت بە شەڕی ساردیش دروست کردبوو وەکو فیلم، بەرنامەی تەلەفزیۆن، رێکلام، و فیلمی کارتۆن کە بابەتی چڕبوونەوەو نزیك بوونەوەی جیهانییان بۆ بینەرو بیسەرەکانیان روون دەکردەوە. لەم چوارچێوەیەدا نوسەری ناودار "ئەلاستەیەر ماکلین" چەند فیلمێکی سەرنجڕاکێشی بەرهەم هێنا وەکو " زێبرای وێستگەی بەفر" و " شەوی بێ کۆتایی" کە باس لە چیرۆکی فێڵ لێکردن و مەترسی خستنە سەر جەمسەری باکوور دەکەن. بە تایبەتی فیلمی " زێبرای وێستگەی بەفر" کە دواتر کرایە فیلمی

هولیوود، ئەو هەستەی لە شاشەی سینەماکاندا دروستکرد کە چۆن کیشوەری بەستەڵەکی باکوور بووەتە هێڵی پێشەوەی پێکدادان لە نێوان زلهێزەکاندا.

**نەخشەکانی ئەمریکا و هەڕەشەی یەکێتی سۆڤێت**

بێگومان شەڕی ساردی نێوان ئەمریکا و یەکێتی سۆڤێت مەترسییەکی زۆری بۆ سەر هەردوولا دروست کردبوو. بۆ نموونە، یەکێتی سۆڤێت لە نەخشەکانی ئەمریکادا وەکو ورچێك وێنا دەکرا کە هەڕەشە لە دراوسێ ئەوروپییەکانی دەکات. بابەتێکی گۆڤاری "تایمز" یش کە لە مانگی ئاداری ساڵی ١٩٥٢دا بڵاو کرایەوە، یەکێتی سۆڤێتی بە جوڵەیەکی بەردەوامی وەکو جوڵەی خوێن بەرەو ئەوروپای رۆژئاوا وێنا کردووە کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی خوێناوی کردنی ئەو ناوچانەی پێیان دەگات. چەند نەخشەیەکی تریش هەبوون کە لە هەردوو گۆڤاری "ساتیردەی ئیڤینینگ پۆست" و "لایف" بلاو کرانەوە، یەکێتی سۆڤێتیان بە هەشت پێیەك شوبهاندووە کە دەتوانێت لە یەك کاتدا دەست لە کاروباری چەندین وڵات وەر بدات.

دوای چل ساڵیش لە ململانێی شەڕی سارد، بایەخی جوگرافیی ئەمریکا بە شێوەیەکی باش و دروست بە ئاراستەی باکوور گۆڕاوە. نەوە یەك لە دوای یەکەکانیش گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە زەریای بەستەڵەکی باکوور ئەمریکاو یەکێتی سۆڤێت لە یەك جیا دەکاتەوە، بەڵام ئەو زەریایە چیتر ناتوانێت ببێتە رێگری فیزیکی لە بەردەم بۆمبهاوێژ و ژێردەرياییە کیشوەربڕەکانی هەردوولادا. بە کۆتایی هاتنی شەڕی ساردیش لە ١٩٨٩-، ١٩٩٠ هێڵی "هوشیارکردنەوەی خێرای دووری" بوو بە مەترسییەکی سروشتی و بەرپرسیارێتییەکی سیاسی لە هەمان کاتدا. ئیستا گەشتیارە ئەمریکییەکان سوود لە بەفرشکێنەکانی پێشووی یەکێتی سۆڤێت وەردەگرن بۆ گەیشتن بە جەمسەری باکوور کە بە هۆی توانەوەی سەرپۆشە بەفرییەکانەوە، چیتر ئەستەم و دوورە دەست نییە. ئەم گۆڕانکارییە جوگرافییەش زۆر گرنگە، چونکە ئێستا کیشوەری بەستەڵەکی باکوور بووەتە هێڵی پێشەوە بۆ جۆرێکی جیاواز لە رووبەڕووبوونەوە کە بریتییە لە کەڵەکە بوونی پاشماوە پیشەسازییەکان و هەروەها کەرەستەی ژەنگاوی بووی سەردەمی شەڕی سارد.

بابەتێکی جوگرافیناسی ئەمریکی تۆماس بارنیت بە ناونیشانی "نەخشەی تازەی پەنتاگۆن" لە ئاداری ٢٠٠٣ لە گۆڤاری ئیسکوایەر بڵاو کرایەوە. بابەتەکە کە لە دوای هێرشەکانی ١١ی سیپتەمبەری ٢٠٠١ نوسراوە، نەخشەیەکی لەگەڵدایە کە نەخشەی شەڕی ساردی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا و تەنانەت نەخشەسازیی باکوور و باشووری دوای شەڕی ساردیش سەرەوژێر دەکات .بارنیت کە بە راوێژکاری پەنتاگۆن و ئەندامی فاکەڵتی لە کۆلیژی هێزی دەریایی ئەمریکا وەسف دەکرێت، نەخشەسازییە تازەکەی لەسەر دابەش کردنێکی جوگرافی سادەی نێوان ناوچەکانی کرۆك و بۆشایی

بونیات ناوە. دیارە گرنگیی هەوڵە نەخشەییەکانی بارنیت تەنها لـە کـاتی بـڵاو کردنەوەکەیـدا خـۆی نابینێتەوە، بەڵکو لەوەدایە کە بارنیـت و چـاودێرانی تـازە موحافـەزەکاری وەکـو رۆبـەرت کاگـان و فرنسـیس فۆکۆیامـا، بوونەتـە کەسـایەتی بەرچـاوی دوای شـەڕی سـارد و دوای هێرشـەکانی ١١ی سیپتەمبەری ٢٠٠١.

دیارە بە هەمان شێوەی کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی، سـەرەوژێر کردنـی نەخشەسـازییەکانی تایبەت بە شەڕی سارد بووە هۆی دروستبوونی تەنگژەیەکی جوگرافی لە ساڵانی نەوەتەکاندا. ئەڵبەتـە داڕشتنی نەخشەی ماوەی دوای شەڕی سـارد بـە شـەوق و زەوقێکـی گـەورەوە ئـەنجام دراوە،چـونکە رۆشـنبیران و خـاوەن ئایدیۆلۆجییـە رۆژئاواییـەکان گرەویـان لەسـەر گرنگیـی داڕمـانی رژێمـە کۆمۆنیستییەکان و دابەشبوونی یەکێتی سـۆڤێت دەکـرد. بـەلای رۆشـنبیرانی وابەسـتە بـە پـرۆژەی "سەدەی تازەی ئەمریکا" وە، پێشوازی کردنی ئیدارەی سەرۆك کلینتون لە جیهانگـەرایی و جیهـانی فرە جەمسەری هەڵەیەکی ترسناك بوو. بە بۆچوونی ئەوان، لە جێگـای ئـەوەی ئـەمریکا بچـێتە نـاو جیهانێکەوە کە تێیدا هەماهەنگی و شێوازەکانی حوکمی دوور لە ناوچەگەری باڵادەست بێـت، باشـتر وایـە ئامادەسـازی بکـات بـۆ بـەکاربردنی هـەژموونی سـەربازی و سیاسـی خـۆی بەمەبەسـتی کۆنترۆڵکردنی جیهانێك کە لە جاران زیاتر مەترسیدارە.

**نەخشە، وێنەی مانگی دەستکرد، و هەواڵگری**

ئەمریکا و سەدام حوسێن

رۆژنامەنوسی بـەریتانی "رۆبـەرت فسـك" چـیرۆکی بازرگـانێکی چـەکی ئـەڵمانی دەگێڕێتـەوە کـە باسـی کۆبوونەوەیەکی خۆی بۆ کردووە لەگەڵ چەند بەرپرسێکی پەنتاگۆن لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکاندا. باسـەکەی بـەم شێوەیە بووە:

بەڕێز فسك... لە سەرەتای شەڕەکەدا لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠، لە لایـەن پەنتاگۆنـەوە بانگهێشـت کرام. لەوێ تازەترین وێنەی هێڵـەکانی پێشـەوەی ئێرانییـەکانیان پێشـکەش کـردم کـە مانگـە دەسـتکردەکانی ئەمریکا تۆماریان کردبوون. ئیتر هەموو شتێك لە وێنەکاندا دەردەکەوت:

شوێنی چەك و تەقەمەنی ئێرانییەکان لە عەبادان و ئەودیوی خوڕەمشار، هێڵەکانی کەندەك (خنـدق) لـە لای رۆژهەڵاتی رووباری کارون، و دیواری تانکەکان- هەزارەها تانك- بە درێژایی سنوورەکانی باشـووری ئێـران بـەرەو کوردستان. هیچ سوپایەکیش چاوەڕوانی لـەوە زیـاتری لێ ناکرێـت. ئینجـا منـیش نەخشـەکانم هـەڵگرت و لـە واشنتونەوە بە فڕۆکە بەرەو فرانکفۆرت بەڕێ کەوتم، لەوێشەوە لە رێگای هێڵی ئاسمانی عێراقەوە راسـتەوخۆ بـەرەو بەغدا. عێراقییەکان بەم دیارییە زۆر زۆر سوپاسگوزار بوون.

بێگومان بە پێی نەخشەسازییەکەی بارنیت، جیهان پڕە لـە مەترسـی بـە تایبـەتییش کـە تـۆڕە تیرۆریستییەکان و حکومەتە شەڕخوازەکان دەتـوانن زیـان بـە نەخشـەی جیۆپـۆلیتیکی و سیسـتمی جیهانی بگەیەنن. هاوکات سەبارەت بەو وڵاتانەی کە لە ناو دڵی زەویـدان، دابڕانیـان لـە کۆمـەڵگای جیهانی بە مەترسیدار دەژمێردرێت. لە جیهانێکیشدا کە دابەش بووە لە نێوان "کرۆکێکی چـالاك" و "بۆشاییەکی پەرتەوازە"دا، نەخشە تازەکـانی بارنیـت، ئـەو وڵاتانـەی هەماهـەنگن لەگـەڵ بـەها و سیاسەتەکانی ئەمریکا لەو وڵاتانە جیا دەکاتەوە کە بە پێچەوانەی ئەو سیاسـەتانە کـار دەکـەن. لـە ئەنجامیشدا، ئەم دابەش کردنەی جیهان دەبێتە پاساو بـۆ بـەکار هێنـانی هێـزی ئـەمریکا لـە چـەند ناوچەیەکی تایبەتدا وەکو عێراق لە ئێستادا و لەوانەیە ئێرانیش لە ئایندەدا.



24. Barnett's functioning core and non-integrating gap

٢٤. نەخشەکەی بارنیت کە تێیدا کرۆکی کارا و بۆشایی یەکنەگرتووی زەوی دەردەکەون

بارنیت دەڵێت کە بۆچوونەکەی لەسەر ئەنجامگیرییەکی سـادەی جـوگرافی بـەم شـێوەی خـوارەوە بونیاتنراوە: پێویستە مەترسی لە ڕێگای شوێنەکەیەوە دەستنیشـان بکرێـت نـەك سەرچـاوەکەی. بـە واتایەکی تر، ئەم بۆچوونە جوگرافییە وەکو ئەوەی ماکنـدەر و ئـەوانی پێشـتر، بایـەخ بـە ناسـاندن و باسکردنی مەترسی لە سەر ئاستێکی جیهانی دەدات. بارنیت لە کتێبێکیدا کە وەکو بەدواداچوون بـۆ تیۆرەکەی دایناوە، دوو نەخشە بکار دێنێت بۆ ئەوەی زیاتر تیۆری دابەش بـوونی جیهـان بەسـەر دوو بەشدا بسەلمێنێـت. لە نەخشەی یەکەمدا کە لەگەڵ بابەتەکەی گۆڤاری ئیسـکوایەر بـەکاری هێنـاوە، جیهان بەسەر دوو پشکدا دابەش بووە و ناوچەیەکی شین بە درێژایی هێڵی ناوەڕاست دەدرەوشێتەوە تـا

ئاماژە بەو بۆشاییە مەترسیدارە بکات. ئەمانە پارچەکانی جیهانن کە وڵاتە شکستخواردووەکان بەڕێوەیان دەبەن و یان ئەو ناوچانەن کە وەکو پێویست تێکەڵ بە سیستمی جیهانی نەبوون.

نەخشەی دووەمیش وەسفی دەستتێوەردانی ئەمریکا لە سەردەمی دوای ساڵی ١٩٩٠ دەکات و چەند لایەنێکی جیاواز دەگرێتەوە وەکو: دەستتێوەردانی مرۆیی، شەڕ کردن، چۆڵکردن، و نیشتەجێ کردنی کاتی. بێگومان ئامانجی بنەڕەتیی هەردوو نەخشەکە ئەوەیە کە چۆنێتی تێوەگلانی بەردەوامی هێزەکانی ئەمریکا لەم بۆشاییە پەرت و بڵاوەدا روون بکاتەوە، هەرچەندە سوودێکی ستراتیجی گەورەشی بۆ ئەمریکا بەدواوە نییە. بارنیت لە لای خۆیەوە رەخنەی لە دەستتێوەردانەکانی ئەمریکا لە ساڵانی نەوەتەکاندا گرتووە، چونکە بە بۆچوونی ئەو، بە باشی هەڵسەنگاندن بۆ دەستتێوەردانەکان نەکراوە تا بزانن ئایا ئەو کردە سەربازییانە تا چەند لە بەرژەوەندی ئابووری و ئاسایشی ئەمریکادا بوون.

بەگشتی، وەکو ئەوەی سوزان رۆبەرتس و جوگرافیناسانی دیکە ئاماژەی پێ دەکەن، رووبەرە سیاسییە جیهانییەکان بەوە پێناسە دەکرێن کە ئایا بە باشی بەیەکەوە بەستراون (واتا رێکخراون) یان پەرتەوازەن (واتا شێواون). لەم جیهانەدا کە بە شێوەی کۆمپیوتەرە، ئەمریکا رۆڵی بەڕێوەبەر دەگێڕێت و جیهانگەرایی تازە- لیبراڵی بەرنامەی کۆمپیوتەرەکەیە. بە بۆچوونی بارنیت، پێویستە ستراتیجییەتی ئەمریکا لەسەر بنەمای زیادکردنی ئەندامێتی وڵاتانی کرۆك و دەستتێوەردانی یەکلاکەرەوە لە بۆشاییە پەرتەوازەکەدا بونیات نرابێت. بۆ ئەوەی ئەو ئەرکانەش جێبەجێ بکات، پێویستە ئامادە بێت بۆ ئەنجامدانی کردەی یەکلایەنە بە مەبەستی رێکخستنەوەی سیستمی جیهانی. لەبەر ئەوە پێویستی بە چەند رێسایەکی تازە دەبێت بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ بۆشاییە پەرتەوازەکەدا، بە تایبەتییش چونکە ئەو بۆشاییە ناچێتە ژێر باری سیستمی پەیڕەوکراو لە وڵاتانی ناوچەی کرۆك. بەڵام دامەزراوەکانی وەکو دادگای تاوانی نێودەوڵەتی هەوڵ بۆ سنووردار کردنی دەسەڵاتی ئەمریکا دەدەن بە تایبەتی لەو کاتەی کە ئەو وڵاتە پێویستی بە دەستێکی کراوە دەبێت بۆ سەپاندنی یاساو سەقامگیری لەو شوێنانەی جیهان کە دوور لە یاسا هەڵس و کەوت دەکەن. بێگومان ئەم بێزارییەی ئەمریکا لە هەڵس و کەوتی دادگای تاوانی نێودەوڵەتی بەهەمان شێوە نەتەوە یەکگرتووەکان و یاسای نێودەوڵەتییش دەگرێتەوە.

وادیارە لە سایەی ئەو بارودۆخەدا، رۆڵی ئیمپریالی ئەمریکا لە چوارچێوەی نەخشەو هەڵسەنگاندنە نێوخۆییەکاندا دەمێنێتەوەو قەتیس دەبێت. بۆچوونەکەی( بارنیت ) یش کە گوایا ئەمریکا خەریکی رێکخستنی شێوە سیستمێکی جیهانییە، دەبێتە مایەی سەرسوڕمان بۆ ئەوانەی

ڕەخنە لە ڕۆڵی ئەو وڵاتە لە بوارەکانی پێشخستنی دیموکراسی و ئازادی و بازاڕی ئازاد دەگرن، بە هۆی چالاکییەکانی ئەمریکا لە جیهانی سێیەم لە سەردەمی شەڕی سارد و دوای ئەو ماوەیەش. دیارە دووپاتکردنەوەی ئەوەی کە بن لادن و تۆڕی قاعیدە "دەرەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەو بۆشاییەن"، تەنها خوێندنەوەی چەند تاك و گروپێکە کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکای سەردەمی شەڕی سارد، بە تایبەتییش لە ڕووی پەیوەندی نێوان ئەمریکا و سعودیە و ئەمریکا و (پاکستان) ەوە کە بۆ زیاتر لە شەست ساڵ دەگەڕێتەوە. لەم چوارچێوەیەشدا نەخشەی نوێی پەنتاگۆن خەونێکی ترسناکەو ئەزموونی ئەمریکا لە عێراقی دوای ساڵی ٢٠٠٣ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پاڵپشتی کردنی دیموکراسی و بازاڕی ئازاد لەو وڵاتانەی ئەمریکا بە داگیرکار دەژمێرن، مەترسی گەورە دەخاتە سەر هێزی سەربازیی ئەمریکا.

## ئەنجام

وا دیارە بایەخدان بە نەخشە وەکو هۆکارێکی پەسەند بۆ تێگەیشتن لەوەی کە پێی دەوترێت ڕاستییەکانی سەر زەوی، لە ناوجەرگەی جیۆپۆلیتیکەوە هەڵدەقوڵێت. نوسەرانی بواری جیۆپۆلیتیکییش هاوکات لەگەڵ نەخشەسازاندا، نارەزایی بەرامبەر هەر بۆچوونێك دەردەبڕن کە نەخشەکانیان بە دەرچوون لە چوارچێوەو ئامانجی جوگرافی تۆمەتبار بکات. بێگومان نەخشە بە کەرەستەیەکی دەسەڵات دادەنرێت و حکومەتەکانیش لە دێر زەمانەوە درکیان بە گرنگی ئەو کەرەستەیە کردووە. لە ڕاستیدا زۆربەی وڵاتان و بەتایبەتییش ئەوانەی کێشەی ناوچە و سنووریان هەیە، هەمیشە کۆنترۆڵی پرۆسەی بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی نەخشەیان لە دەستی خۆیاندا هێشتووەتەوە. بۆ نموونە لە حاڵەتی هند و ئەرجەنتیندا، نەخشە لە لایەن دەسەڵاتی سەربازییەوە دادەنرێت. هەر نەخشەیەکیش کە دوورگەکانی فۆکلاند بە "ئیسلاس مالڤیناس" ناوزەد نەکات، ئەوا وەکو سووکایەتی کردنێکی فیدراڵی بە وڵاتی ئەرجەنتین دەژمێردرێت چونکە"ئیسلاس مالڤیناس" بە مانای ئەوە دێت کە دوورگەکان خاکی ئەرجەنتینن نەك بەریتانیا.

بە گشتی، دەکرێ ئەو نەخشانەی لەژێر سانسۆری حکومەتدان ببنە کلیلی کاریگەر بۆ هەر گۆڕانکارییەك کە لە بۆچوونی جیۆپۆلیتیکی وڵاتاندا ڕوو بدات. هەرچەندە ئەم بەشە زیاتر باس لە چەند نموونەیەکی کەمی ئینگلیزی و ئەمریکی دەکات دەربارەی گۆڕینی پرۆژەی نەخشەسازی لەم سەد ساڵەی دواییەدا، بەڵام تەقلیدێکی نەخشەسازی کۆنتر و دەوڵەمەندتر بەدی دەکرێت کە جیهانی ڕۆژئاواو ئیسلامی و کۆنفۆشیۆسیش دەگرێتەوە. بۆ نموونە لە وڵاتی چیندا، هەوڵی زۆر دەدرێت بۆ

هوشیار کردنەوەی خەڵك دەربارەی کیشوەری ئەفریقا وەکـو هاوبەشـێکی کۆمەڵایـەتی. ئەمــەش لــە کاتێکدا دێت کە بازرگانی و وەبەرهێنانی ئابووری لە نێوان هــەردوولادا رووی لــە زیــادبوون کــردووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، میدیا و کەرتی پەروەردەی ئەو وڵاتە پێداگری لەسەر بابەتی گرنگــی دیکــە لــە جوگرافیای سیاسی کۆماری خەڵکی چین دەکەن، وەکو کاریگــەریی داگیرکردنــی ژاپــۆن بــۆ کۆمــاری مەنشوریا لە ساڵەکانی بیستەکان و سییەکانی ســەدەی رابــردوودا، مــەحاڵیی دابــەش بــوونی چــین و تایوان و هەروەها پێویستی بەربەرکانیٚ کردنی هەژموونی ئەمریکا لە ئاسیا و ناوچەی زەریای هێمن.

# بەشی شەشەم
# جیۆپۆلیتیکی گشتی

ئایا بەم دواییە لە جۆری ئەم فیلمانەتان بینیوە: تێکشکانی ناڕاستەخۆ (٢٠٠١)، لە پشتەوەی هێڵەکانی دوژمنەوە (٢٠٠١)، فرمێسکەکانی خۆر (٢٠٠٣)، و یەکگرتوو ٩٣ (٢٠٠٥)؟ بە لای زۆربەی خەڵکەوە، فیلم بۆ سەیر کردن و چێژ لێ وەرگرتنە بە بێ ئەوەی بینەر بە وردەکارییەوە بیر لە هێڵە گشتییەکانی چیرۆکەکەو شوێنی رووداوەکان و یان گفتوگۆی نێوان کاراکتەرەکان بکاتەوەو شیکردنەوەیان بۆ ئەنجام بدات. هەر کەسێکیش بە قووڵی بیر لە ناوەڕۆکی چیرۆکی ئەو فیلمانە یان شێوەی نیشاندانیان بکاتەوە، ئەوا دەچێتە خانەی ئەو پسپۆرانەی کە مشت و مڕ لەسەر بابەتی "فیلم لە سەردەمی تیرۆر"دا دەکەن. بە بۆچوونی پسپۆری پەیوەندییەکانی دەرەوە "سینسیا ویبەر" یش، ئەو فیلمانە زۆر گرنگ و بەهادارن، چونکە دەکرێ بەکار بهێنرێن بۆ ئەوەی بزانرێت چۆن جیۆپۆلیتیکی پراکتیکیی لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا لە رێگای جیۆپۆلیتیکی گشتیی هۆلیۆدەوە نیشان دەدرێت. واتا ویبەر بە ئاشکرا پێداگیری لەسەر "وانەی ئەخلاقی" ناو فیلمەکان دەکات کە لە شێوەی چەند پرسیارێکدا خۆی دەبینێتەوە وەکو: چۆن هەڕەشە نیشان دەدرێت؟ ئایا دەکرێ هاوشێوە بۆ هێرشەکانی ١١ی سیپتەمبەر دروست بکرێت؟ ئەو وانە ئەخلاقییانە چین کە لە فیلمەکان وەریان دەگرین؟ ئەگەر فیلم رۆڵی هەبێت لە ناساندن و دروستکردنی ناسنامە تاکە کەسی و دەستەجەمعییەکانیشدا، کەواتە چی وانەیەکی سیاسی و جوگرافی لە رووداوی دڵتەزێنی وەکو ١١ی سیپتەمبەر وەردەگیرێت؟

بەلاّم هاوکات وێنا کردن و پراکتیزە کردنی جیۆپۆلیتیکی لە رێگای چەند هۆکارێکی راگەیاندنیشەوە وەکو تەلەفزیۆن، موسیقا، فیلمی کارتۆن، ئینتەرنێت، و رادیۆ ئەنجام دەدرێت. ئەم سەرچاوانەش بە لای زۆرینەی خەڵکەوە لە رووی دابینکردنی زانیاری دەربارەی رووداوەکانی ئێستا و رووداوی رابردوویش گرنگ و بایەخدارن. بەشێك لەو هۆکارە راگەیاندنانە،ئەگەر هەمووشیان نەبن، لەبەر شوێنی جوگرافی بلاّو کردنەوەیان و دەستگەیشتنی خەڵك بە تەکنەلۆجیا، بە ئاسانی بەردەست دەبن بە تایبەتییش لە ناوچەکانی وەکو ئەمریکای باکوور و ئەوروپا و چەند ناوچەیەك لە کیشوەری ئاسیا. بێگومان دەست گەیشتن بە ئینتەر نێت لە ناوچەکانی وەکو بیابانی ئەفریقا وەکو پێویست نییە، بەلاّم لە بەرامبەردا ئەمریکا گەورەترین سەرچاوەیە بۆ دابینکردنی زانیاری ئینتەرنێت لە جیهاندا. هەروەها بالاّدەستیی زمانی ئینگلیزی لەسەر ئاستی جیهان لەم رووەوە گرنگە و سەردەم و

زەمانەش رۆڵی خۆیان هەیە. بۆ نموونە، بەرنامە گاڵتەجارییەکەی "جۆن ستیوارتس" بە ناوی "دەیلی شۆ" بە لای زۆرێك لە لاوانی ئەمریکاوە بە گرنگترین سەرچاوەی هەواڵ دادەنرێت.

لەم بەشەدا، باس لە رۆڵ و کاریگەریی گەورەی وێناکردنی بابەتەکانی ناوچە، سەرچاوە، ناسنامە، و سیاسەت لە جیۆپۆلیتیکی گشتدا دەکەم، بێجگە لەو جموجوڵانەی کە لە میدیای جیهانیی لەم بارەیەوە بەرچاو دەکەون. بە مەبەستی کورتبڕییش، بایەخی زیاتر بە شێوازەکانی میدیا وەکو فیلم، تەلەفزیۆن، رادیۆ، و ئینتەرنێت دەدەم کە ئەمەش تا رادەیەك حەزو ئارەزووی خۆم لەم بارەیەوە دەردەخات. هەروەها بەشی هەرە زۆری گفتوگۆکان لە رێگای ئاماژە کردن بە میدیا ئینگلیزی زمانەکانی وەکو هۆلیوود، BBC World Service، و دەنگی ئەمریکا روون دەکرێنەوە نەك رۆژنامەی عەرەبی، سینەمای ئێرانی، تەلەفزیۆنی چینی، و یان رادیۆی مۆسکۆوە. هیواداریشم ئەم بەشە ببێتە هاندەر بۆ خوێنەرانی ئارەزوومەند تا سوود لە سەرچاوەی میدیایی بەشەکانی تری جیهان وەربگرن.

**رادیۆی فەردا و پەیوەندییەکانی نێوان ئێران و ئەمریکا**

رادیۆ فەردا کە لە کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٢ دامەزراوەو بارەگاکەی لە شاری (پراغ)ی پایتەختی کۆماری (چیك)دایە، لە لایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاوە سەرچاوەی دارایی بۆ دابین دەکرێت. رادیۆکە بە زمانی فارسی بەرنامەکانی پەخش دەکات و ئامانجیشی گەیشتنە بە بیسەرانی ئێرانی و ئێرانییەکانی تاراوگە لە رێگای بەرنامەی مۆسیقا و پەخشی هەواڵەکانەوە. بەڵام ئامانجی رادیۆکە تەنها بریتی نییە لە نیشاندانی وێنەیەکی ئەرێنی ئەمریکا، بەڵکو "خەبات لە پێناو ئازادی و مافی چارەی خۆنوسینیش لە ئێران" دەگرێتەوە. وەکو کاردانەوەیەکیش بۆ ئەو هەنگاوە، حکومەتی ئێران تەکنەلۆجیای شپرزەکردن (تشویش) ی لە وڵاتی کوبا کڕی بەمەبەستی ریگا گرتنلە هاووڵاتیانی ئێرانی لە گوێ گرتن و بیستنی بەرنامەکانی ئەو رادیۆیە. هەر لە چوارچێوەی ئەو کاردانەوەشدا، ئێران کەناڵێکی ئاسمانی تەلەفزیۆنی بە زمانی عەرەبی دامەزراند بە ناوی کەناڵی (العالم) بەمەبەستی گەیاندنی کولتووری وڵاتەکەی بە عێراق و شوێنەکانی تر. ئەمەش بە کارێکی زۆر گرنگ بۆ ئێرانییەکان دەژمێردرێت، چونکە ئەمریکا هەمیشە ئێران بە داڵدەدانی رێکخراوە تیرۆریستییەکانی ناو عێراق و لوبنان تۆمەتبار دەکات بێجگە لە تۆمەتی پەرەدان بە بەرنامە ئەتۆمییەکەی.

وادیارە یەکێك لە بەرچاوترین شێوازەکانی پەوەندی ئەلیکترۆنی لە ئێراندا بریتییە لە "بلۆگ"بە تایبەتییش لە نێو لاواندا، هەرچەندە حکومەتی ئەو وڵاتە بە زۆری هەوڵ بۆ گرتنی ئەو کەسانە دەدات کە بلۆگینگ" بەکار دێنن. هەوڵی گرتنی لاوەکانیش کاتێ زیاتر دەبێت کە لە ژیاننامەکانیاندا لەسەر ئەو لاپەڕەیە ئاماژە بە یاخیبوونی سیاسی دەکەن.

# میدیا و جیۆپۆلیتیکی گشتی

مایەی سەرسوڕمانە کە نوسەرانی بواری جیۆپۆلیتیك پێشتر بایـەخی زۆریـان بـە جیۆپـۆلیتیکی گشتی نەداوە، سەرەڕای ئەوەی کە میدیا رۆڵی گرنگ دەبینێت لە تێگەیشـتنی مـرۆڤ و کـارلێکردنی لە جیهاندا. هەر یەك لە ئێمە خاوەن هۆکاری میدیایی تایبەت بـە خۆیـەتی کـە لـە رێگـای دەسـت گەیشتن و کارلێکی میدیا جیاوازەکانی وەکـو رۆژنامــەو رادیـۆ و تەلـەفزیۆن و ئینتەرنێتــەوە بۆمـان دروست بووە. دیارە بەهۆی زۆریی ژمارەی کەناڵە تەلەفزیۆنییە ئاسمانییەکانەوە، ئـەم چـوار شـێوازەی راگەیاندن هەمیشە بە رادەیەکی بـاش لەبـەر دەسـتی زۆربــەی دانیشـتووانی ئـەمریکای بـاکوور و ئەوروپا و بەشێکی زۆر لە ئاسیا و ناوچەی زەریای هێمندایە. بێگومان لەوەتای راگەیانـد لـە سـەدەی بیستەمدا بە چڕی هاتووەتە گۆڕەپانی کارەوە، پەیوەندیی جیهـانیی تونـدو تـۆڵ تـر و خێراتـر بـووە. هەرچەندە زۆر جار شێوازی راپۆرتە رۆژنامەوانییەکان بە نـەخوازراو دادەنرێـت، بـەڵام ئـەو راپۆرتانـە گەلەکان و شوێنەکان و رووداوەکان بە باشی پێکەوە دەبەستنەوە.

گومان لەوەدا نییە کە دروستکردن و بڵاو کردنەوە و سوود وەرگـرتن لـە هەواڵـەکان لـە بنەڕەتـدا یەکسان و هەماهەنگ نییە، چونکە هەندێك لە ئاژانس و کۆمەڵگاکان باشـتر لـە شـوێنەکانی دیکـە دەستیان بە سەرچاوەکانی هەواڵ را دەگات. لە رووی دروستکردنی هەواڵیشــەوە، ئـەوروپا و ئــەمریکا لە پێشەوەن بە هۆی باڵادەستیی دامەزراوە زەبەلاحەکانی وەکو

((CNN International, Time-Warner, News International, and BBC)).

ئەم دەزگایانە لە رووی بڕیاردان لەسەر شێوازو ناوەڕۆکی پـەخش کردنـەوە زۆر گـرنگن، سـەرەڕای بوونی ئەو رۆژێمە نەتەوەیی و نێونەتەوەییانەی کە تا رادەیەکی زۆر کـۆنترۆڵی بینـەر و بیسـەرەکانی خۆیان دەکەن. ئەڵبەتە ئەوە راپۆرتی رۆژنامەوانی و پەخشی تەلـەفزیۆن و بەرنامــەی ئینتەرنێتـە کـە بڕیار دەدات چی جۆرە خەڵك و شوێن و رووداوێك شایستەی بایەخ پێدانی زیاترە. ئـەم هەڵبژاردنـەش لە لای خۆیانەوە کاریگـەرییان لەسـەر کاردانـەوەی بینـەران دەبێــت بەرامبـەر گێڕانـەوەی رووداوی تایبەت بە قوربانی و تاوانباران، چەوسێنەر و چەوساوەکان، و تاکە ناسراو و گرووپە نەناسـراوەکان. بـۆ نموونە، زۆربەی خەڵکی پێگەیشتوو لە تەمەنە جیاجیاکاندا بە بیریان دێتەوە کەی و لە کوێ بۆ یەکـەم جار وێنەی کوژرانی سەرۆك "کەنەدی"یان لە کـانوونی یەکـەمی ١٩٦٣دا لـە رێگـای تەلەفزیۆنـەوە بینی. بەڵام رووداوەکانی وەکو داڕمانی دیواری بەرلین لـە تشـرینی یەکـەمی ١٩٨٩ و هێرشـەکانی ١١ی سیپتەمبەری ٢٠٠١ زیاتر لە بیرو هزری نەوەکانی دواتردا زیندووە.

لەبەر ئەوەی راگەیاندن توانای دروستکردنی رای گشتی هەیە و لەسەر هەردوو ئاستی نێوخۆیی و جیهانییش کاریگەریی دەخاتە سەری ئەگەر بە شێوەی بەرفراوان پەخش و بلاّو بکرێتەوە، بۆیە هیچ مایەی سەرسوڕمان نییە کە حکومەتەکان هەوڵ بدەن بۆ رێکخستن و چاودێری کردن و پەکخستن و تەنانەت قەدەغە کردنی ئەو راگەیاندنانە بە پێی بەرژەوەندی خۆیان. ئەو هەرا گەورەیەش کە دوای بلاّو بوونەوەی وێنەکانی ناو زیندانی ئەبو غرێب هاتە ئاراوە، نموونەیەکی ئەم حاڵەتەیە. فیلمێکی دیکۆمێنتیی کەناڵی هەواڵی CBS ی ئەمریکی لە مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠٤دا لەم بارەیەوە بلاّو کرایەوە. تێیدا وێنەی چەند بەندکراوێکی عێراقی کە بە کامێرای دیجیتاڵی پاسەوانێك گیراوە، دەردەکەوێت لە کاتێکدا رووبەڕووی سوکایەتی پێکردن و ئەشکەنجەدان دەبنەوە. بێگومان کاریگەری ئەو فیلمە دیکۆمێنتارییە زۆر راستەوخۆ و وروژێنەر بوو. بۆیە ئیدارەی سەرۆك (بوش) ناچار بوو زۆر بە خێرایی سەرکۆنەی ئەنجامدەرانی رووداوەکە بکات و بە " چەند سێوێکی گەنیو" ناوزەدیان بکات. بەلاّم بە لای رەخنەگران لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا چی لە ناوخۆ بێت یان لە دەرەوە، وێنەکان وەکو نیشانەیەك بۆ تاوانبارکردنی سیاسەتی دووفاقانەی ئەمریکا بەکار دەهێنران، بە تایبەتییش هەر کاتێك ئەو ولاّتە باس لە پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و نەریتی دیموکراتیی لیبراڵی بکات. هەرچەندە پێشتریش وێنەکان لە سەر سایتە جیاجیاکان بلاّو کرابوونەوە، بەلاّم ئەو کەسانەی بڕیاریان دابوو بە توندی بەربەرەکانێی داگیرکاریی ئەمریکا بۆ عێراق بکەن، زیاتر بۆ ئەو مەبەستە سوودیان لە وێنەکان وەردەگرت. گروپێکی تر لە بینەرانی وێنەکان، شێوازی دیکەی راگەیاندن و کۆڕبەندی کۆمەلاّیەتییان بەکار دەهێنا وەکو چاپخانە و پەیامی راستەوخۆ بە مەبەستی گفتوگۆ کردن و بیروڕا گۆڕینەوە دەربارەی مانا و بایەخی ئەو وێنانە.

بەمەش دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە هێزی جیۆپۆلیتیکیی راگەیاندن تەنها لە خودی پەخشکردندا نییە، بەڵکو گرنگیی زیاتر لە شێوازی باسکردنی کەسەکان، شوێنەکان، و یان رووداوەکاندایە، واتا بە چی رێگایەك وێنا دەکرێن بۆ بینەران. رووداوەکانی ئەم دواییەی نێوان لوبنان و باکووری ئیسرائیل نموونەی ئەم شێوازە باسکردنەیە، تێیدا بە لای بەشێکی زۆر لە بینەرانی ئیسرائیل و ئەمریکا و شوێنەکانی ترەوە، بۆمباران کردنی لوبنان لە لایەن ئیسرائیلەوە پاساوی خۆی هەبوو، چونکە کردەوەکانی حزبولاّ لە باشوری لوبنان هەڕەشەی سەربازی راستەوخۆیان بۆ سەر ئیسرائیل دروست دەکرد. حزبولاّ تەنها بەرپرس نەبوو لە هێرشە مووشەکییەکان بۆ سەر باکووری ئیسرائیل، بەڵکو بە کوشتنی ژمارەیەك سەربازی ئیسرائیلی و هەروەها خەڵکی سیڤیل لە ئیسرائیل و شوێنەکانی دیکەی وەکو ئەرجەنتین تۆمەتبار کرابوو. بەلاّم بە بۆچوونی خەڵکی دیکە، بۆمباران کردن و داگیرکردنی

سەربازیی باشوری لوبنان لە لایەن ئیسرائیلەوە نەگونجاو وبێ پاساو بوون، بێجگە لەوەی زۆرترین رادەی زیانیشی گەیاندە خەڵکی سیڤیلی ناوچەکە. بە هەر حاڵ، ئەم وێنەو هەواڵانە دوو بۆچوونی جیۆپۆلیتیکیی دژ بە یەکیان دروست کرد کە هەرگیز یەك ناگرنەوە.

هەروەها دەکرێ ئەم وێنەو هەواڵانە ببنە هاندەر بۆ حکومەتەکان و بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکان و خەڵکی تریش تا داوای رێگا گرتن لەو جۆرە کردە سەربازییانە بکەن. لەوانەیە بەشێك لە بینەران شێوازی جیاوازیان بۆ کاردانەوە پەیڕەو کردبێت وەکو: پەیوەندی کردن بە تەلەفۆن بە مەبەستی سەرەخۆشی کردن لە کەس و کاری قوربانییانی بۆمبارانەکە، ناردنی نامەی نارەزایی لە رێگای رۆژنامەکانەوە، یان ناردنی ئیمەیڵ بۆ دام و دەزگا حکومییەکان. واتا وێناکردنی گەل و شوێنەکان لە راگەیاندندا هەموو جۆرێك لە سۆز و داواکاری بۆ پەرچەکردار بە دوای خۆیدا دێنێت، هەرچەندە ئەو داواکاری و پەرچە کردارانە جیاواز و جۆراوجۆریش دەبن. لە حاڵەتی شەڕی ساڵی ٢٠٠٦ لە نێوان ئیسرائیل و لوبناندا، وڵاتە رۆژئاواییەکانی وەکو ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا ناچار بوون هاووڵاتیانی خۆیان لە ناوچەکە بانگهێشت بکەنەوە و هەوڵ بۆ راگەیاندنی ئاگربەست و دەستتێوەردانی هێزی ئاشتی پارێزی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ناوچەی ماملانێکەدا بدەن.

بەلاّم بە لای ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی توندڕەو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامییەوە، بۆمباران کردنی لوبنان دەخرێتە چوارچێوەیەکی گەورەتر کە بریتییە لە دەستدرێژی یەهودی- مەسیحی بۆ سەر کۆمەڵگا موسڵمانەکان لە چەندین شوێنی وەکو ئەفغانستان، بۆسنە، چیچان، عێراق، و فەلەستین. هەرچەندە پێشتریش وێنەی ژمارەیەك منداڵی کوژراو لە بەیروت لە رۆژنامە رۆژئاواییەکاندا بلاّو کرابووەوە، بەلاّم ئێستا وێنەی دیکەی شۆکهێنەری ئەو رووداوانە لە سایتەکانی ئینتەرنێتدا بەرچاو دەکەون و کاردانەوەی توندیش لە هزری خەڵکی توندڕەودا دروست دەکەن. ئەوەتا لە تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٤دا، ئوسامە بن لادن، لە تۆمارێکی دەنگیدا کە لە ئینتەرنێت بلاّو کرایەوە، ئەوەی وەبیر هێنایەوە کە چۆن دیمەنی تاوەرەکانی شاری بەیروت، ئەوانەی فڕۆکە جەنگییەکانی ئیسرائیل هێرشیان دەکردە سەریان، هانی داوە تا بیر لە هێرش کردنە سەر چەند بینایەك لە ئەمریکا بکاتەوە. بەمەش ئاماژەی بە کردەوە سەربازییەکەی ئیسرائیل دەکرد کە لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٢ لە دژی لوبنان ئەنجام درا. ئەوەبوو دوای نزیکەی بیست ساڵ پلانەکەی جێبەجێ کرد و زیانێکی گیانی گەورەشی لێ کەوتەوە.

## هۆڵیوود و ئەمریکا و سینەمای ئاسایشی نەتەوەیی

لە بەشی زۆری سەدەی رابردوودا، ئەمریکا ئەو وێرانکارییەی شەڕ و کارەساتە گەورەیــەی بــەخۆوە نەبینی کە وەکو کارێکی رۆتینی لە پارچەکانی دیکەی جیهاندا روویان دەدا، بێجگە لە هێرش کردنــە سەر بەندەری پیرڵ هاربەر لە کانوونی یەکــەمی ١٩٤١ و هێرشــەکانی ١١ی ســیپتەمبەری ٢٠٠١دا. بەڵام سەرەڕای ئەو خورپەو ترس زیانە گیانییانەی هەردوو هێرشەکە هێنایانە ئــاراوە، نــاکرێ بــەراورد بکرێن لە گەڵ ئەزموونی هاوشێوەیان لە ولاتانی وەکو فەرەنسا و بەلجیکا و یــەکێتی ســۆڤێت. راســتە لە کاتی هەردوو جەنگی جیهانیدا ژمارەیەکی زۆر سەربازی ئەمریکی گیانیان لەدەست دا، بەلاّم ئــەو ململانێیانە لە دەرەوەی ئــەمریکا روویــان دەدا و نەدەگەیشــتنە نــاو خــاکی ئــەو ولاّتــە. کۆمپانیــا فیلمسازە ئەمریکییەکانیش، سەرەڕای دووریی جەنگ لە ولاّتەکەیان، پێــداگیرییان لەســەر ئــەو قســە نەستەقە دەکردەوە کە هەمیشە جەنگ بە دوو شێواز ئەنجام دەدرێت: یەکەمیان لە گۆڕەپانی شــەڕدا و دووەمیشیان لە لە رێگای فیلمەکانەوە.

لەبەر ئەوەی ئەزموونی راستەوخۆی ئەمریکا لە شــەڕدا ســنووردارە، هۆڵیــوود زنجیرە فیلمێکــی بەرهەم هێنا بە ناونیشانی " سینەمای ئاسایشی نەتەوەیی" کە بە شێوەیەکی تــەکنیکیی بــەرز ئــەو هەڕەشانەی نیشان دەدا کە رووبــەڕووی ئــەمریکا دەبنــەوە. لیســتی هەڕەشــەکان دوورو درێــژ بــوو و چــەندین ولاّتــی دەگرتــەوە وەکــو یــەکێتی ســۆڤێت، هێــزە کۆمۆنیســتەکانی دیکــە، نازییــەکان، تیرۆریستەکان، نەیزەکی ئاسمان، ئەو هێزە سرووشتییانەی کە کۆنترۆڵ ناکرێن، و مەکینەو ئامێرەکــان. بە رەچاو کردنی ناوبانگی بەربلاّوی بەرهەمەکانی هۆلیوودیش لە ناوەوەو دەرەوەی ئەمریکا، ئیتر فــیلم وەکو هاریکارێکی چالاك لە نیشاندانی هەلّوێست و گرنگیی ئــەمریکا لــە جیهانــدا ســەیر دەکرێــت، چونکە فیلمەکانی هۆڵیوود بۆ زۆرێك لە دانیشتووانی دەرەوەی ئــەمریکا دەبنــە یەکــەم وێســتگە بــۆ ناسینی ئەو میللەتە( ٣٠٠ ) ملیۆن کەسییەوە.

لەولاشەوە لە سەردەمی شەڕی سارددا، هاوولاّتیانی ئــەمریکا نــە خــەڵکی یــەکێتی ســۆڤێتیان دەبینی و نە سەفەری ئەو ولاّتەشــیان دەکــرد. بــە هــەمان شــێوەش ســەبارەت بــە ولاّتــی (چــین) ی کۆمۆنیستی و چەند ولاّتێکی تریش کە ئەمریکا پەیوەندی لە گەڵیاندا نەبوو. تەنها ژمارەیــەکی کــەم لە ئەندامانی هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا لەو حاڵەتە بەدەر بوون و لــە کــاتی ئەنجامــدانی هەڵمــەتی سەربازیدا چاویان بە خەڵکی ئەو ولاّتانە دەکەوت یان سەردانی ولاّتەکانیان دەکرد. هەروەها بازرگــان و هونەرمەندان و وەرزشوانان و ئافرەتان و سیخوڕەکانیش ئەو دەرفەتەیان بۆ دەڕەخسا. بــە لای زۆربــەی ئەمریکییەکان و هــەروەها ئەوروپییــەکان لــە هــەردوو لای ناوەڕاســت و رۆژهــەلاّتی کیشــوەرەکەوە،

وتەکەی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا ونستون چرچڵ دەربارەی دروستکردنی "دیـواری ئاسـنین" لـە نـاو ئەوروپا لێدوانێکی درووست و ژیرانە بوو. دواتریش فیلم و رادیۆ و تەلەفزیۆن رۆڵی کاریگـەریان بینـی لە دروستکردنی بۆچوونی تایبەتی ئەمریکا دەربارەی یەکێتی سـۆڤێت و ئـەو هەڕەشـانەی سیسـتمی کۆمۆنیستی لە ناوەو دەرەوەی ئەمریکا دەیکردە سـەر ئـەو ولاتـە. هـەروەها رۆڵیشـیان هـەبوو لـە پتەوکردنی هەستی ئەمریکییەکان بە بوونی چەندین خەسڵەتی گرنگ لە ولاتەکەیاندا وەکو ناسـنامەی خۆماڵی، ولاتی ئازادیخوازان، قەلای دیموکراسی، و شێوازی لیبرالـی بـۆ ژیـان کـە پێشـتر لـە سـاڵی ١٩٤٧دا سەرۆك ترومان باسی کردبوون.

مێژوونووسانی بواری فیلمسازی دووپاتی دەکەنەوە کە گرنگترین قۆناغەکانی سینەمای ئـەمریکی لە سەردەمی شەڕی ساردا لە سالانی چلەکان و پەنجاکانـدا بـووە. لەبـەر ئـەوەی لـەو سـەردەمەدا تەلەفزیۆن وەکو پێویست بلاو نەبووەوە و بەشێکی زۆر لە خەڵك هێشتا نەبوونـە خـاوەن تەلـەفزیۆنی خۆیان، بۆیە بە زۆری روویان لە شاشەکانی سینەما دەکرد نەك تەنها بۆ سەیرکردنی فیلمـەکان بـەڵکو بۆ بینینی رۆژنامەی سینەمایی و فیلمە دیکۆمێنتارییـەکان کـە لەگـەڵ فیلمەکانـدا نیشـان دەدران. (رۆژنامەی سینەمایی: فیلمێکـی کـورتی تایبـەت بـە هەواڵـە کـە لەگـەڵ فیلمـە سـینەماییەکەدا پێشـکەش دەکـرا——وەرگێـڕ). گرنگیـی زۆری ئـەو فیلمانـەش لـەوەوە سەرچـاوەی دەگـرت کـە کۆمپانیاکانی هۆلیوود بۆ بەرهەمهێنانی فیلم پەیوەندی پتەویان لەگەڵ چەند وەزارەتێکـی حکومـەتـدا هەبوو وەکو وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی بەرگری لە واشنتون. ئـەوەبوو لـە سـاڵی ١٩٤٨دا پـەنتاگۆن ئۆفیسێکی پەیوەندی وەکو بەشێك لـە نوسـینگەی جێگـری وەزیـری بـەرگری بـۆ کاروبـاری گشـتی دامەزراند کە لە دوو رووەوە گرنگ و بایەخدار بوو:

یەکەم: دەستنیشانکردنی هێڵی گشتیی چیرۆکی فیلمەکان .

دووەم: بڕیاردان لەئەوەی ئایا هاوکاری نێوان هەردوولا ئەو بەرهەمانەش بگرێتەوە کە پێویسـتیان بە بەکارهێنانی کەسایەتی و کەرەستەی سەربازی ئەمریکی هەیە یان نا؟

بۆ نموونە، پەنتاگۆن بـە سـەرباز وپلەدارەکانییـەوە بەشـداری لـە فیلمـی وەکـو "درێـژترین رۆژ" (١٩٦١) دەکرد. بەلام دواتر بە هۆی پەرە سەندنی تەنگـژەی سیاسـی لـە بـەرلین کـە گەیشـتە ئـەو رادەی ئەڵمانیای رۆژهەلات دیوارێك دروست بکات و شارەکە دوو کـەرت بکـات، پـەنتاگۆن ناچـار بوو ژمارەیەك لە سەرباز و پلەدارەکانی لە کاتی بەرهەمهێنانی فیلمەکەدا بکێشـێتەوە. ئـەو دابـەش کردنەش بەردەوام بوو هەتاکو مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٩ کاتێ ئەڵمانییەکان دیوارەکـەیان رووخاند و جارێکی تر بەرلین گەڕایەوە دۆخی جارانی خۆی.

پێشتریش پەنتاگۆن لە نزیکەوە هەماهـەنگی لەگـەڵ بەرهەمهێنـەرانی وەکـو (فرانـك کـاپرا) دا دەکرد و سەرباز و کەرەستەو ڕێنمایی پێویستیشی لە زنجیرە فیلمەکەیدا بـە ناونیشـانی "بۆچـی شـەڕ دەکەین؟" پێشکەش کرد. ئەم زنجیرە بە تایبەتی بایەخـدانی دەسـەڵاتدارانی ئـەمریکای بـە میـدیای بینراو لە دروستکردنی رای گشـتیدا نیشـان دەدا. بـە رەچـاو کردنـی راددەی هەڕەشـەکانی یـەکێتی سۆڤێتیش، هیچ مایەی سەرسوڕمان نەبوو کە چەند دەزگایـەکی دیکـەی وەکـو ئاژانسـی زانیـاری و ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکا فیلم بە هۆکارێکی کاریگەر دابنێن لە ئاگادار کردنەوەی گەلی ئـەمریکا و خەڵکی تریش لە دەرەوەی وڵات دەربارەی مەترسییەکانی یـەکێتی سـۆڤێت لەسـەر ئـەمریکا. بـۆ نموونە، ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکا بودجەی نهێنی بۆ فیلمی کاریگەری "کێڵگـەی ئـاژەڵ" کـە لـە ساڵی ١٩٥٤ نیشاندرا، دابین کردبوو، چونکە جێ پەنجەی "جۆرج ئۆرویل" ی نوسەرەکەی بە کاریگەر هەژمار دەکرا بە هۆی ئاماژە ناڕاستەوخۆکانی ناو فیلمەکە بە جێبەجێ نەبوونی بەڵێنـەکانی شۆڕشـی روسیا لە ساڵی ١٩١٧دا.

بە گشـتی، لـە سـاڵانی چـلەکان و پەنجاکانـدا کۆمپانیاکـانی بەرهـەمهێنانی فیلمـی هۆلیـوود پێویستییان بە بودجەو دەست تێوەردانی حکومەت نەما کە ببێتە هانـدەریان بـۆ ئـەوەی بـە باشـی هەڕەشەکانی یەکێتی سۆڤێت و سیسـتمی کۆمۆنیسـتی بـۆ سـەر سیسـتمی سیاسـی وڵاتیـان روون بکەنەوە. لەو سەردەمەدا ئەمریکا و روسیا تووشی پێکدادان هاتن لەسـەر ئاینـدەی بـەرلین و نیمچـە دوورگەی کۆریا. ئیتر فیلمەکانی وەکـو "کوڕەکـەم جـۆن" (١٩٥٢)، "ئەسـتێرەی مـەریخی سـوور" (١٩٥٢)، و "شتەکە" (١٩٥١) باسیان لە پەیوەندیی نێوان ئەو هەڕەشەو مەترسییانەیان دەکـرد کـە لەو ماوەی پڕ ئاشووبەدا توشی خەڵکی ئەمریکا دەبوونـەوە. لـە کاتێکـدا فیلمـی یەکـەم پێـداگیری لەسەر دەسەڵاتی کۆمۆنیستی لە کارتێکردن و تێکدانی ورەی لاوەکان دەکـرد، دوو فیلمەکـەی دیکـە باسیان لەو مەترسییانە دەکرد کە نەیارانی ئاسایشی نەتەوەیی وڵات دەیانخولقانـد. ئەگـەر بـە سـەر یەکەوەش خوێندنەوەیان بۆ بکرێت، فیلمەکان ئەوەیان نیشان دەدا کە خەڵکی ئەمریکا پێویسـتیان بـە هوشیارکردنەوەی بەردەوامە،و هەروەها پێویستیشە هەژموونی ترسناکی کۆمۆنیزم سنووردار بکرێت.

بە هەمان شێوەی بیرکردنەوە جیۆپۆلیتیکییـە کردەییـەکانی سـەردەمی ئیـدارەی سـەرۆك هـاری ترومان، فیلمەکانی وەکو "کوڕەکـەم جـۆن" (١٩٥٢) هاریکـار بـوون لـە وێنـاکردنێکی جـوگرافیی تایبەت بە ئەمریکا و جولاندنی زیاتری هەستی خەڵك دەربـارەی گرنگیـی ناسـنامەی خۆمـاڵی لـەو وڵاتەدا. لە سەرێکی دیکەشەوە، فیلمەکان کرانەوەو لێبـوردەیی ئـەمریکایان بـە چـاکەو لـە هـەمان کاتیشدا بە هەڕەشە بۆ سەر ئەو وڵاتە هەژمار دەکرد. بە پێی ناوەڕۆکی ئـەو فیلمانـە، پێویسـت بـوو

هاووڵاتیە دڵسۆز و نیشتمانپەروەرەکانی ئەمریکا زۆر وریا و بە ئاگا بن، چونکە لە سایەی کرانەوەی ئەمریکا بە رووی جیهاندا، شت و مەك و خەڵك و تەنانەت هزرە جیاوازەکانیش بە ئاسانی دێنە ناو وڵاتەوە و کاریگەریی نەرێنی دروست دەکەن. هەروەها فیلمەکان نیشانیان دەدا کە لە دۆخێکی لەو جۆرەدا، لاوە سۆزدارەکان زیاتر دەکەونە ژێر باری کاریگەریی نەرێنی رۆشنبیرانی نەییار بە سیستمی سیاسیی وڵاتەکەیان. بۆ نموونە، یەکێتی سۆڤیێت بە"هەڕەشەی سوور" ناوزەد کرابوو . نوسین و دیکۆمێنتەکانی نوسەر "جۆرج کینان" یش بەم شێوەیە باس لەو هەڕەشە دەکەن: لە رووی جوگرافییەوە فراوانخواز، لە رووی کولتوورییەوە یەککگرتوو، لە رووی ئاینییەوە جیگای گومان، و لە رووی سیاسییەوە هەوڵی بێ وچان دەدات بۆ شێواندنی پێکهاتەی سیاسی لە ئەمریکا. هەر بە پێی چەند بەشێکی هۆلیوود، یەکێتی سۆڤیێت دەتوانێت بە هاوکاری خەڵکی بیانی هەڕەشەکەی دژ بە ئەمریکا جێبەجێ بکات و تەنانەت لە درێژەی هەوڵەکانیدا بۆ کۆنترۆڵکردنی جیهان، کاریش بۆ لێکترازاندنی نەییارەکانی دەکات.

ئەڵبەتە کەسایەتی سیاسی و ئاینی وەکو ولیام بەکلی، بیلی گراهام، و جۆن فۆستەر دولز،تێکەڵ بەو گفتوگۆو دژایەتی کردنەی یەکێتی سۆڤیێت و "هەڕەشەی سوور" ە بوون. بە تایبەتییش بیلی گراهام هەمیشە دووپاتی جیاوازی نێوان سۆڤیێتی بێ ئاین و ئەمریکای مەسیحی دەکردەوە. بە مەبەستی دووپاتکردنەوەی گرنگیی ئەو جۆرە فیلمانەش، هێرشێکی سیاسی تازە دژ بە سۆڤیێت لە رێگای لیژنەی چالاکییە غەیرە ئەمریکییەکان لە ئەنجومەنی نوێنەران لە کۆتایی سالانی چلەکان و سەرەتای پەنجاکاندا دەستی پێکرد. لیژنەکە لە ساڵی ١٩٤٧ دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵ "شایەتە دۆستەکان"، بەرهەمهێنەرانی فیلم، نوسەرانی سیناریۆ، و ئەو ئەکتەرانەی پەیوەندیدار بوون بە پیشەسازی فیلمەوە. لە پرۆسەکەدا چاوپێکەوتن لە گەڵ( ٤١ ) کەسدا ئەنجام درا و ژمارەیەك لە کارمەندانی بواری فیلمسازی بە هەڵگرتنی بیرورای چەپڕەی تۆمەتبار کران.

دواتر لیژنەکە چالاکییەکانی لەسەر "هۆلیوود ١٠" چڕ کردەوە. ئەم گروپە لە چەند کەسێك پێکهاتبوو کە رازی نەبوون وەڵامی هیچ پرسیارێك بدەنەوە. لەمەشدا پشتیان بە یەکەمین هەموار کردنی دەستووری وڵات ئەستوور بوو کە مافی وەڵام نەدانەوەی پرسیاری دەدایە تۆمەتباران. بەڵام لیژنەکە بەم هەڵوێستەیان رازی نەبوو و لە ئەنجامی سەرپێچی کردنەکەیان، هەموویان خرانە زیندانەوە. ئینجا بە هاوکاری ئاژانسی هەواڵگری و سوپای ئەمریکا لیستێك بە ناوی "کەناڵی سوور" ئامادە کرا و تێیدا زانیاری دەربارەی هەر کەسێك تۆمار دەکرا کە لە هۆلیوود کاری دەکرد و خاوەن رابردووی تێکدەرانە بوو. دیارە بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی دەچوونە بەردەم لیژنەی چالاکییە

غەیرە ئەمریکییەکان و بێ تاوانی خۆیان دەسەلماند، ناوەکانی ناو "کـەناڵی سـوور" دەخرانـە لیسـتی ڕەشەوەو بە هیچ شێوەیەك وەکـو نوسـەر، ئەکتـەر، یـان بەرهەمهێنـەری فـیلم وەر نـەدەگیران. لـەم چوارچێوەیەدا زیاتر لە ٣٠٠ کەس بە (چارلی چاپلن) و (ئۆرسون وێلز) یشەوە ئـەو تۆمەتـەیان درایـە پاڵ. ئەم هەنگاوەش کاریگەری گەورەی لەسەر هۆلیوود درووست کرد و بە هـیچ شـێوەیەك یارمـەتی دروستبوونی کولتووری جیاوازی نەدەدا، بە تایبەتییش لەبەر ئەوەی بۆچوونی باوی سـەردەمی شـەڕی سارد دووپاتی ململانێی سیاسی و ئاینی لە نێوان ئەمریکا و دوژمنەکانیدا دەکردەوە.

بەڵام ئەو باسەی سەرەوە بەو مانایە نییە کە سەرجەم بەرهەمهێن و ڕەخنەگرانی بواری فیلمسـازی و بینەرانیش بەم وێناکردنە جیۆپۆلیتیکییەی "هەڕەشەی سوور" ڕازی بووبن و گلەییان لێ نـەبووبێت. بەشێك لە بەرهەمهێنەکان فیلمی خەیاڵی زانستی و دێوەزمـەی هاوپەیمانـەکانیان بـەکار دەهێنـا بـۆ ئەوەی بۆچوونێکی تەواو جیاواز دەربارەی شەڕی سارد وێنا بکەن. بۆ نموونە، فیلمێکـی جـاك ئارنۆڵـد بە ناونیشانی "لە دەرەوەی سنوورەوە هاتووە" (١٩٥٣)، باس لە گروپێـك لـە لایـەنگرانی ئـەمریکا دەکات کە سەردانی ئەو وڵاتە دەکەن و ڕەخنە لە مەترسی ئەمریکا لە کەسـانی غـەریب و نەناسـراو دەگرن. لە لایـەکی تـرەوە هەمووارکردنەکـەی "سـتانلی کرەیمـەر" بـۆ فیلمـی "لەسـەر کـەنارەکان" (١٩٥٩) باس لە مەترسی قڕکردنی ئەتۆمی دەکات و لۆجیکی ستراتیجی خودی ململانێـی ئـەتۆمی دەخاتە ژێر پرسیارەوە. سەرەڕای ڕەخنـەی حکومـەتیش، فیلمەکـە بـوو بـە یـەکێك لـە گـەورەترین بەرهەمەکانی ئەو ساڵە. فیلمێکی دیکەی ستانلی کرەیمەر بە ناونیشـانی " مـانگی بـەرز" (١٩٥٢) چیرۆکی بەرپرسی شارێك دەگێڕێتەوە کە خەڵکەکـەی هاوکـاری ناکـەن سـەرەڕای ئـەوەی گروپێکـی یاخیبوو بڕیاریان داوە تۆڵەی لێ بکەنەوە، چونکە پێشتر بە بڕیاری ئەو دەستگیر کرابوون.

لە نێوان ساڵانی کۆتایی چلەکان و ساڵانی شەستەکاندا، دەزگا فیلمسـازییەکان زیـاتر لـە ٤٠٠٠ فیلمیان بەرهەم هێنا کە تەنها بەشێکی کەمیان ڕەخنەیان لـە تێگەیشـتنی دێرینخوازانـەی ئـەمریکا بەرامبەر شەڕی سارد و وێناکردنی جیۆپۆلیتیکی بۆ هەڕەشەی یەکێتی سۆڤێت و بلۆکی کۆمۆنیسـتی دەگرت. بەڵام لـە ئـەنجامی لێکۆڵینـەوەکانی لیژنـەی چـالاکییە غـەیرە ئەمریکییـەکانی سـەر بـە ئەنجومەنی نوێنەران و دواتریش لێکۆڵینەوە تایبەتییەکانی سیناتۆر جۆن میککارسی، کاری هۆلیـوود ئاسانتر بوو لە ڕووی بەرهەمهێنانی ئەو فیلمانەی کە تێگەیشتنی شـاراوە دەربـارەی ئـەمریکا وەکـو وڵاتێکی خاوەن دانیشتووانی لەخوا ترس و ئازادیخواز زیاتر دەچەسپێنن، وڵاتێـك کـە سـوورە لەسـەر بەربـەرکانێ کردنـی هـەر هـەوڵێکی هەڵخەڵەتانـدن لـە لایـەن سـۆڤێتی بـێ ئـاین و تاوانبـاری نێودەوڵەتییەوە.

به گەڕانەوەش بۆ دواوە، دەبینین لە بەشی هەرە زۆری سەردەمی شەڕی سارددا (سالآنی چلەکان و پەنجاکان) و هەروەها لە سالآنی هەشتاکانیشدا، هۆلیوود لە لووتکەی خۆپاراستندا بوو لە رووی وێناکردنی شەڕی ساردەوە. من وەکو مێردمنداڵێك لەو سەردەمانەدا، بە بیرم دێت کە سەیری فیلمی "شەفەقی سوور" (١٩٨٤) م دەکرد. لە سەرەتای فیلمەکەدا، هێزێکی سۆڤێتی و کوبی بە پەرەشووت هێرش دەکەنە سەر قوتابخانەیەکی ئەمریکی لە ناوچەیەکی رۆژئاوای ئەمریکا. لە کۆتایی فیلمەکەشدا گروپێك قوتابی هێرشێکی پێچەوانەی سەرکەوتوو دژ بە هێرشبەران ئەنجام دەدەن. فیلمەکانی تر لە نموونەی "باشترین چەك" (١٩٨٦) لەگەڵ سەردەمێکدا دەگونجێن کە چەند خەسڵەتێکی جیاواز بەخۆوە دەگرێت وەکو: گرژیی تازەی شەڕی سارد، سووربوونی ئەمریکا لەسەر پاککردنەوەی ئەمریکای لاتین لە هێزە کۆمۆنیستەکان، و هەروەها دابینکردنی پاڵپشتی دارایی و سەربازی بۆ لایەنەکانی دیکەی وەکو شۆڕشگێڕانی ئەفغانستان کە بەربەرەکانێی هێزەکانی سۆڤێتیان لەو وڵاتەدا دەکرد.

بێگومان شوێن و هەڵکەوتەی فیلمەکانی تایبەت بە دوا قۆناغی شەڕی سارد زۆر گرنگ و بایەخدارن،چونکە تیشکی زیاتر دەخەنە سەر ئەو هەڕەشە ئاشکرایانەی کە حکومەت و رژێمەکانی ئەمریکای ناوەڕاست، باشووری رۆژهەلآتی ئاسیا، و رۆژهەلآتی ناوەڕاست لەسەر ئەمریکا دروستیان دەکرد. بۆچوونی باوی دوای شەڕی کەنداویش لە ساڵی ١٩٩١، بریتی بوو لە دەرکەوتنی ئەو فیلمانەی کە باس لە تیرۆریزمی ئیسلامی دەکەن لە وڵات و شوێنەکانی وەکو بەیروت. ئەڵبەتە دەرکەوتنی فیلمەکان تەنها بە رێکەوت نەبوو،چونکە پێشتر هێزەکانی ئەمریکا لە ساڵی **١٩٨٣** لە لوبناندا بلآوەیان پێ کرابوو و زەرەر و زیانی زۆریشیان بەرکەوت. ئەوەبوو لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا، تەقینەوەی ئۆتۆمبیلێکی بۆمبڕێژکراو زیاتر لە( ٢٠٠ ) سەربازی مارینزی ئەمریکی لە سەربازگەکەیان لە بەیروت کردە قوربانی. دوای ئەوەش چەندین فیلم بەرهەم هێنران وەکو "بازی ئاسنین" (١٩٨٥) و "فەقمەی دەریایی" (١٩٨٥) کە لوبنان و یان رۆژهەلآتی ناوەڕاستیان بە گشتی دەکردە گۆڕەپانی جوگرافیی چیرۆکەکانیان . دانیشتووانی ئەو شوێنانەش لە فیلمەکاندا بە بێ عەقڵ و شەڕانگێز و توندو تیژ وەسف دەکران، بە تایبەتییش دژ بە کەسایەتی و بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و رۆژئاوا. سەبارەت بە فیلمی "باشترین چەك" یش، کە هێزی دەریایی ئەمریکا هاوکارییەکی باشی لە بەرهەمهێنانیدا پێشکەش کرد، داوا لە بەرهەمهێنەرەکانی کرابوو کە وێنەی دیمەنی شەڕەکان لەناو زەدەریادا بگیرێت و لە کاتی وێنەگرتنەکەشدا، ناوچەیەکی سەر زەریای هند کرایە شوێنی رووداوەکان. تێیدا فڕۆکەوانەکانی دوژمن وا نیشان دەدران کە ئەستێرەیەکی سوور لەسەر کلآوەکانیانە،بەلآم

ناسنامەی راستەقینەیان نەزانراوە. لەبەر ئەوەی زەریاکەش لـە رۆژهـەلاتی ناوەڕاسـتەوە نزیکـە، لـە فیلمەکەدا وا مەزەندە دەکرا کە فڕۆکەکان لەو ولاتانەوە هاتبن کە هاوپەیمانی یەکێتی سۆڤێتن.

بێگومان ئەم جـۆرە لـە وێنـاکردنی جیۆپـۆلیتیکی بـە لای عەرەبـە ئەمریکییەکانـەوە مایـەی نیگەرانیە، چونکە هەست بەوە دەکەن کە گروپێکی دیاریکراو بە لایەنگری کردنی تیرۆر و ئەنجامـدانی چالاکی دژ بە ئەمریکا تۆمەتبار دەکرێت. بە هێرش کردنـی هێزەکـانی ئـەمریکاش بـۆ سـەر هێـزە سەربازییەکانی عێراق لە ولاتی کوێت لە کانوونی دووەمـی سـالّی (١٩٩١) دا، ئـەم مەترسـییە زۆر زیادی کرد. لەولاشەوە روون بووەوە کە چیتر یەکێتی سۆڤێت نابێتە هەڕەشەی سـەربازیی جیـددی بـۆ سەر ئەمریکا، بە تایبەتیش کە لە دوای رووخاندنی دیواری بەرلین لە تشرینی دووەمـی سـالّی ١٩٨٩ دا شەڕی سارد بە کردەوە کۆتایی هات. بەلاّم بەو مانایەش نەبوو کـە ئـیتر رووسـیا هـەرگیز نابێتـە هەڕەشە بۆ سەر ئەمریکا. کاتێکیش هۆلّیوود وێنەی یەکێتی سۆڤێتی پێشـووی دوای شـەڕی سـاردی لـە فیلمـەکانی وەکـو "چـاوی زێـڕین" (١٩٩٥)، "هێـزی ئاسمـانی ژمـارە یـەك " (١٩٩٧)، و "ئاشتیخواز" (١٩٩٧) نیشان دەدا، ئەو ولاتە بە شێواو، پارچـە پارچـە، و سەرچـاوەی تـیرۆر وێنـا دەکرا. لە بەرامبەریشدا، هەرچەندە فیلمێکی وەکو "راوکردنی ئوکتۆبەری سوور" (١٩٩٠) مەترسـی ئەگەری هێرشێکی دەریایی یەکێتی سۆڤێتی بۆ سەر ئەمریکا دەوروژاند، بەلاّم باسـی لـە کـاپتنێکی دەریایی سۆڤێت و ئەفسەرەکانی هاوکاری دەکرد کە بـە پەرۆشـن بـۆ هـەلّهاتن بـۆ ئـەمریکا تـا لـە بەرهەمی "خەونی ئەمریکی" سوودمەند بن.

بەر لە هێرشەکانی ١١ی سیپتەمبەری سالّی ٢٠٠١، لە کاتێکدا فیلمـەکانی دوای شـەڕی سـارد باسیان لە کردەوەی تیرۆریستی لـە دژی ئـەمریکا دەکـرد، هاوکـات پێشـبینی کـاری تیرۆریسـتییان دەکرد. کاتێکیش کە لە سالّی ( ١٩٩٣ ) هێرش کرایە سەر سەنتەری بازرگانیی جیهانی و لە سـالّی (١٩٩٦) دا هێرشێکی هاوشێوە دەزگایەکی فیدرالّی لە شاری ئۆکلاهامای کردە ئامانج، کاردانـەوەی هۆلّیوود بە هەمان رادەی هێرشەکانی ١١ی سیپتەمبەر توند و راستەوخۆ نـەبوو. فیلمـەکانی وەکـو "خیرایی" (١٩٩٤) و "بەرد" (١٩٩٦) باسیان لەو کردەوە تیرۆریستییانە دەکرد کە چـەند پـۆلیس و ئەفسەرێکی ئەمریکی وەکو نارەزایی بەرامبەر حکومەتی فیدرالّ و یان چەند دەزگایەکی دیـاریکراوی ئەو حکومەتە ئەنجامیان دابوو. بەلاّم لە فیلمی سینەمایی وەکو "ئەسـتێرەی مەیمونـەکان" (١٩٦٨) دا باس لە وێرانکردنی نیویۆرك کراوە کە تێیدا( ١٩ ) فڕۆکـە رفـێن بـەو کارەیـان مشـت و مڕێکـی گەورەیان دەربارەی ئایندەی ئەمریکا هێنایە ئاراوە. بۆیە ئیدارەی سەرۆك جۆرج بوش هۆلّیوودی وەکـو

یەکێك لە ڕێگاکانی وەڵامدانەوەی ئەو ڕووداوە بەکار هێنا، و دواتریش خودی سەرۆك شـەڕی لـە دژی تیرۆر لە جیهاندا ڕاگەیاند.

بە گشتی، ئەو فیلمانەی باس لە هێرشی تیرۆریستی دەکـەن و پـێش ١١ی سـیپتەمبەر بەرهـەم هێنراون بەڵام دوای هێرشەکان نیشان دراون، بە شێوازێکی جیاواز لە لایـەن بینـەرە ئەمریکییـەکان و خـەڵکی دەرەوەی ئـەمریکاش پێشـوازییان لێ دەکـرا. لـەم ڕووەوە فیلمـەکانی وەکـو "داڕمـانی ناڕاستەوخۆ" (٢٠٢) و " کۆی سەرجەم مەترسییەکان" (٢٠٠١) زۆر بایەخدار بـوون، چـونکە بـاس لەوە دەکەن کە چۆن توندڕەوەکانی کۆلۆمبیا و ڕوسیا سەرکەوتووانە بۆمب لـە شـارە ئەمریکییـەکانی وەکو باڵتیمۆر و لۆس ئەنجیلیس و واشنتون دەتەقێننـەوە. ئەڵبەتـە پلانـی فیلمـی " کـۆی سـەرجەم مەترسییەکان" گۆڕانکاری بەسەردا هات بۆ ئەوەی پسپۆڕە ڕوسییەکان لە کاتێکدا نیشـان بـدات کـە سەرقاڵی گۆڕینی دەزگایـەکی نـاووکی ئیسـرائیلن . ئەمـەش لـە کاتێکـدا ڕوو دەدات کـە دیمـەنی پشتەوەی فیلمەکە ململانێی نێوان ئەمریکا و ڕوسیا لەسەر هەرێمی چیچان نیشان دەدات.

**"لە پشتەوەی هێڵەکانی دوژمنەوە" (٢٠٠١) و**

**پەیوەندییەکانی نێوان ئەمریکا و ئەورووپا**

"ڕۆبەرت کاگان"ی ڕەخنەگری ستراتیجی ئـەمریکی تێبینـی ئـەوەی کـردووە کـە ئـەمریکا و ئـەورووپا بـە شێوازی جیاواز لە چەمکی سیاسەتی جیهانی تێگەیشتوون. بە بۆچوونی کاگان، ئەورووپییەکان لەم بارەیـەوە زیـاتر ئارەزوویان لە فرە جەمسەری و یاسـای نێودەوڵەتییـە بـە پێچـەوانەی ئـەمریکا کـە هێـزی سـەربازی و کـردەی تاکڕەویی زیاتر بەلاوە پەسەندە. فیلمی "لە پشتەوەی هێڵەکانی دوژمنـەوە" ی هۆڵیـوودیش کـە بـاس لەهـەوڵی هێزی دەریایی ئەمریکا دەکات بۆ ڕزگار کردنی فڕۆکەوانێك لـە ناوچـەکانی بۆسـنەی ژێـر دەسـەڵاتی سـربەکان، ڕەنگدانەوەی ئەو تێگەیشتنە جیاوازەیە. لە بەشێکی هەستیاری فیلمەکەدا، فەرماندەیەکی نـاتۆ ( کـە بێگومـان ئەورووپییە)، سزای ئەو ئەدمیراڵە ئەمرکییە دەدات کە سەرکردایەتی هەوڵەکەی کردووە لەبەر ئـەوەی مۆڵـەتی بـۆ ئەنجامـدانی پرۆسـەکە وەرنـەگرتووەو داوایشـی لێ دەکـات کـە پرۆسـەکە ڕابگرێـت. بـەڵام دواتـر ئەدمیراڵـە ئەمریکییەکە لە دیمەنێکدا کە ئاماژەیە بە تەحـەدا کردنـی فەرماندەکـەی نـاتۆ، پرۆسـەکە جێبـەجێ دەکـات و فڕۆکەوانە کەوتووەکەش ڕزگار دەکات. لە کۆتاییدا ئەدمیراڵە ئەمریکییەکە سزا دەدرێت لەبەر پابەند نـەبوونی بـە فەرمانده ئەورووپییەکەوە. بەمەش پەیامی فیلمەکە بریتی دەبێـت لـەوەی کـە هەنـدێك جـار پێویسـتە ئـەمریکا تاکلایەنانە ڕەفتار بکات.

بێگومان دەکرێ باسی زیاتر دەربارەی ئەو فیلمانە بکرێت کە لە دوای ١١ی سیپتەمبەر دەرکەوتن بە فیلمی "یەکگرتوو ٩٣" (٢٠٠٥) یشەوە کە باس لە هەمان هێرش دەکات. لە ئەنجامی بینینی ئەو فیلمانەش چوار دەرەنجام بەرچاو دەکەون:

یەکەم: پیشەسازی فیلمی هۆلیوود هەمیشە و ئێستاش پەیوەندی پتەوی لەگەڵ دام و دەزگاکانی حکومەتی ئەمریکادا هەیە بە تایبەتییش پەنتاگۆن.

دووەم: فیلمەکانی هۆلیوود بە گشتی لە رووی سیاسییەوە خۆپارێزن و هەمیشە رەنگدانەوەی کەش و هەوای باوی سیاسیی ئەمریکان. بۆ نموونە فیلمی وەکو "دکتۆر سترەینج لەڤ" (١٩٦٤)، لە مێژووی سینەمای سەردەمی شەڕی سارد لە ئەمریکا دیار و بەرچاوە،بە تایبەتییش لەبەر ئەوەی گاڵتە بە هەل و مەرجی جیۆپۆلیتیکیی هاوچەرخ دەکات کە لەم حاڵەتەدا بە مانای گاڵتە کردن بە ململانێی ناووکی نێوان یەکێتی سۆڤێت و ئەمریکا دێت. فیلمی "فەرنهایەت ٩/١١" (٢٠٠٤) ی دەرهێنەر (میکل مور) یش هەوڵێك بوو بە شێوازی جیاواز بۆ دروستکردنی کاریگەری لەسەر هەڵبژاردنە سەرۆکایەتیەکەی ئەو ساڵە لە ئەمریکادا. بەلاّم هەولەکە سەرکەوتوو نەبوو، چونکە سەرۆك جۆرج بوش بە سەرۆکی ئەمریکا هەڵبژێردرایەوە سەرەڕای هەولەکانی (مور) بۆ گومان خستنە سەر ئیدارەکەی.

سێیەم: لە کاتی نواندنی شوێنەکان و میللەتەکان لە ناو فیلمدا، پێویستە رەچاوی نیگەرانیی عەرەبە ئەمریکییەکان بکرێت. بۆ نموونە فیلمەکانی وەکو "ئابلۆقە" (١٩٩٨) و "رێساکانی پەیوەندی" (٢٠٠٠)، عەرەب و موسڵمانان بە هەڕەشە بۆ سەر ئەمریکییەکان بە رەش پێست و سپی پێستەوە دادەنێن.

چوارەم: وەکو ئەوەی هەردوو سەرۆکی ئەمریکا رۆناڵد ریگان و جۆرج و. بوش نیشانیان داوە، فیلمەکان کەرەستەیەکی بینراو بۆ هاوولاتیان دابین دەکەن بۆ ئەوەی بزانن بۆچی ئەمریکا پلان بۆ ئەو کردەوە تایبەتییانە دادەنێت. بۆ نموونە، سەرۆك بوش، فیلمی ئێرانی "قەندەهار" (٢٠٠١) ی بەکار هێنا بۆ هێنانەوەی پاساو بۆ دەستتێوەردانی ئەمریکا لە ئەفغانستان و بڕیاری رووبەڕووبوونەوەی سەربازی لەگەڵ رژێمی تالیباندا. لە فیلمەکەدا، ئافرەتێکی ئەفغانی نیشان دەدرێت کە لە کەنەدا دەژێت، بەلاّم نیازی وایە بچێتەوە بۆ ئەفغانستان بۆ ئەوەی بگاتە لای خوشکە خۆکوژەکەی. بە هەر حاڵ، ئافرەتەکە ناگاتە لای خوشکەکەی، بەڵکو ناچار دەبێت وەکو هاوولاتیانی تری ئەو ولاتە رووبەڕووی ژیانی هەژاری و کوێلەمەرگی ببێتەوە.

دیـاره لـه کولتـووریکی خـاوەن ڕاگەیانـدنی چـڕی وەکـو ئـەوەی ئـەمریکا، فـیلم گرنگییـەکی جیۆپۆلیتیکی گشتی بەرچاوی هەیە. زۆربەی هەرە زۆری ئەمریکییەکانیش سەفەری زۆر ناکەن، بۆیـە ئامانجی بەشێکی زۆر لە فیلمەکانی دوای ١١ی سیپتەمبەر بریتیە لـە دڵنیاکردنـەوەی خـەڵکی ئـەو وڵاتە لە سەردەمێکدا کە بە نیگەرانی و نەبوونی متمانـە ناسـراوە. بـە گشـتی، ئامـانجی فیلمـەکان بریتیە لە پتەوکردنی هەستی جوگرافی و ئەخلاقی تایبەت لە وڵاتدا (وەکـو قوربانییـەکی بـێ تـاوانی دەستی تیرۆر)، وەکو چۆن فیلمەکانی سەردەمی شەڕی سارد ئاماژەیان بە "هەڕەشەی سوور" دەکرد.

## میدیای هەواڵ و چوارچێوەی جوگرافی: کەناڵی ئەلجەزیرە بە نموونە

چەمکی چوارچێوە لە لێکۆڵینەوەی میدیاییدا بۆ ئەوە گەشەی کردووە تا روون بکرێتەوە کە چـۆن ڕاگیاندن سەرنجی رای گشتی بـەرەو لای چـەند بابـەتێکی دیـاریکراو رادەکێشـێت. بەمـەش دانـانی چوارچێوە، تەرکیز لەسەر ئەوە دەکات کە چۆن رۆژنامەنوسـان و رێکخراوەکـانی تایبـەت بـە میـدیا، هەواڵەکان رێـك دەخـەن و پێشکەشـیان دەکـەن. ئەمـەش لـە ئەنجامـدا کـار دەکاتـە سـەر جـۆری تێگەیشتنی خوێنەر و بینەر بۆ ئەو ڕووداو و بابەتانە. دانانی چوارچێوەی وەك "شـەڕی دژە تـیرۆر" و "شەڕی دژ بە مادده هۆشبەرەکان" مانای تایبـەتی خۆیـان هەیـە کـە هەنـدێگ تێگەیشـتن لەسـەر حسابی هەندێکی تر روون دەکەنەوە. بـە هـەمان شـێوە دەکـرێ ئـەو وەسـفەی کـە لەسـەر بنـەمای شوێنێکی جوگرافی دەکرێت، زۆر گرنگ و بایەخدار بێت لە دەستنیشـانکردنی بابـەتێکی دیـاریکراو. ئەمەش بە تایبەتی کاتێك گرنگتر دەبێت کە ناوچەیەك جێگای ناکۆکی بێت و گروپە پێك ناکۆکـەکان بە شێوەی جیاواز ناوزەدی بکەن. بۆ نموونە، بیر لەو توڕەبوونـە جەماوەرییـە بکـەرەوە ئەگـەر جارێـك تەلەفزیۆنی ئەرجـەنتین نـاوی "دوورگـەکانی فۆکلانـد" ی بـەکار هێنـا بـۆ ئامـاژە کـردن بـە نـاوە ئەرجەنتینییەکەی، واتا ئیسـلاس مالڤینـاس. ئـەو حاڵەتـە، ئەگـەر روو بـدات، ئـەوا بـە دوور لـە نیشتمانپەروەری دەژمێردرێت، بە تایبەتی کە حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی ئەرجەنتین هەمیشـە ناڕەزایی دەردەبڕن کە ئەو دوورگانە لە ساڵی ١٨٣٣ بە شێوەی نایاسـایی لکێنـراون بـە بـەریتانیاوە. هەمان تووڕەبوونیش دروست دەبێت ئەگەر میدیایەکی فەلەستینی لـە جێگـای کـەرتی رۆژئـاوا یـان زەوییە داگیرکراوەکان، وشەی وەکو جودی و سامارىا بەکار بێنێت (دوو وشەی ئیسـرائیلین بـۆ ئامـاژە کردن بۆ ئەو دوو ناوچەیە——وەرگێڕ).




٢٥. پۆستەری فیلمی "یەکگرتوو ٩٣"

ئەڵبەتە پەخشی تەلەفزیۆنیی سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ دانانی چوارچێوە، بە تایبەتییش ئەو کەناڵانەی کە پەخشی نێودەوڵەتییان هەیە و خاوەن بینەری زۆرن لە سەرانسەری جیهاندا وەکو CNNوBBC. دەزگای هاوشێوەشیان بریتیە لە کەناڵی هەواڵی ئەلجەزیرە کە لە وڵاتی قەتەرەوە پەخش دەکات و لە ساڵی ١٩٩٦ دامەزراوە. کەناڵەکە بە پشتیوانیی ئەمیری قەتەر، لە وڵاتێکی بچووکی کەنداوەوە پەخش دەکات کە خاوەن زۆرترین بڕی گازی سروشتییە لە جیهاندا . هەروەها بنکەیەکی گەورەی ئاسمانی ئەمریکاش لەو وڵاتەدایە کە پێشتر بەکار هێنرا بۆ هێرش کردنە سەر

عێراق لەساڵی ٢٠٠٣دا. ئەلجەزیرە بە پێچەوانەی کەناڵە عەرەبییەکانی دیکەوە، بە خێرایی ناوبانگێکی جیهانیی پەیدا کرد بە هۆی پەیڕەو کردنی شێوازی نوێ لە پەخشکردنی هەواڵەکان و بەرنامەکانی تر لە وڵاتێکەوە کە لە ساڵی (١٩٩٨ ) ەوە وەزارەتی رۆشنبیری تێیدا هەڵوەشاوەتەوە. ئەمەش مانای وایە کە رۆژنامە و رادیۆ و تەلەفزیۆنەکان لە ژێر سانسۆری حکومەت دەرچوون و رادەیەکی زیاتر لە ئازادییان بەدەست هێناوە. بێگومان ئەو کەناڵە گرنگترین هۆکاری راگەیاندنە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، چونکە لەو ناوچەیەدا خوێندنەوەی رۆژنامەو گۆڤار بە بەراورد لە گەڵ ۆوژئاوادا لە ئاستێکی نزمدایە.




٢٦. گرتەیەك لە کەناڵی ئەلجەزیرەوە. ٢٠٠٦/٩/٧

کەناڵی ئەلجەزیرە بە رواڵەت بایەخ بەو رەخنانە نادات کە وڵاتە ئیقلیمییەکانی وەکو میسر و سعودیە ئاراستەی دەکەن، بەڵکو چەندین بەرنامەی رێچکەشکێنی وەکو : رووی پێچەوانە، تەنها بۆ ئافرەتان، (زیاتر لە یەك راو بۆچوون) ی داهێناوە کە باس لە بابەتی پڕ گرفتی کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسی دەکەن وەکو بابەتەکانی مافی ئافرەت و توندڕەوی ئیسلامی. ناوبانگی میدیاکارو پێشکەشکارەکانی کەناڵەکەش وەکو دکتۆر فەیسەڵ ئەلقاسم گەیشتووەتە زۆربەی ماڵەکان نەك تەنها لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەڵکو لە ناو عەرەبەکانی تاراوگەش لە ئەمریکای باکور

و ئەوروپا و شوێنەکانی دیکەی جیهان. هەروەها یەکەم کەناڵی هەواڵی عەرەبییشە کە دەرفەتی قسە کردنی بە زمانی عیبری بە وەزیر و بەرپرسە فەرمییەکانی حکومەتی ئیسرائیل دابێت.

بێگومان ئەوەی زیاتر کەناڵی ئەلجەزیرەی بەناوبانگ کرد، بریتی بوو لە رووماڵکردنی هەڵمەتی بۆمبارانکردنەکەی عێراق لە لایەن ئەمریکا و بەریتانیاوە لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٨. لە پرۆسەکەدا کە بە "ئۆپەراسیۆنی رێوی بیابان" ناوزەد کرا (ئەو ناوەی کە جەنەراڵی ئەڵمانی "رۆمل" لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا بەکاری هێنا)، کەناڵی ئەلجەزیرە لە ژێرنوسی شاشەکەیدا کاریگەری ٧٠ کاتژمێر لە هێرشی بەردەوامی مووشەکیی بۆ سەر بەغداو شوێنەکانی دیکەی عێراق نیشان دەدا. ئەو ژێرنوسانەش بە خێرایی دەفرۆشرانە کەناڵەکانی دیکە لە سەرانسەری جیهاندا. رژێمی سەدام حوسێن کە هەستی بە ناوبانگی بەربلاوی کەناڵەکە کرد لە ریزی خەڵکی عەرەب زماندا، چەند بەرپرسێکی نارد کە توانای قسەکردنیان بە ئینگلیزی هەبوو وەکو جێگری سەرۆك وەزیران "تاریق عەزیز" بۆ ئەوەی کاریگەری هێرشەکان بۆ بینەران روون بکەنەوە و لە کاریگەری هەواڵەکانی ئەلجەزیرە لەسەر بینەران کەم بکەنەوە. هەرچەندە ئەو کەناڵە رەخنەی زۆری لێ دەگیرا لە ناوچەکەو لە شوێنەکانی دیکەشەوە و بە زمانحاڵی پڕوپاگەندەی رژێمەکەی سەدام تۆمەتبار دەکرا، بەلاّم ئەو ژێرنوسانە رۆڵی گەورەیان دەبینی لە وێناکردنێکی جوگرافیی جیاواز بۆ عێراق. لەگەڵ ئەوەی میدیای بەریتانی و بەتایبەتیش ئەمریکی رەخنەیان لە کارە درندانەکانی رژێمی عێراق دەگرت، بەلاّم ئەو شریتە هەوالاّنە عێراقیان وەکو شوێنێکی خاوەن شارستانی نیشان دەدا کە تێیدا خەڵکی سیڤیل لە هەمان کاتدا بوونەتە قوربانی گەمارۆی سەپێنراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و بۆمبارانی هێزە رۆژئاواییەکان.

کاتێکیش ئەلجەزیرە بووە کەناڵی پەسەندکراو لە لای ئوسامە بن لادن و هاوڕێکانی، ئیتر ناوبانگی زیاتری پەیدا کرد. لە ساڵی ١٩٩٨دا، ئەلجەزیرە چاوپێکەوتنێکی لە گەڵ بن لادن پەخش کرد کە( ٩٠ ) خولەکی خایاند و دواتریش چەندین جار لە سەر شاشەی کەناڵەکەوە لە ساڵی ١٩٩٩دا نیشان درایەوە. ئەم چاوپێکەوتنانە لەگەڵ بن لادن و وەزیرە عێراقییەکاندا چەند وڵاتێکی ناوچەکەی وەکو سعودیە و کوێتی نیگەران کرد، چونکە هەستیان دەکرد ئەو کەناڵە ناوبانگی زیاتر بۆ تیرۆریست و دیکتاتۆرەکان پەیدا دەکات. بەلاّم بینینی ئەو بەرنامانە وێنەی سیاسی و جوگرافیی ئەو کەس و رژێمانەی کە پێشتر وەکو بێ لۆجیك و شەڕانگێز و تەنانەت شێتیش وەسف دەکران، پێچەوانە دەکردەوە. بۆ نموونە،جێگاکەی بن لادن لە ناو ئەشکەوتێکدا لە ئەفغانستان دەبووە هۆی تیشك

خستنه سەر ژیانی سادەی ئەو کەسایەتییە بـە پێچـەوانەی ژیـانی سـەرکردەی ڕژێمـەکانی میسـر و سعودیە و پاکستان کە بن لادن بە گەندەڵ و ریسوا و غەیرە ئیسلامی ناوی دەهێنان.

بە هەمان شێوەی رووماڵکردنی راپـەڕینی فەلەسـتینییەکان لـە سـاڵی ۲۰۰۱دا، ژێرنوسـەکانی کەناڵی ئەلجەزیرە دەربارەی راپەڕین لە کەرتی رۆژئاوا و دواتـریش کاردانـەوەی هێـزە سـەربازییەکانی ئیسـرائیل زۆر کاریگـەر بـوون لـە بەرزکردنـەوەی راددەی بایەخـدانی نێودەوڵـەتی بـە ناوچـەکە و دانیشوانەکەی. ئەو ژێرنوسانە تـەنها حکومەتـە عەرەبییـەکانیان نەدەخسـتە ژێـر فشـارەوە، بـەڵکو ئەمریکا و ئیسرائیلیشیان ناچـار کـرد کـە پێداچـوونەوە بـە سـتراتیجییەتی راگەیانـدنی خۆیـان لـە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا بکـەن. لـە ئەنجامیشـدا دەسـەڵاتی راگەیانـدنی ئیسـرائیلی دەسـتی دایـە پێشخستنی بەرنامەکانی ئەو کەناڵە عەرەبییەی کە لە ئیسرائیلەوە پەخشی دەکـرد. بـەڵام لـە کـاتی خودی راپەڕینەکەدا، دەسەڵاتدارانی فەلەستینی بە شێوەی کاتی نوسینگەی کـەناڵی ئەلجـەزیرەیان لـە رامەڵا داخست. ئەوەش وەکو نارەزاییـەك بەرامبـەر بەرنامەیـەك کـە بـەردەوام لەسـەر رێکخـراوی رزگاریخوازی فەلەستین ( فەتح) لە دوای داگیرکردنی لوبنان لە لایـەن ئیسـرائیلەوە لـە سـاڵی ۱۹۸۲ پەخش دەکرا. سەرەڕای ئەو هەنگاوەش، کەناڵەکە بەردەوام بوو لە پێداهەڵدان بـە گـەلی فەلەسـتین و وروژندن و پاڵەپستۆ خستنە سەر حکومەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە بێ جیاوازی.

لە ئەنجامی رووماڵە ژێرنوسییەکەی ئەلجەزیرە لە ئەفغانستان و عێراقدا، کەناڵەکە بـووە جێـی رق و کینەی بەرپرسانی ئەمریکا و بەریتانیا، لەبەر ئەوەی وێنەی ئەو قوربانییانەی بڵاو دەکردەوە کـە بـە بۆمب و مووشەکی هێزە هاوپەیمانەکان دەکوژران. هەروەها ئاماری زەرەر و زیانی هێـزی هاوپـەیمانانی بڵاو دەکردەوە کە بزوتنەوەی تاڵیبان و هێزە بەرهەڵستکارەکانی ئەو دوو وڵاتە رایاندەگەیانـد. وادیـارە هەر لەبەر ئەو هۆیانەش بوو کە لە کردەوەیەکی ناجوامێرانەدا، نوسـینگەی کـابولی کەناڵەکـە کرایـە ئامانجی مووشەکێکی ئەمریکی و تێیدا پەیامنێرێك کوژرا. دواتریش ئیدارەی سەرۆك بوش نـارەزایی لە بەرامبەر راپۆرتی پەیامنێرەکانی کەناڵەکە دەربڕی گوایـا دوورن لـە رێسـا و سیسـتمەکانی کـاری رۆژنامەوانییەوە. ئەم هێرشە درووست لە کاتێکدا هات کە حکومەتی ئەمریکا لـە دوای هێرشـەکانی ۱۱ی سیپتەمبەر سەرقاڵی هەڵمەتێکی دیبلۆماسی بوو بۆ دڵنیاکردنـەوەی موسـڵمانانی جیهـان کـە ئەمریکا پێشوازی لە موسڵمانانی نیشتەجێی ئەو وڵاتە دەکات و بە بەشێك لە کۆمەڵگای ئـەمریکی لە قەڵەمیان دەدات. بەڵام بە هاتنی ساڵی ۲۰۰۲، دەرکەوت کە هەڵمەتی "نەریتە هاوبەشەکان" کـە جێگری وەزیری دەرەوە بۆ سیاسـەتی گشـتی (چـارلۆت بیـەرز) دەسـتی پێکردبـوو، کاریگەرییـەکی ئەوتۆی لەسەر بۆچوونی رای گشتیی عەرەب بەرامبەر ئەمریکا دروست نەکردووە.

بێگومان گرنگترین میراتی تایبەت بە چوارچێوەی جوگرافی، بریتیە لەو شێوازەی بن لادن بەکاری دەهێنا بۆ بەردەوام بوون لە سوود وەرگرتن لـە کـەناڵی ئەلجـەزیرە لـە پەخشـکردنی پەیامـەکانی بـۆ سەرانسەری جیهان. دیارە بە هۆی خێرایی تۆڕی پەیوەندیی بێ تەلی مۆدێرنەوە، بارەگاکـەی بـن لادن لە ئەفغانستان شوێنێکی گونجاو بوو بۆ بەکارهێنانی میدیا بە مەبەستی ڕەوانە کردنـی پەیامـەکانی. ئـەو پەیامانـەش هەسـتی دژە ئـەمریکا و دژە ئیسـرایلیان لـە ناوچـەکەدا زیـاتر دەوروژانـد. لـە چاوپێکەوتنێکیدا لە گەڵ پەیامنێری ئەلجەزیرە "تەیسیر عەلونی" کـە لـە تشـرینی یەکـەمی سـاڵی ٢٠٠١ تۆمار کرابوو، بن لادن دووپاتی کردەوە کە هێرشەکانی ١١ی سـیپتەمبەر لـە دژی ئـەمریکا تەنها بەرگری لەخۆ کردن بووە بەرامبەر سیاسەتی دووفاقانەی ئەمریکا لەمەڕ داگیرکردنـی فەلەسـتین لە لایەن ئیسرائیل لە لایـەك و هێرشـە کۆلۆنیالیییـە تازەکـەی خـودی ئـەمریکا بـۆ سـەر عێـراق و ئەفغانستان لە لایەکی ترەوە. هەرچەندە بەشـێکی زۆر لـە کۆمـەڵگا و حکومەتـەکان ڕەخنـەیان لـە پشتیوانی کردنی بن لادن لە تیرۆر دەگرت، بەڵام وەڵامـەکانی بـن لادن هەمیشـە سـتەم کردنـی لـە وڵاتانی وەکو فەلەستین و عێـراق و بۆسـنەی لـە رووی جوگرافییـەوە پێکـەوە دەبەسـتەوە. ئەمـەش لایەنگری زیاتری بۆ پەیدا دەکرد بە تایبەتی لە وڵاتانی وەکـو میسـر و پاکسـتان کـە هەمیشـە بـە پاشکۆی سیاسەتی ئەمریکا دەناسرێن.

ئەوەی مایەی نیگەرانی زیاتر بو بۆ ئیدارەی سەرۆك بوش ئەوەبوو کە دەستنیشانکردنی خـەڵاتی ( ٥) ملیۆن دۆلاری ئەمریکی بۆ هەر کەسێك بن لادن بگرێت، بـە ئـەنجام نەگەیشـت و نـاوبراو تـوانی ببێتە تەحەدایەك بۆ چوارچێوەی جـوگرافی ئـەمریکا وەکـو ""وڵاتێکـی خـاچ پەرسـت". شـێوازی تایبەتی بن لادنیش بۆ جیۆپۆلیتیکی گشتی، چەندین چەمکی جیاواز دەگرێتـەوە وەکـو: ئامـاژەکردن بە جوگرافیای دەرەوەی سنوورەکان، لێکچـوونی مێـژوویی، ڕەخنـە گـرتن لـە کۆلۆنیـالیزم و کتێبـە ئاسمانییەکان و هەروەها نەریتی کلاسیکیی ئیسلام. وا دیارە بن لادن، بە سوود وەرگـرتن لـە هەواڵـە ژێرنوسەکانی کەناڵی ئەلجەزیرە دەربارەی ئەفغانستان و عێراق ە فەلەستین و هەروەها میدیای بینـراوی وەکو گرتەی ڤیدیۆی تایبەت بە کردەوە خۆکوژییەکان لە تەلـەفزیۆن و ئینتـەرنێت، تـوانی وێنەیـەکی تەواو جیاوازی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامی بـە گشـتی پێشـکەش بکـات کـە لـە ژێـر مەترسی و هەڕەشەی دەستتێوەردانی ڕۆژئاوادایە. بێگومان بەکار هێنانی وشەی "خاچ پەرسـت" لـە لایەن بن لادنەوە زۆر گرنگ بوو، چونکە بە ئاسانی دیمەنی سەربازە مەسـیحییەکانی دەهێنایـە پـێش چاو کە لە چوارچێوەی هەڵمەتی خاچ پەرستاندا لـە سـەدەکانی ١١ تـا ١٣ هێرشـیان دەکـردە سـەر

نەتەوە موسڵمانەکانی باشووری ڕۆژئاوای کیشوەری ئاسیا. بە گشتی هەڵبژاردنی پەیوەندییە جوگرافی و مێژووییەکان بە خاڵێکی گرنگ و پڕ بایەخ لە پەیامەکانی بن لادندا هەژمار دەکرێت.

## ئینتەرنێت و جیۆپۆلیتیکی گشتیی تایبەت بە ئۆپۆزسیۆن

گەشەو پێشکەوتنی ئینتەرنێت لە ساڵانی هەشتاکانەوە بووەتە جێگای خۆشحاڵیی بەرفراوانی هەموو لایەك، لەبەر ئەوەی هانی کارلێکی زیاتری کۆمەڵایەتی و نزیککردنەوەی دوورییە جوگرافییەکان دەدات. لەم بارەشەوە ئەمریکا خاوەن گەورەترین کۆمەڵگای بەکاربەری ئینتەرنێتەو لە هەمان کاتدا گرنگترین بەرهەمهێنەری زانیارییشە لە جیهاندا. دیارە لەم رووەوە جیاوازی بەرچاوی نێوان ئەمریکای باکوور، ئەوروپا، و رۆژهەڵاتی ئاسیا لە لایەك و بیابانی ئەفریقا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە لایەکی ترەوە زۆر روون و ئاشکرایە، هەرچەندە خەریکە بەکارهێنانی ئینتەرنێت لە ئەفریقا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش وەکو بەشەکانی دیکەی جیهان روو لە زیادبوون دەکات. ئێستا دەزگا بەهێزەکانی گەڕان وەکو گوگڵ یارمەتی بەکارهێنەران دەدەن کە هەواڵ و وێنەی جۆراوجۆر لە تەنها چەند چرکەیەکدا دابەزێنن. دەرەنجامی ئەو کارەش لە نێوان ئەرێنی و نەرێنیدایە: لە لایەکەوە مەترسی لە دروستبوونی گێرەشێوێنی و یاخیبوون هەیە لە ئەنجامی بەردەستبوونی کەرەستەی خراپ بۆ ئەو کەسانەی کە نیازی دەستگەیشتنیان بە کۆمەڵگا تازەکان هەیە کە ئەمەش بە کارێکی نەرێنی لە قەڵەم دەدرێت. بەڵام لە لایەکی ترەوە، بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی درووست و بۆ پتەوکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی دەرەنجامێکی ئەرێنی ئەو کەرەستە مۆدێرنەیە. ئەڵبەتە ئەم دۆخە دەرفەت بۆ هەموو جۆرەکانی چالاکی بە چالاکیی تۆڕە تیرۆریستییە جیهانییەکان و تازە نازییەکانیشەوە دەخولقێنێت تا نەش و نما بکەن. ئەوەتا دەبینین چۆن رێکخراوی قاعیدە تۆڕی ئینتەرنێتی بەکار هێناوە بۆ دابینکردنی خەرجی، ناردنی پەیامی نهێنی بۆ ئەندامەکانی، بڵاو کردنەوەی وتاری ڤیدیۆیی سەرکردەکانی، و هەروەها بۆ برەودان بە چالاکییەکانی لە سەرانسەری جیهاندا. بەڵام ئەم تەکنەلۆجیا تازەیە گرفت بۆ حکومەتە نا دیموکراتییەکان دروست دەکات لە رووی چاودێری کردن و کۆنترۆڵکردنەوە، چونکە هەتاکو ئەگەر ئەو حکومەتانە بتوانن ماڵپەڕێکیش دابخەن، ئەوا هەر زوو ماڵپەڕەکە بە ناونیشانێکی تازەوە دووبارە دەرکەوێت.

بەڵام ئینتەرنێت بووەتە هۆکارێکی گرنگ بۆ بزوتنەوەی دژە جیهانگەراییش و دەرفەتی بۆ خولقاندووە تا لە لایەکەوە تەحەدای دەسەڵاتی ماددی وڵاتان و کۆمپانیاکان و دامەزراوە وابەستەکان بە سیستمی سیاسی و ئابووری باڵادەستەوە بکات، و لە لایەکی ترەوە کێبڕکێ لەگەڵ نواندنی

خوێنراو یان بینراوی تایبەتی ئەو نەخشە بالاَدەستانەدا بکات. سەبارەت بە حاڵەتی یەکەم، بزوتنـەوەی دژە جیهانگەرایی، رۆژی جیهانیی بۆ ئەنجامدانی هەڵمەت لە دژی جیهانگەرایی دەستنیشـان کـردووە بە تایبەتییش لەو شارانەی کە میوانداری کۆبوونەوەی گەورەی وەکـو ئەوانـەی ڕێکخـراوی بازرگـانیی جیهانی، سندوقی نەختی نێودەوڵەتی، و گروپی ( ٨ ) دەکەن. هـەروەها ئینتـەرنێت ئاسـانکاری بـۆ گەشەکردن و پێشکەوتنی تۆڕە کۆمەلاَیەتییـەکانی وەکـو "کـاری جیهـانیی میللـی" و "کۆڕبەنـدی کۆمەلاَیەتی جیهانی" کردووە، کە کار بـۆ کۆبوونـەوەی چـالاکوانانی جیهـان دەکـەن بـە مەبەسـتی دۆزینەوەی جێگرەوە بۆ لیبرالیزمی تازە و چارەسەرکردنی پرسە نێوخۆییـەکانی وەکـو بەتایبـەتکردنی ئاو لە ئەفریقا، خاوەندارێتی زەوی لە مەکسیك، و کاریگەریی قـەرزە بیانییـەکان لەسـەر ئـەمریکای لاتین.

(کـاری جیهـانیی میللـی: بزوتنەوەیـەکی کۆمەلاَیـەتی رادیکالییـە کـە هەڵمـەت لـە دژی سەرمایەداری ئەنجام دەدات و بەشـێکە لـە بزوتنـەوەی دژە جیهانگـەرایی. کۆڕبەنـدی کۆمەلاَیـەتی جیهانی: کۆبوونەوەیەکی سالاَنەی ڕێکخراوە ناحکومییەکانی کۆمەڵگای مەدەنییـە کـە هەوڵـەکانیان لە دژی جیهانگەرایی چڕ دەکەنەوە--- وەرگێڕ) .




٢٧. سەندیکاکانی کرێکاران و لایەنگرانیان لە خۆپیشاندانداندا لـە کـاتی کۆبوونـەوەی ڕێکخـراوی بازرگانیی جیهانی لـە شـاری سـیاتڵی ئـەمریکی لـە سـاڵی سـاڵی ١٩٩٩. خۆپیشـاندانە ئاشتییانەکە دواتر لەلایەن پۆلیسەوە سەرکوت کرا.

بە گشتی ئینتەرنێت دەرفەتی بۆ ئەو تاك و گروپانی خولقاندووە کە پابەندن بە دەربڕینی نــاڕەزایی بەرامبەر شێوازەکانی لیبرالێزمی تازەی جیهانگەرایی، بــۆ ئــەوەی ئــەزموون و پلانــەکانیان ئــاڵوگۆڕ بکــەن و بــە شــێوەیەکی خێراتــر تیشــك بخەنــە ســەر رووداوە پێشــبینی کراوەکــانی ئاینــدە. ئــەو خۆپیشاندانانەی کە لە کاتی کۆبوونەوەی رێکخراوی بازرگانیی جیهانی لە شاری سیاتلی ئەمریکی لــە تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٩ ئەنجام دران، هاوکات بوون لەگەڵ ئەوەی پێــی دەوتــرا جموجوڵ و ناڕەزایی ئەلیکترۆنی. هەروەها توانای ئینتەرنێت لە بلاّو کردنــەوەی وێنــە شــان بــە شــانی بابەتە رەخنەییەکان، گرنگ بوو بۆ ئەو گروپانە تا لە رێگایانەوە بۆچوونی تایبەتی خۆیــان بخەنــە روو. ئەمەش لە کاتێکدایە کە زۆربەی ئەنجامدەرانی ئەو هەڵمەتانە بەدەست میدیای حکومییەوە دەنــاڵێنن کە هەوڵ دەدات ناڕەزاییەکان و داواکارییەکانیان بــۆ ئەنجامــدانی ریفــۆرمێکی بنــەڕەتی لــە ئــابووری جیهانی تازە-لیبراڵدا پشتگوێ بخات. رەخنەی دیکەش لە میدیای حکومی ئەوەیە کــە خزمــەت بــە دامەزراوەکانی وەکو رێکخراوی بازرگانیی جیهانی و گروپە بەهێزەکانی وەکو گروپی ( ٨ ) دەکات.

یەکێکی تر لەو چالاکیانەی کە ئینتەرنێت و میدیاکانی دیکــە رۆڵــی تێــدا دەبیــنن، بریتیــە لــە بەربەرەکانێ کردنی سیستمی ئابووری-سیاسی لە جیهانی بالاّدەســتدا. بــە بۆچــوونی بزوتنــەوە دژە-جیهانگەراییەکان، دەزگــای پەخشــی تەلــەفزیۆنی تایبــەت بــە کۆبوونــەوەکانی لوتکــەی رێکخــراوی بازرگانیی جیهانی و گروپی ( ٨ ) کار بۆ پتەوکردنی جیۆپــۆلیتیکی لیبراڵێزمــی تــازە دەکــات نــەك تەحەدا کردنی ئەو جیۆپۆلیتیکە، چونکە لەو پەخشــە تەلەفزیۆنیانــەدا، بایــەخی زیــاتر بــە ســەرۆکی وڵاّتان و شاندەکانیان دەدرێت بە پێچەوانەی گروپە ناڕازییەکان کــە وەکــو بەشــێکی زیــادە و پــەراوێز خراو نیشان دەدرێن. لــەوەش خــراپتر، لــە دوای هێرشــەکانی ١١ی ســیپتەمبەر، ئــەو تەلەفزیۆنانــە گروپەکانی دژ بە جیهانگەراییان وەکو تەحەدایەکی ئاسایشی نیشان دەدا کە پێویســتە ســنووریان بــۆ دابنرێت. لەبەر ئەوەی کە خاوەندارێتی میدیا خەریکــە زیــاتر لــە دەســتی دەزگاکــانی وەکــو "نیــوز ئینتەرناشناڵ" کۆ دەبێتەوە، بۆیە لەوانەیە ئەو رەوتە زیاتر پــەرە بســێنێت لــە جێگــای ئــەوەی کــەم ببێتەوە یان لاواز ببێت. وادیارە ئابووریە بەهێزەکانی وەکو ئەوانەی ئەمریکا و ژاپۆن، ئــارەزوو دەکــەن پشتیوانی لە بارودۆخی ئابووری- سیاسی سەردەم بکەن. ئەمــەش بــە مانــای پشــتیوانی کردنــە لــە نەخشەی سیاسی وابەستە بەو بارودۆخەوە کە یارمەتی دروستبوونی کارلێك لــە نێــوان ناوچــەکان لــە لایەك و هاتوچۆی خەڵك و وەبەرهێنان و بازرگانی لە لایەکی ترەوە دەدات.

بە گشتی ماڵپەڕ و سەرچاوەکانی دیکەی میــدیا هەمیشــە بــۆ نیشــاندانی وێنەیــەکی جیــاوازی جیهان بەکار دەهێنرێن- جیهانێك کە تێیدا دەوڵەمەندترین خەڵك کە تەنها ٢٠٪ ی خــەڵکی جیهــان

پێـك دێـنن، خـاوەن ٩٠٪ ی داهـاتی ئـەم جیهانـەن! هـەروەها ئـەو ماڵپەڕانـە هـانی سـازدەرانی هەڵمەتەکانی نارەزایی دەدەن کە هەواڵ و وێنە پێشکەش بکەن دەربارەی چالاکیی رۆژانە لـە جیهـان و بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی شوێنەکان و پەیوەندیی جوگرافییان لە گەڵ پرۆسە جیهانگەراییەکانی وەکـو بازرگانی و وەبەرهێنان و قەرزە دەرەکییەکانـدا. بـۆ نموونـە، بزوتنـەوەی زاباتیسـتا لـە مەکسـیك و سەرکردایەتییەکەی سەرقافڵەی بەشی زۆری ئەو وەبەرهێنانە بوون لە بـواری ئینتـەرنێت و جۆرەکـانی تری میدیا. لە سەرەتای سالأنی نەوەتەکانیشدا، بزوتنەوەکە ئەوەی خسـتە روو کـە میـدیا تـوخمێکی زۆر گرنگ بووە لە خەبات و هەوڵدان بۆ بەرەنگار بوونەوەی حکومـەتی مەکسیك، بازارەکـانی دارایـی نێودەوڵەتی، و سیستمی ئابووری جیهانییش. بەلأم ئەو شێوازە بەکارهێنانـەی ئینتـەرنێت لـە لایـەن زاباتیستاوە جێگای سەرسوڕمان بوو، چونکە ئەو کاتە پەیوەندی ئینتەرنێـت لە باشـووری مەکسـیك زۆر لاواز بوو. بەلأم لە ماوەی دوو ساڵ لە هێرشی پێچەوانەی بزوتنەوەکە بۆ سـەر لیبراڵیزمـی تـازە، بەڕێوەبەرانی بزوتنەوەی ناوبراو بە بەکارهێنانی ئینتەرنێت و ئیمەیل، زنجیرەیەك کۆبوونـەوەیان لەسـەر ئاستی کیشەوەرەکان ولەسەر ئاستی نێودەوڵەتییش لـە سـالأنی ١٩٩٦ و ١٩٩٧ دا رێکخسـت کـە هەزاران کەسی وەکو بەرهەمهێنەری فیلمـی ئـەمریکی "ئۆلیڤـەر سـتۆن" بەشـدارییان تێـدا کـرد. هەروەها "مارکۆس" ی سەرکردەی کاریزماتیکی زاباتیستا، ئینتەرنێتی بۆ ناساندنی داواکارییـەکانی رێکخراوەکەی لە دژی بێبەش کردنی خەڵك لـە خاوەنـدارێتی زەوی، بـە پاشـکۆ کردنـی ئـابووری، و جیاوازی نەژادیی بەکار دەهێنا . لە هەمان کاتـدا هـانی پتـەوکردنی هەماهـەنگی لـە نێـوان تـۆڕە ئەلیکترۆنییەکان لە مەکسیك و ئەمریکای لاتین و شوێنەکانی تری جیهان دەدا. ئەڵبەتـە ئینتـەرنێت بووەتـە کەرەسـتەیەکی گـرنگ بـۆ بـەردەوام بـوونی خـەباتی بزوتنەوەکـە و هـەروەها رێگایـەکی سەرکەوتوویشە بۆ پشتیوانی کردنی تاك و گروپەکانی تر تا بتوانن تێگەیشـتنی جیـاواز بـۆ ئـابووری جیهانی، بازارەکانی دارایی نێودەوڵەتی، و ئابووری مەکسیکیش دروست بکەن.

گومان لەوەدا نییە کە کۆنترۆڵکردنی ئەو زانیارییانەی لە رێگـای ئینتەرنێتـەوە بـلاۆ دەکرێنـەوە کارێکی زۆر دژوار و گرفتاوییە، بە تایبەتی بە هۆی هەوڵی بەردەوامی هاککـەرەکان بـۆ لاواز کردنـی خۆپارێزیی دامەزراوە حکومییەکان لەم بارەیـەوە. لـە دوای هێرشـەکانی ١١ی سـیپتەمبەری سـاڵی (٢٠٠١ ) یش، کۆنگریسی ئەمریکا "یاسای نیشتمانی" ی پەسـەند کـرد کـە دەرفـەت بـە دەزگـا جێبەجێکارەکان و ئاژانسە سەرەکییەکانی وەکو ئاژانسـی ئاسایشـی نیشـتمانی دەدات تـا چـاودێری ئاڵوگۆڕی ئینتەرنێت و ئیمەیڵی ئەو کەسانە بکەن کە گومانی ئەوەیان لێ دەکرێت چالاکی زیانبـەخش بە بەرژەوەندی ئەمریکا ئەنجام دەدەن. ولأتانی تری وەکو بەریتانیاش لـە لای خۆیانـەوە هـەوڵیان داوە

كە چاودێری و كۆنترۆڵی زانیاریی كەسە جێی گومانەكان بكەن. ئەڵبەتە چاودێری كردنی تاك و گروپەكان بە ناوی دژە تیرۆرەوە، زۆر گرنگ بووە بۆ ئەو حكومەتانەی كە هەوڵ بۆ گەڕاندنەوەی نەخشەی جیۆپۆلیتیكی ولاَتە خاوەن سەروەرییەكان و سنوورەكان و هەرێمە نیشتمانییەكان دەدەن. بۆ نموونە حكومەتی چین سوور بووە لەسەر ئەوەی كە "گوگڵ" ە چینییەكە رێگای لە دەستكەیشتنی بەكاربەران بە ماڵپەڕەكانی لایەنگری دیموكراسی و وێنەكانی كوشتارگەی گۆڕەپانی (تیانانمین ) لەو ولاَتە گرتووە. بەلاَم ژمارەیەك لە هاككەرەكان كە زۆربەیان لە ئەمركادان وەكو (www.cultdeadcow.com)، هێشتا سوورن لەسەر هەوڵەكانیان بۆ شكاندنی ئەو دیوارە ئەلیكترۆنییەی كە حكومەتی چین بەمەبەستی رێگا گرتن لە دەستگەیشتن بە ماڵپەڕە قەدەغەكراوەكان دروستی كردووە.

## ئەنجامەكان

ئەم بەشە نیشانی دەدات كە چۆن لێكۆڵینەوە لە جیۆپۆلیتیكی گشتی بە ئاماژە كردن بە جۆرەكانی دیكەی میدیا ئەنجام دەدرێت، و چۆنیش دەكرێ پەرە بەو لێكۆڵینەوە بدرێت تا هۆكارە میدیاییەكانی وەكو رادیۆ و مۆسیقاش بگرێتەوە. هەرچەندە جۆرە باوەكانی میدیا وەكو رۆژنامەو تەلەفزیۆن و رادیۆ زۆر بایەخدارن لە دروستكردن و گواستنەوەی هەواڵەكان لە سەرانسەری جیهاندا، بەلاَم ئەوە ئینتەرنێت و بەرنامەكانی هاوشێوەیەتی وەكو بلۆگینگ و پۆدكاستە كە سەرنجی زیاتری ئەو كەسانە رادەكێشن كە بایەخ بە جیۆپۆلیتیكی گشتی دەدەن. لە كاتێكیشدا كە پەیوەندی ئینتەرنێتی لە زیادبووندایە بە تایبەتییش لە رۆژهەلاَتی ناوەڕاست، ئینتەرنێت نەك تەنها دەرفەت بۆ بینەرانی دەخولقێنێت تا دەستیان بە سەرچاوەی جۆراوجۆری هەواڵ رابگات، بەڵكو بۆ ئەوەی بیروبۆچوونەكانی خۆیانیش بە شێوەی راستەوخۆ ئاڵوگۆڕ بكەن. بەلاَم لەو ولاَت و ناوچانەی كە رای گشتی لە ژێر كۆنترۆڵی حكومەتدایە،بوونی بلۆگەرەكان گرنگتر دەبێت، هەرچەندە دەكەونە ژێر رەحمەتی تەنگ پێ هەڵچنین و زیندانی كردن و چاودێریی بەردەوامیش. ئەوەتا دەبینین چۆن بلۆگەرە ئێرانییەكان لە رێگای ئینتەرنێتەوە وێنەیەكی سەرنجڕاكێش دەربارەی ئێرانی هاوچەرخ نیشان دەدەن و لە هەمان كاتدا رای جیاواز و نەییارانەی خۆیان سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوەی ئێران دەخەنە روو. راو بۆچوونەكانیش ئەوە روون دەكەنەوە كە بۆچی زۆرێك لە چاودێران و نوسەرانی ئەلیكترۆنی لە هێزی سەربازی ئەمریكا و ئیسرائیل و پاكستان و هند و چین دەترسن بە تایبەتییش كە ئەو ولاَتانە، بە پێچەوانەی ئێرانەوە، خاوەن كۆگای گەورەی چەكی كۆمەڵكوژن.

بەلاَم نابێت بۆ یەك ساتیش بڕوا بەوە بێنین کە شێوازەکانی تازەی میدیا وەکو بلۆگ لە شوێنەکانی تری جیهاندا گرنگ نین. بۆ نموونە لە ئەمریکادا نوسەر و ئەکادیمییە لیبرالەکان هەمیشە ئەفسوسی ئەوە دەخۆن کە بەشی زۆری میدیای باو لەو ولاَتەدا پشتیوانی لە شەڕی دژە تیرۆری ئیدارەی بوش دەکات. سایەتە ئەلیکترۆنییەکانی وەکو (www.thinkprogress.com) و (www.dailykos.com) کە لە نەبوونی دەرفەت بۆ دەربڕینی راو بۆچوونی پێچەوانە بێزارن، چاودێری میدیای باو و بلۆگە راستڕەوەکان دەکەن و تەرکیز دەخەنە سەر ئەو شێواندن و بەلارێدا بردنەی کە لە سیاسەتی نێوخۆ و دەرەوەی ئەمریکادا پەیڕەو دەکرێت. یەکێك لە گرنگترین هەولەکانی (www.thinkprogress.comda) یش لەم بارەیەوە ئەوەبوو بوو کە داوای ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە بەرنامە دیکۆمینتییەکەی تەلەفزیۆنی ABC کرد بە ناونیشانی "رێگا بۆ ٩/١١"، چونکە چاودێران بڕوایان وابوو کە فیلمەکە پڕ بووە لە هەلە و ناوبانگ زڕاندن لە رێگای تۆمەتبارکردنی ئیدارەی سەرۆك "کلینتون" بە خاو و نابەرپرس لە بەرامبەر هەڕەشەی روو لە هەلکشانی چەکدارە ئیسلامییەکان. هەر بۆیە کەنالەکە ناچار کرا بە لابردنی ئەو بەشانەی بەرنامەکە کە باسی ئەوە دەکەن گوایا سەرۆك کلینتون ئەوەندە بە کێشەکەی مۆنیکا لوینیسکی سەرقالْ بووە کە نەتوانێت وەکو پێویست بایەخ بە بابەتەکانی ئاسایشی نیشتمانیی ولاَت بدات. ئەو مالپەڕە ئەلیکترۆنییانە توانیویانە بە پشتیوانی بەرپرسانی پێشووی ئیدارەی سەرۆك کلینتون، بۆچوونێکی گرنگ و پێچەوانە نەك تەنها بۆ پاساو هێنانەوە بۆ درێژەدان بە شەڕی دژە تیرۆر دروست بکەن، بەلکو بۆ ئەو بۆچوونەی لایەنگرانی سەرۆك (بوش) یش کە دەلێت تەنها کۆمارییەکان دەتوانن ئاسایشی ئەمریکا لە بەرامبەر هەڕەشەی چەکدارە ئیسلامییەکان بپارێزن. بێگومان لەم کەش و هەوا ناجێگیرەشدا، بیرکردنەوەی جیۆپۆلیتیکی زۆر گرنگ و چارەنوسساز دەبێت.

# ژێدەرەکان

**بەشی یەکەم**

**وتەکەی چیرچڵ لەم سەرچاوە وەرگیراوە:**

www.churchilspeeches.com

**وتەی ترومان لەم ماڵپەڕە دەست دەکەوێت:**

www.presidency.uesb.edu/ws/index

**وتاری ساڵانی ( ٢٠٠٢ ) و ( ٢٠٠٣ ) ی جۆرج بوش لەم ماڵپەڕە دەست دەکەون:**

www.whitehouse.gov/news/releases/2002

www.whitehouse.gov/news/releases/2003

**وتەکەی سەرۆک ئەحمەدی نەجاد لێرە وەرگیراوە:**

www.guardian.co.uk/iran/story

**کۆمێنتەکانی ساڤیج لەم سەرچاوە وەرگیراون:**

www.commondreams.org

**وتەکەی ساڵی ( ١٩٩٩ ) ی بیل کلینتون لەم ماڵپەڕە دەست دەکەوێت:**

www.pbs.org/newshour/bb/europe

**بەشی دووەم**


Gearóid س Tuathail, *The Geopolitics Reader* (Routledge, 2006), p. 1.

Frederick Sondern, 'The Thousand Scientists behind Hitler' *Readers Digest*, 1941).

EdmundWalsh, *Total Power* (Doubleday, 1948), p. 21.

H. Kissinger, *The White House Years* (1979), p. 598, and his

comments about Chile are available at:

http://en.wikipedia.org/wiki/Chilean_coup_of_1973

### بەشی سێیەم

J. Nye, 'The Decline of America's "Soft Power" ', *Foreign Affairs,* 83 (2004), 20.

### بەشی چوارەم

W. H. Auden's poem:

http://www.gametec.com/poemdujour/Sept1.1939.html

P. van Ham, 'The Rise of the Brand State', *Foreign Affairs*, 80 (2001), 2.

W. Connelly, *Identity/Difference* (University ofMinnesota Press, (2002), p. 64.

J. Agnew, *Making Political Geography* (Arnold, 2002), p. 143.

### بەشی پێنجەم

F. D. Roosevelt's radio address is available at:

http://www.presidency.ucsb.edu/mediaplay.php?

Yves Lacoste, 'An Illustration of GeographicalWarfare', *Antipode*, 5(1973), 1.

H.Mackinder, 'On Thinking', in M. Sadler (ed.), *Lectures on Empire* (printed privately, 1907), p. 37, and 'The Geographical Pivot of History', *Geographical Journal*,

13 (1904), p. 422. His ‘dictum’ referred to in *The Nazi Strike* comes from *Democratic Ideals and Reality: A Study in the Politics of Reconstruction* (Constable & Co., 1919), p. 60

Bowman: American Geographical Society Archives, Bowman Papers: Letter from Bowman to Frank Debenham, July 12, 1929.

R. Strausz-Hupe, *Geopolitics: The Struggle for Space and Power* (G. P. Putnam&Sons, 1942), p. 7.

Robert Fisk: http://www.countercurrents.org/fisk070107.htm